# رستەسازیی کوردیی

محەمەدی مەحویی

زانکۆی سلێمانی

٢٠٠١ ی زاینیی

سەرپەرشتی کاری هونەری: پێشڕەو نەحمەد

ژمارەی سپاردنی (٢٤٩)ی وەزارەتی رۆشنبیریی هەرێمی کوردستانی پێدراوە

# پێڕست

## بەشی یەککەم
## سەرەتاو چوونە ناو بابەتەکانەوە

## بەشی دووهەم
## ڕژێمی X′ و دروستەی فریزە هەڵگوێزراوەکان و جێگەکانیان لە ڕستەداو دۆخی ڕێزمانیی لە زمانی کوردییدا ٣٦

## بەشی سێ هەم
## دۆخی ڕێزمانیی ١٥٧



## بەشی چوارهەم
## گواستنەوەی وشەی پرسیار لە ڕستەسازییدا ١٩٥



## بەشی پێنج هەم
## دروستەی سینتاکسیی ئارگومێنتە دەرنەبڕاوەکان ٢٠١

## بەشی شەش هەم
## بکەرنادیار لە زمانی کوردییدا ٢٢٨

## بەشی حەوت هەم

## ڕستەی سەرجێناویی ٢٥١

## بەشی هەشت هەم
## دارشتەنادیارەکان و یاساکانی "هێنانەپێش و قورساییخستنەسەر" لەگەڵ گواستنەوەی وشەی پرسیار ٢٨١



## بەشی نۆهەم
## مۆدێلی رێزمانی گواستنەوە ٣٢٨

# بەشی یەککەم

## سەرەتاو چوونە ناوبابەتەکانەوە

### ١/١) رستە سازیی کوردیی

سەرناوی بابەتەکەمان لە دوو وشەی سەرەکیی دروستبووە : زاراوەی "رستەسازیی[١]" و زاراوەی "کوردیی". بەر لەوەی دەست بە لێکۆڵینەوەو شییکردنەوە یان بە لێدوان و گفتوگۆکردن لەسەر بابەتەکانی ئەم بەشە بکەم، کە دەربارەی پێکهاتەی رستەسازیی[٢] رێزمانی کوردیین، پێویستە دوو زاراوەکەو پەیوەندییان لەگەڵ یەکترییدا روونبکرێنەوە.

### ١/١-١) رستە سازیی

بەکارهێنان و بیستنی زاراوەکە دەمان باتەوە بۆ لقە زانستی زمان بەشێوەیەکی گشتیی و بۆ رێزمان بە شێوەیەکی تایبەتیی. لە "زمان و زانستی زمان: سەرەتایەك بۆ زانستی زمان"[٣] دا پێناسەی زانستی زمانمان بەم شێوەیە دارشت:

زانستی زمان، زانستێکە خۆی بەدیاردەکانی زمانەوە[٤] خەریکدەکات. دیاریدەکانی زمان گشت کەرەستەو پرۆسەکانی زمان دەگرێتەوە، زمانیش وەك رژێمێك رژیمی رێزمان دەگرێتەوە، کە لە چوار پێکهاتەی سەرەکییەو هەر پێکهاتەیەکیش رژێمێکی خۆی هەیە[٥].

١- پێکهاتەکانی رێزمان

| | |
|---|---|
| پێکهاتەی رستەسازیی | Syntax |
| پێکهاتەی ووشەسازیی | Morphology |

---

[١] Syntax

[٢] Komponente

[٣] محەمەدی مەحویی (٢٠٠١)

[٤] Sprachphänomene

[٥] زاراوەی "پێکهاتە"م بۆ component و زاروەی "دروستە"م بۆ structure و زاراوەی "پێکهاتوو"م بۆ construction و زاراوەی "وەچەپێکهاتە" یشم بۆ constituente داناوە (وەرگێڕ).

پێکهاتەی دەنگسازیی Phonology
پێکهاتەی واتاو واتا لێکدانەوە Semantic

لەم کارە زانستییەمدا خۆم بە دەستوور و یاسا وەمەرجەکانی پێکهاتەی ڕستەسازییەوە خەریکدەکەم، بەواتا بە ڕستە هەڵگواستن و ڕستەسازدان و دیاردەکانییەوە. من لەم لێکۆڵینەوەو خۆخەریککردنەمدا بەرستەسازیی کوردییەوە، هۆشم لە "زاری سلێمانی" کۆدەکەمەوەو کەرەستەکانی دەکەمە بابەتی سەرەکییم.

## ٢-١/١) زمانی کوردیی

پاش ئەوەی بەکورتیی زاراوەی "ڕستەسازیی"م وەك پێکهاتەیەکی ڕێزمان و بابەتی لێدوانەکانم دیارییکرد، دێمە سەر کەرەستەی بابەتەکە، کە کرمانجی خواروەو بەتایبەتیی زاری "سلێمانییە".
بۆ ئەم مەبەستەیش پێویستە شوێن و جێگەی زاری "سلێمانیی" لە کرمانجی خوارووداو کرمانجی خواروو لەزمانی کوردییداو زمانی کوردیی لەناو زمانە ئێرانییەکانداو زمانە ئێرانییەکان لەناو زمانە هیندۆجێرمانییەکانداو هیندۆجێرمانییەکان لەناو زمانە هیندۆجێرمانیی داپیرەدا بدۆزینەوە و دەستنیشانیبکەین .

## ٢/١) کورد و نیشتمانەکەی و زمانەکەی

### ١-٢/١) کورد و نیشتمانەکەی

ئەمڕۆ ژمارەی کورد نێوان (٢٥ تا ٣٠) ملیۆن کەسانێك دەبێت و لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، لە دوای عەرەب و تورك، سێ هەمین نەتەوەن لە ژمارەدا. Xenophon وەك وەچەی کاردۆخەکان ناوی کوردەکانی بردووەو لەلایەن Strabo یشەوە ناویان وەك گوتییەکان و ئەو خێڵانەی دەورو بەری دەریاچەکانی وان و ورمیە باسیان لێوەکراوە[٦] .
نیشتمانەکەیان " کوردستان" بەسەر شاخەکاندا کشاوەو لە خۆرهەڵاتی سەرەوەی دیجلە و فورات تا ناوچەکانی دەریاچەکانی وان و ورمیە و شاخەکانی زاکرۆس

---

[٦] Chaliand (1984) ,(Westerman Lexikon (1969:913-914؛ لە بیرمان نەچێت، کە ژمارەی کورد بەگشتیی بۆچوونێکەو ڕاستیی ناپێکێت.

دەگرێتەوە، تا دەگاتە لوڕستان. کوردستان ناوچەیەکی نیشتەجێی داخراو و ناسراوە، بەڵام خاکەکەیان بە سەر چەند دەوڵەتێکدا دابەشکراوە؛ کوردی ئاوارەو هەڵهاتوویش لە وڵاتانی تر هەن، لەبەر ئەمەیە کوردەکان لە گەلێك وڵاتدا دەژین و ئەو وڵاتانەیش ئەمانەن: لەخاکی نیشتمانی خۆیاندا: عێراق، تورکیا، ئێران و سوریا؛ لەدەرەوە: جارانی یەکێتی سۆڤیەت، لوبنان و ئەورووپای ڕۆژئاوا.

## ١/٢-٢) زمانی کوردیی (کرمانجیی)[٧]

زمانی کوردیی یەکێکە لە زمانە ئێرانییەکانی سەرووی ڕۆژئاوای ئێران. ناوچەکانی زمانەکەیان خوارووی خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵ (کوردستانی سەروو، نزیکەی ١٤ ملیۆن ) و خۆرئاوای ئێران (کوردستانی ڕۆژهەڵات، نزیکەی ٥ تا ٦ ملیۆن ) وسەرووی عێراق (کوردستانی خواروو، نزیکەی ٤ ملیۆن ) وسەرووی سووریا (کوردستانی ڕۆژهەڵاتی گچکە، نزیکەی ١ تا ٥ر١ ملیۆن ) دەگرنەوە. چەند ملیۆن کوردێك لە خوارووی تورکیا و زۆر تر لە ملیۆنێك لە ئەورووپای خۆرئاواو ٠٠٠ر٦٥٠ کوردێك لە جارانی یەکێتی سۆڤیەت و ٠٠٠ر١٥٠ کەسێکیان لەلوبنان دەژین [٨].

(أ) زمانی کوردیی سەرووی ڕۆژاوا (کرمانجی سەروو) لە تورکیا و سووریاو ناوچە سنوورییەکانی تورکیاو عێراق و تورکیاو ئێران و وڵاتانی GUS، ئەرمینیاو جۆرجیاو ئازەربایجان و کازاغستان و کریجستان و تورکمەنستان کورد پێیدەئاخافێت.

(ب) زمانی کوردیی خواروو (کرمانجی خواروو) لە عێراق و لە ئێران: لە ناوچەداخراوەکانی کوردەکاندا زمانە ئێرانییەکانی سەرووی ڕۆژئاوای ئێران هەن؛ زازا (زازا، دملی) لە ئەنادۆڵ و گۆران (لای کرمانشا) و هەورامیی (لە شاخەکانی زاگرۆز) ن. ئەم دیالێکتانەو فەیلیی لە خوارووی ڕۆژهەڵات هێشتا هەر جۆرێك لە دروستەی "ئێرگاتیڤ - ئەرگاتیڤ" [٩] یان تێداماوەتەوە. لە ڕاستیدا ئەمڕۆ ئەم نیشانەتایبەتییە سینتاکسییە بە شێوەیەك لە شێوەکان

---

٧ بۆ تۆفیق وەهبی (١٩٥١) زاراوەی "کرمانجی" لە ناوەڕۆکدا ناوی "زمانی کوردی" یان "کوردیی" دەگرێتەوە. منیش لەم کارەمدا "کرمانجی سەروو" م لە "کرمانجی خواروو" جیاکردووەتەوەو وەك دیالێکتی سەربەخۆ مامەڵە لەگەڵ "لوڕیی" و "زازا" و "گۆران" دا کردووە؛ بەم پێیە وەك زار سەیری "سلێمانی" و "هەولێر" و "موکریی" دەکەم ... هتد.

٨ سەیری سەرژمێرییەکانی دەوروبەری ١٨٣٢ بکە لە Hüttenroth (1982:227f.) دا و بەراوردی بکە لەگەڵ خەمڵاندنەکانی Vanly (1970) و Lazerew (1983) و Behrendt (1993:51f.) دا.

٩ Ergativstruktur, Inneichen (1979:58-60)

لە زۆربەی دیالێکت و زارە کوردییەکاندا دەبینینەوە، بەتایبەتیی لە هەورامیی و کرمانجی سەروودا:

٢ - زاری سلێمانیی (کرداری ڕابوردوو)        من  تۆم  گرت.
i     i

٣- کرمانجی سەروو (کرداری ڕابوردووی تێپەڕ) : تە  ئەز  بەختیار کرم.
i             i

٤- هەورامیی (کرداری ڕابوردوو) :  ئاد  منش  نڤیستا.   •
i     i

ئاد  منش  نڤیستانێ.[10]
j     j

زمانی کوردیی لە عێراق و جارانی یەکێتی سۆڤیەتدا، بۆیە تا ڕادەیەك بە ئازادیی گەشەیکردووەو پەرەیسەندووە، چونکە لەویاندا بزوتنەوەی بەهێزی کوردەکان بەردەوام بووەو لەمیاندا ماف کەمەنەتەوەییەکان کەم یان زۆر پارێزراوبووە. لە ولاتەکانی دیکەدا، بەتایبەتیی لە تورکیادا، کورد زۆر بە توندوتیژیی چەوسێنراوەتەوە. لەگەڵ ئەمەیشدا، بە هەوڵ و جموجۆڵی کوردەکان لە دەورەوەی کوردستاندا و لە پەنابەرێتیدا، زمانێکی نوسیینی کوردیی هاتووەتەکایەوەو گەشەی پێدراوە: لەتەك ڕژێمی ئەلفوبێی عارەبییدا بۆ کرمانجی خواروو، ڕژێمی نوسیینی لاتینیی (پیتەلاتینییەکان) بۆ کرمانجی سەروو خواستراون و گونجێنراون و بەکارهێنراون. دیالێکتی گۆران لە دێریندا زمانی ئەدەبیی بووەو ڕژێمی نوسیینی عارەبیی لە خزمەتی زماەکەیدا خراوەتەکار. زمانێکی نوسیین بە پیتی لاتینیی و بۆ دیلێکتی زازا لە گەشەکردندایە[11].

لەبەرئەوەی کورد هەتاوەکو ئەمڕۆیش بوون و کیانێکی ڕامیاریی بەدەست نەهێناوەو لەبەرئەوەی ئەمە مەرجێکی بنەماییە بۆ گەشەکردنی زمانێکی بالا یان زمانێکی یەکگرتوو، کورد هێشتا خاوەنی یەکێك لەو دوو زمانە نییە.

---

[10] وەرگێڕ

[11] Dj. Bedir Khan und R. Lecot (1970), Blau, J. (1980), Baran (1988), Kurdo, Q (1990), Wurzel, P. (1992)

### ١/٢-٢-١) زمانی کوردیی لە نێوان زمانە هیندۆجێرمانەکاندا

زمانی کوردیی سەربەزمانە ئێرانییەکانە؛ زمانە ئێرانەییەکانیش دەگەڕێنەوە بۆ گرووپی زمانە هیندۆجێرمانەکان. پاش گەشەکردنی مێژوویی زمان، زمانی ئێرانیی کۆن یان ئاڤێستا لە خۆرهەڵات و فارسیی کۆن لە خۆرئاوا بوون بە گرووپی خۆرهەڵات و خۆرئاوا [١٢]. زمانی کوردیی لەتەك فارسیی نویَ و تاجیکیی و بەلووجیی و تالیدا لە گرووپی خۆرئاوادا گەشەیکردووەو لە کوردستاندا، لەو وڵاتانەدا، کە کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوە، قسەیپێدەکرێت.

### ١/٢-٢-٢) زاری سلێمانیی

زمانی کوردیی بەشێوەیەکی گشتیی دەکرێت بەچەند دیالێکتێك و بەشێوەیەکی سەرەکیی بە دوو دیالێکتی سەرەکییەوە؛ بەپێی دابەشکردنێکی جوگرافیی مەکەنزیی ئەم دیالێکت و زارانە لەیەك جیاکراونەتەوە [١٣]:

---

[١٢] Wendt, P. (1961:213)

[١٣] مەکەنزی (١٩٨١) لە بەرگی یەککەمی پەرتووکەکەیدا لە ڕووی جوگرافییەوە دیالێکتەکانی زمانی کوردیی جیاکردووەتەوە: لە گرووپی سەرەکیی "کرمانجی سەروو" دا کرمانجی سەرووی ڕۆژئاوای لە کرمانجی سەرووی ڕۆژهەڵات جیاکردووەتەوە؛ لە کرمانجی سەرووی ڕۆژئاوادا هەکاری و بادینیی و بایەزیدیی کۆکردووەتەوە؛ لەوی تریاندا دیاربەکرو بۆتان و ژەنگاری داناوە. لە گرووپی سەرەکیی کرمانجی ناوەڕاستدا ئەردەڵان و سلێمانی و هەورامیی هەیە کرمانجی خواروری وەك گرووپی سەرەکیی سیَ هەم داناوەو گۆران و کرمانشاو لەکی لەسەر حسابکردوون؛ کەچی هەورامیی و گۆرانی لە نێوان کەوانەی خڕدا نوسییوە. ئەردەڵان و هەورامان و گۆران و کرمانشاو لەکی بە موکری داناوەو سلێمانیی و زەنگەنەیشی خستۆتە پاڵ سۆرانیی. دیالێکتی سلێمانیی و هەکاریی وەك بناغەیەك بۆ جیاکردنەوەی پێکهاتەی زمان بەکارهێناوە. زمانەوانە کوردەکان هەندێك لە جیاکردنەوەکانی مەکەنزی پەسەند ناکەن و نیشانەی پرسیاریان لەسەریان هەیە؛ بۆ نموونە ئاکریَ و بادینیی بنەمایەك نیین بۆ جیاکردنەوەی دیالێکتەکانی ئامێدیی و بامەڕنیی و گولیی و زاخۆ، ئەمە بە هەڵەکراوە (بڕوانە: موکریانی (١٩٨٤)) وەرگێڕ.

٥- دابەشکردنە جوگرافییەکەی مەکەنزیی

(ا) دیالێکتی گرووپی ١

زاری سلێمانیی

زاری وارماوە

زاری هەولێر

(ب) دیالێکتی گرووپی ٢

زاری ئاکرێ

زاری شێخان

زاری ئامێدیی و زاخۆ

زاری هەکاریی و بۆتان

زاری بەتلییس

زاری ڕەوەن، زاری ئێریڤان

دیالێکتەکوردییەکانی تر

ئەگەر زمانی کوردیی بەسەر دوو گرووپەسەرەکییەکەدا (کرمانجی سەروو، ناوەڕاست یان خواروو) و گرووپی دیالێکتەکانی گۆران و زازا دا بەشبکەین[١٤]، ئەوا زاری سلێمانی، کە بەشێوەیەکی سەرەکیی لە شاری سلێمانیی (لە کوردستانی خواروو) و دەوروبەری قسەپێدەکرێت، لە گرووپی سەرەکیی یەککەمەو سەر بە کرمانجی ناوەڕاستە. دیسانەوە، ئەگەر زمانی کوردیی بە پێی جوگرافیای کوردستان بەشبکەین، ئەوا زاری سلێمانیی یەکێك لە دوو دیالێکتە سەرەکییەکە دەبێت.

٦- دابەشکردنەکەی نەبەز

| گرووپی ١ سلێمانیی | گرووپی ٢ سوورچیی |
|---|---|
| ..................... | ..................... |
| وارماوە | ئاکرێ |
| بنگرد | ئامێدی |
| پژدەر | بەرواری ژۆر |
| موکریی | گوڵیی |
| هەولێر | زاخۆ |

---

[١٤] نەبەز (١٩٧٢:٢٢)

زاری سلێمانیی ڕۆڵ و شێوەی دیالێکتی وەرگرتووەو زۆر کاریگەرانە بڵاوبووەتەوەو هەر وەك نەبەز دەفەرموێت و لە شێوەی بۆچوونێکدا داوایدەکات و دەڵێت: "ئەگەر زاری سلێمانیی لەگەڵ دیالێکتدا بەراوردبکەین و بینرخێنین، ئەوا زارەکە Mu ndartprobe هەیەك نییە. چونکە ئەم زارە کوردییەی ئەمڕۆ ناوی سۆرانی هەڵگرتووە، بۆ گشت کوردە ڕۆشنبیرەکانی عێراق و ئێران بووە بەزمانی سەردەم[15] و وەك زمانی دەستووریی و شێوازبەند[16] بۆ کاروباری نوسیینی فەرمانگەکانی دەزگاکانی میریی یەکاردەبرێت. هۆو هۆکاری مێژوویی و ئێتنی و ڕامیاریی بۆ هەڵبژاردنی زاری سلێمانیی، وەك زمانی نوسیین بۆ چەند ملیۆنێك لە دانیشتوانی ناوچەکانی خواروو لەگەڵ خۆرهەڵاتی کوردستان، هەن".

مەکەنزی لەسەرەتاکەیدا ناڕاستەوخۆ داکۆکی لەو بۆچوون و داواکردنەی نەبەز دەکات و پشتگیرییدەکات و دەڵێت: "فاکتەرێکی، کە پاکیێ دیالێکتەکانی تری زمانی کوردیی تێکدەدات، بڵاوبوونەوەی دیالێکتی دەستووریی و شێوازبەندی سلێمانییە لە پایتەختی هەرێمەکەیەوە بەرەو شاری هەولێری هاوسێ. قسەکەرەکانی زارەکانی وارماوەو بنگردو هەولێر، گشتیان یان چوونەتە قوتابخانە یان سەربازییانکردووەو لەو ڕێگایانەوە شێوەکانی زاری سلێمانییان وەرگرتووەو بەکاریاندەهێنن".

زمانی کوردیی بە گشتیی و زاری سلێمانیی بە تایبەتیی نیشانەتایبەتیی و مۆرکەکانی زمانەلکاوەکان[17] نیشاندەدەن: کەرەستەسەرەتاییەکانی شێوەسازدانی[18] یان کەرەستە سەرەتاییە مۆرفۆلۆژییەکانی بە زۆریی بە شێوەیەك وەك لا گر[19] بە کەرەستە سەرەتاییەکانی ڕەگ و قەدەکانەوەن، کە جیاکردنەوەیان بەتەواوی ئاشکراو دیاردەمێننەوە. زۆرجار لاگرەکان لە شێوەی لاگرو نێوانگر[20] دان و لەملاو ئەولای یان لە نێوانی قەدەکاندان. ئەم چەند نموونەیەی لێرەدا هێنراونەتەوە، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو نیشانەو مۆرکانەن[21].

---

[15] Standardsprache

[16] ofitiell, formell

[17] agglutinierende Sprache بنەمای ئەم نیشانەیەی زمانی کوردیی ئەو ڕاستییەیە، کە زمانەکەمان "زمانێکی داڕێژەرە" نەك "شیکەرەوە" (وەرگێڕ).

[18] Formel-Elemente

[19] Affix

[20] Ko- und Zirkumfix

[21] بەراوردی بکە لەگەڵ Inneichen (1979:58-60) دا.

٧- زاری سلێمانیی وەك زمانەلكاوەكان

| | | | |
|---|---|---|---|
| ڕەگ | کات | کەس | |
| گر | ت | م | (گرتم) |

| | | | |
|---|---|---|---|
| کات | ڕەگ | کەس | |
| دە | گر | م | (دەگرم) |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| پێشناوی نارەسەن | ڕەگ | کات | پاشگری بەناوکردن | پاشگری دووپاتکردنەوە | |
| لێ | کر | د | ن | ەوە | (لێکردنەوە) |

٣/٢) خستنەڕووی خێزانی زمانەکان لە شێوەی نەمامەکانی زماندا دەریدەخات، زمانی کوردیی سەربەکام خێزانی زمانە.

٨ - جێگەو شوێنی زمانی کوردیی لە نێوان هیندۆجێرمانیی داپیرەدا ...



٩- جێگەو شوێنی زمانی کوردیی لە ناو زمانە هیندۆجێرمانەکاندا



### ١٠- جێگەو شوێنی زاری سلێمانیی لە ناو زمانی کوردییدا [٢٢]




## ٣/١) پێویستییە بەرایی و بنەماییە نەزەرییەکان

**بەگشتیی:** ڕێبازو جۆری کارکردنی قوتابخانەی "ڕێزمانی گواستنەوە"[٢٣] جێگەی ڕێبازو جۆری کارکردنی "قوتابخانەی دروستەیی کلاسیکیی"[٢٤] گرتەوە. یاساکانی قوتابخانە نوێباوەکە لە گشتییەوە دەستپێدەکەن و دەچن بۆ تاکەکان؛ ئەمە بە ڕێبازی de duktiv [٢٥] ناسراوە. بەپێچەوانەوە یاساکانی قوتابخانە کلاسیکییەکە لە تاکەکانەوە دەستپێدەکەن و

---

[٢٢] چۆن دیالێکتەکان جیاکراونەتەوەو جێگەو شوێنی زاری سلێمانی لە ناو زمانی کوردیی خۆیدا لە لایەن تۆفیق وەهبیی (١٩٥١) ەوە دیارییکراوە، منیش هەر بەو شێوەیە پەسەندم کردوون و وەرمگرتوون و کاریانپێدەکەم.

[٢٣] Transformationsgrammatik (TG)

[٢٤] strukturalistische Paradigma

[٢٥] Deduktion هەڵهێنجانە لە گشتییەوە (بڕوانە Induktion).

بەرەو بەگشتییکردن دەچن؛ بەم ڕێبازە دەگوترێت induktiv [٢٦]. لەگەڵ بڵاوبوونەوەی قوتابخانە نوێباوەکەدا ڕێبازەکەی یەککەم جێی بە ڕێبازەکەی دووهەمی لەقکردو جێی خۆی کردەوە. ئەمە گەورە ترین گۆڕینێك بوو، کە بووە هۆی ئەو پەڕینەوەیە. بۆ ئەو گۆڕین و پەڕینەوەیە لە ڕێبازەکەوە بۆ ڕێبازەکەی تر بەڵگەو ڕوونکردنەوەکان بەم جۆرە هێنراونەتەوەو داڕێژراون [٢٧]:

زمان لە ژمارەیکی بێ کۆتایی لە ڕستە پێکهاتووە. چونکە ڕستەکان بێشومارن، ناتوانرێت بەتەنها لە ڕێی لێوردبوونەوەو تێڕوانینەوە لە داتاو کەرەستەکانی زمان، تیۆرییەکی زمانی تەواو پراوپڕو [٢٨] لەبار بەدەستبخرێت، کە گشت لایەنەکانی زمان بگرێتەوەو پەسنیان بکات و بیانخاتەڕوو. بۆ ئەم ئەرك و فەرمانە -بۆ بەدەستخستنی تیۆرییەکی تەواوپراوپڕو لەبار- پێویستمان بە ڕێزمانێکی گونجاوو لەبارە، کە لە ئاستی کارو فرمانەکەدایەو کە پەسنکەرانەی تەواوپراوپڕو لەبارە [٢٩] و دیاردەکانی زمان ڕووندەکاتەوە. ئەم تیۆرییە بەتەنها ئەو دیاردانە ڕووناکاتەوە، کە لێیان وردەبینەوەو تێیان دەڕوانین، بەڵکو لەسەروو ئەمەیشەوە توانایەکی گەورەی پێشبینییکردنیشی هەیە: تیۆرییەکە پێشبینیی ئەوە دەکات، کام ڕستانە ڕێزماندروستن [٣٠] و کام ڕستانە ڕێزماندروست نین. تیۆرییەکە پێشبینیی ئەوە دەکات، کام ڕستانە لەڕووی ڕێزمانەوە -بە پێی دەستوور و یاساو مەرجەکانی زمانەکە خۆی- ڕاستن یان نا.

١١- *(ا) ئارام دەخوات (ب) ئارام سێو دەخوات.

---

[٢٦] Induktion بە گشتییکردنی تاکەکان دەبەخشێت: لە ژمارەیەك دەربڕاوی بچووك بچووك لە بارەت چشتێکەوە Prämisse هەڵگواستنی دەربڕاوێکی گشتیی لەبارەت هەمان چشتەوە Ko n klusion دەگرێتەوە. لێکدانەوەکەی: زمانەوان لە ژمارەیەك لە دیاردەکانی زمان وردەبێتەوەو دەبینێت، کە گشت دیاردەکانی، بۆ نموونە ڕستەسازیی، یەك نیشانەی تایبەتییان هەیە، لەمەوە زمانەوانەکە وایلێکدەداتەوە یان ئەو ئەنجامەی دەستدەکەوێت، کە دەبێت ئەو دیاردانەی ڕستەسازیی هەتا ئێستایش بەر چاوی نەکەوتوون، هەمان نیشانەی تایبەتییان هەبێت. ئێمە لە قازوقوڵنگەکان وردەبینەوەو هەرچییەکیان دەبینین هەر سپین؛ لەمەوە دەڵێین، کە گشت قازوقوڵنگەکانی دنیا سپین؛ ئەم تیۆرییە تا ئەو ڕۆژە ڕاستە، کە تێیداو لە هەر شوێنێك بێت، یەکێکی ڕەشیان دەبینرێت (وەرگێڕ).

[٢٧] Chomsky (1975, 1964)

[٢٨] eine adäquate Sprachtheorie

[٢٩] deskriptive adäquat

[٣٠] grammatikalisch

پەسندەکات. ئەمە ئەو واتایە دەبەخشێت، کە قوتابخانەی گواستنەوە ڕێزمانێکی تەواوپڕاوپڕ و پەسنکەرانەی زمانە.

ئەم تیۆرییە، تیۆرییەکی توانای زمانییە[40] و ڕێزمانێکی (نێو) جیهانیی[41] ,[42] تێدایە؛ تیۆرییەکە سەیری زمان وەك توانایەکی بیۆلۆژیی نەگۆڕی[43] مرۆڤ دەکات، کە لە گەڵ بەشەڕژێم" (شێوەیەك لە مۆدێلی ڕێزمان)[44] ەکانی تری مێشك و ئاوەز[45] بەیەکەوە کاردەکەن و کارلەیەکترییدەکەن؛ نموونە بۆ بەشەڕژێمەکانی مێشك "پراگماتیك" Pragmatik و زانیین و زانیارەکانمانن لە بارەت بوون و دنیاو گەردوونەوە[46] .

توانای زمان لەم قوتابخانەیەدا بەشە ڕژێمێکی تایبەتیی مێشك پێکدێنێت. ژمارەیەك لەو یاساو ڕێسایانەی[47] کارلەیەکترییدەکەن و یەکتریی دیارییدەکەن، توانازمانییەکان دیاریی و دەستنیشاندەکەن. ئەم ڕژێمەی لە یاساو ڕێسا پێکهاتووە، ئەو داڕشتە ئاوەزییە[48] بەرهەمدێنێت، کە پەیوەندیی نێوان دەنگ و واتای ژمارەیەکی بێکۆتایی لە ڕستە بەیەکەوە دەبەستن؛ کەواتە ڕژێمی یاساو ڕێساکان پێکهاتەی ڕێزمان پێکدێنن و پێکهاتەی ڕێزمانیش زانینی قسەکەری کامڵ و پێگەیشتووە لەبارەت زمانەکەیەوە.

منداڵ "دەزگایەکی زمانوەرگرتنی" (دەزگایەك بۆ زمانپژان و فێربوونی زمانی بێگانە)[49] ی هەیە؛ دەزگاکە ئەو ڕێسایانەی تێدایە. ئەمە هەلومەرج بۆ منداڵەکە دەڕەخسێنێت، لەسەر

---

[40] چۆن خوا توانای فڕینی بە باڵندە داوە، ئاوەهایش توانای قسەکردن و ئاخاوتنی بە مرۆڤ بەخشیوە؛ بۆیە دەگوترێت، زمان توانایەکی بیۆلۆژییە (بڕوانە محەمەدی مەحویی (٢٠٠١)).

[41] Universal-Grammatik

[42] ڕێزمانی (نێو) جیهانیی ژمارەیەکە لە یاساو ڕێسا، کە بۆ گشت زمانکان دەخۆن و زماەکان کاریان پێدەکەن؛ منداڵ، کە لە دایکدەبێت، ئەم یاساو ڕێسایانەی پێیەو بۆ زمانپژاندنەکەی بەکاریاندەهێنێت. ڕێسای حوکمکردن، بۆ نموونە، یەکێکە لەو ڕێسایانە (بڕوانە پارەکانی ئایندە).

[43] بەشی لای چەپی مێشك تەرخانکراوە بۆ زمان و زاڵیشە بە سەر ئەو بەشەکەمەی لای ڕاستی مێشکدا، کە تایبەتە بۆ زمان: منداڵ ڕێسا جیهانییەکان بۆ زمانوەرگرتن دەخاتەکارو لەگەڵیدا گەشەکردنەکەی وەك گەشەکردنی ئەندامەکانی لەشن (وەرگێڕ).

[44] Modul

[45] Geist

[46] Welltkentnisse

[47] Prinzip, priciple

[48] Mentale Repräsentation

[49] یاساو ڕێسا جیهانییەکان بناغەی سەرەکیی دەزگای زمانوەرگرت Spracherwerbeinrichtung ئەکەن.

ڕێزمانێکی لەم چەشنە پلەیەکی بەرزی لە لێوردبوونەوەو تێڕوانینی تەواوپڕاوپڕو لەبار[٣١] هەیە: چونکە تیۆرییەکە پەیوەندییەکانی نێوان دروستەکان[٣٢] دیاریدەکات و دەیانچەسپێنێت و لە هەمان کاتیشدا پەسنکردنی دروستەکانیشمان دەداتێ.

من هەوڵدەدەم، داتاو کەرەستەکانی زمانی کوردیی تا ئەو رادەو ڕێژەیەی دەکرێت، تەواوپڕاوپڕ پەسن (وەسف) بکەم. داتاو کەرەستەکان ڕژێمی ڕستەکانن؛ قسەکەرانی زمانی کوردیی ، ئەو کەسانەی زمانی کوردیی زمانی شیرییانە، بڕیار لەسەر ڕێزماندروستیی[٣٣] ڕستەکان و شێوەڕاستیی ڕستەکان لە ڕووی واتاوواتالێکدانەوەوە[٣٤] دەدەن و دەیاننرخێنن. کەواتە ئاشکرایە، کە ئەم تیۆرییە ڕێباز جۆری کارکردنی لە یاسا گشتییەکانەوە بەرەو تاکەکان بەکاردەبات؛ ئەم ڕێبازە ڕێدەدات ژمارەیەکی بێکۆتایی و نادیار لە تیۆریی گچکە (ڕژێمی ڕستەکان) لە ڕێی ژمارەیەك لە یاسای شێوە سازدانەوە[٣٥] هەڵبگوێزرێن.

ڕێزمانی گواستنەوەو جولاندن[٣٦] لە دەمی پەیدابوون و گەشەکردنییەوە ژمارەیەك لە گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووەو هێنراوە. پەیوەندیی ناوەوەی نێوان پێکهاتەکانی ڕێزمان (بڕوانە نموونەی (١) لە (١ (١) دا) بابەتی سەرەکیی چەندوچوون و مشتومڕەکانی ئەو گۆڕانکارییانە بوون. ئەو تیۆرییەی لێرەدا خراوەتەڕوو و کاریپێدەکرێت، بەگشتیی تیۆرییە بەسەرداچووەکە Revised Extended Standard Theory (REST) [٣٧]ی چۆمسکییە.

لەم قوتابخانەیەدا "زمان" وەك دیاردەیەکی یاساجڵەوگیر پەسن و پێناسەکراوە. یاساکان بە ویستی خۆمان دانەنراون و داتاشراوی زمانەوانەکان نین. یاساکان لە کەرەستەو دیاردەکانی زمانەکە هەڵگوێزراون و لەسەریان تاقیکراونەتەوە[٣٨] . قوتابخانەی گواستنەوە مامەڵە لەگەڵ زماندا وەك ڕژێمێك لە ڕستەی فۆرمڕاست[٣٩] دەکات؛ ڕژێمی زمانەکە لە یاسا پێکهاتووەو یاساکان ڕستەکان هەڵدەگوێزن و زمانەوانیش هەوڵدەدات ڕستە هەڵگوێزراوەکان پەسنبکات. بەم پێیە زمان وەك ژمارەیەکی بێکۆتایی و نادیار لە ڕستەی فۆرمدروست

---

[٣١] Beobachtungsadäquatheit

[٣٢] Structures

[٣٣] grammatikalische Korrektheit

[٣٤] semantische Wohlgeformtheit

[٣٥] Formationsregeln

[٣٦] Transformationsgrammatik

[٣٧] Chomsky (1980, 1981)

[٣٨] empirismus

[٣٩] wohlgeformte Sätze

بناغـەی داتــاو کەرەســتە هــاوردەو هاتووەکــان [٥٠] (کەرەســتەو داتاکــانی وەریــاندەگرێت) ڕێزمانێکی پەسنکەرانەی تـەواو پڕاوپـڕ پێکبهێنێت. لـێرەوە تێدەگـەین، کـە ڕێساکانی ئـەم دەزگایــە وەك ڕێزمــانێکی جیــهانیی ســەیردەکرێن. بــەم لێکدانەوەیەوەیــە، دەتوانرێــت زمانوەرگرتن یان وەرگرتنی ڕژێمیِ یاساکانی ڕێزمانی زمانێك، بەم شێوەیە بخرێتەڕوو:

١٢ - کەرەستەو داتای هاوردەو هاتوو ڕێزمانی جیهانیی ⟨ ⟵ ڕێزمانی زمانێك

لێرەوە دەڵێین، کە منداڵ ڕێساکانی ڕێزمانی جیـهانیی بـە کاردەبـات، بـۆ ئـەوەی بتوانێـت ڕێزمانی ڕژێمی زمان پێکبهێنێت؛ ئەمە ئەو ڕێزمانەیە، کە داتاکانی خۆی داکۆکیان لێدەکەن. لە لێدوانەکانمدا دەردەکەوێت، کە ڕێزمانی جیهانیی دوو پێکهاتـەی ڕێزمـان دەگرێتـەوە: (ا) ڕژێمی یاساکان و (ب) ڕژێمێك لە ڕێساکان[٥١].

(ا) ڕژێمی یاساکان ئەم "وەچەڕژێمانەی" تێدایە:

* فەرهــەنگێکی جفرەلێکــدراوەی زەنگــین [٥٢]، کــە "وابەســتەیی (ڕۆڵــی) بابەتانــە [٥٣] ی کەرەستەسـەرەتاییەکان بـە سـەرە (ڕێزمانییـە) کانییانـەوە[٥٤]" لـە نـاو وەچەپێکهاتـەکاندا [٥٥] دیاریی و دەستنیشاندەکات.

---

[٥٠] کەرەستە هاوردەو هاتووەکان (داتا وەرگیراوەکان) I nputdata ئەو وشـەو ڕستەو دەربڕاوانـەن، کـە منداڵ لە دایکوباوك و دەوروبەرەکـەی دەیانبیستێت و بە یاریدەی یاساو ڕێساجیهانییەکان تێیاندەگات و دەیانکاتەوە بە ئاخاوتن و قسەیان پێدەکات (بەرهەمە دەرهاوردەو دەرچووەکان Ou t putdata ).

[٥١] Prinzip, prnciple

[٥٢] لە ڕژێمی هێمای زماندا پەیوەندییەکی دەستووربەدەر a r biträr, willkürlich لـەنێوان ناولێنراوەکـە (واتا) و ناولێنانەکە (فۆرم) دا هەیـە؛ لـەم بـارەدا لـەبارەی ڕەمـزەوە دەدوێـین؛ ئـەم پرۆسـەیە جۆرێکـە لـە جفرەدانان و ئەندامانی کۆمەڵگا لەسەر پەیوەندییەکەی ڕێکدەکەون konv e ntionell ؛ لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتداو بەپێی بەکارهێنان، ڕەمزەکـان (وشـەکان) جێـی خویـان دەکەنـەوەو دەبـن بـە ئەندامـەکانی سـامانی وشە. لـە فەرهـەنگدا پەیوەندییەکە ڕوونکراوەتـەوە، بەواتا جفرە دانراوەکان لـە فەرهـەنگدا لێکدراونەتـەوە. ڕمزەکـان لـە زمانەسروشـتییەکاندا گشـتیان دەسـتووربەدەرن، بـەواتا بـە پێــی دەسـتوورێك نەهێنراونەتـە کایـەوە. ژمارەیـەکی زۆر کـەم لـە ڕەمـزی زمانـەکان دەسـتووربەندن یـان بـەپێی دەسـتوورێك پـەیدابوون؛ ئەمانـەیان بـە دەنـگ وێنـەی دەنگـەکانیان گـیراوەو کردەکـەی نـاوێکی لێـنراوە "وێنەکێشـان بـە دەنـگ" onomatopoetic؛ ئـەم جـۆرە ڕەمزانـە لـە زمـانی کوردییـدا زۆرتـرن وەك لــە زمانـەکانی تـرداو ئەمانـەیش هـەندێك لـە نموونـەکانیین: /دەنگـەدەنگ/، /قیژەقیـژ/. بۆڵـەبۆڵ/، گرمـەگرم/ ... هتـد (بڕوانـە: محەمـەدی مەحویی (٢٠٠١)).

* ئەو یاسایانەی پەیوەندییان بە شێوەسازدانی ڕستە"[56] ەوە هەیە و لە ڕێی هەندێک پارامێتەر[57] وە جێگەیان دەگیرێتەوە. لەوانە "مەرجی هاوسێیەتی تەواو ڕاستەوخۆ"[58]، کە پێدانی دۆخەڕێزمانییەکان دەرحسێنێت[59]، یاسایەکی سەرەکییە.
* یاسای گواستنەوە[60] ی α بجوولێنە[61] (وەچە پێکهاتەیەک بجوولێنە) دروستەی ڕووکەش[62] بە دروستەی بنەڕەتەوە[63] دەبەستێت. لە ئاستی ڕووکەشدا (S S) شوێنپێیەکی چۆڵ[64] ی وەچەپێکهاتەجوولاوەکە دەمێنێتەوە، کە دەتوانرێت بناسرێتەوەو دیارییبکرێت.

---

[53] Thematische Abhängigkeit مەبەست لێرەدا ئەو ڕۆڵە بابەتیانەن، کە بۆ نموونە کردارەکان بە تەواوکەرەکانیان دەدەن؛ لە فەرهەنگدا ڕۆڵەناوەکیی و دەرەکییەکانی کردارەکان دیارییکراون. لە ڕستەی "ئازاد ئارام دگرێت." دا، کرداری "گرت" ڕۆڵێک بە "ئارام" دەدات و "ئارام" وابەستەی کردارەکەیە (بڕوانە بەشی یەککەم).

[54] Grammatische Köpfe

[55] وەچەپێکهاتە: Konstituente ، پێکهاتوو: Konstruktion

[56] Satzformationsr‹geln

[57] Parameter: ڕێسا هەیە، وەک ڕێسای پێدانی دۆخی ڕێزمانیی، کە گشت زمانەسروشتییەکان کاری پێدەکەن؛ زمانەکان بەپێی پێویستیی خۆیان یەکێک لە جۆری جێبەجێکردنی ڕێساکە هەڵدەبژێرن؛ دۆخی ڕێزمانیی بۆ نموونە یان لەلای چەپەوە بۆ لای ڕاست یان لەلای ڕستەوە بۆ لای چەپ دەبەخشرێت؛ دۆخی ڕێزمانیی لە زمانی کوردییدا لەلای ڕچەپەوە بۆ لای ڕاست دەدرێت (بڕوانە بەشی سێ هەم).

[58] Bedingung der strickten Adjazens

[59] لە زمانی کوردیدا کردارو پێشناو و ئاوەڵناو سەری ڕێزمانین و دۆخی ڕێزمانیی Ks u szuweisung بە تەواوکەرەکانیان دەدەن؛ ڕێسای پێدانی دۆخی ڕێزمانیی لە هەموو زمانەکاندا هەیە؛ هەر زمانێک جۆرێک لە ئاڕاستەکەی هەڵدەبژێرێت و کاری پێدەکات P arameter: لە زمانی کوردییدا کردارو ئاوەڵناو لە چەپەوە بۆ لای ڕاست دۆخی ڕێزمانی بە تەواوکەرەکانیان دەدەن و بە پێچەوانەوە پێشناو لە ڕاستەوە بۆ لای چەپ دۆخی ڕێزمانی دەبەخشێت. بۆ ئەوەی سەرە ڕێزمانییەکە بتوانێت دۆخەڕێزمانییەکە بە تەواوکەرەکەی بدات، دەبێت تەواوکەرەکە ڕاستەوخۆ لە تەنیشت سەرەڕێزمانییەکەوە بێت. ئەم ڕێسایە وەک یاسایەک شێوەی ڕستە یان جۆری ڕیزبوونی وشەو فرێز لە ڕستەدا دیارییدەکات (بڕوانە بەشی سێ هەم).

[60] بابڵێین، کردار ڕستە دروستدەکات؛ وشەکان وەک لە بنەڕەتدا چۆنن، دێنە ناو ڕستەوەو هەر وشەیەک شوێنێکی تایبەتیی لە ڕستەدا بۆ تەرخانکراوە. بەمە دەگوترێت "ئاستی قووڵ" یان "دروستەی بنەڕەت". ئەو کەرەستانەی لە ئاستی ڕووکەشی ڕستەدا ناتوانرێت دۆخی ڕێزمانییان پێبدرێت، بەزۆر دەگوێزرێنەوە بۆ ئەو شوێنانەی تیایاندا دۆخی ڕێزمانی وەردەگرن. کەیاسای گواستنەوە

* ئەو یاسایانەی ئاستی ڕووکەش (SS) بە فۆرمی لۆژیکی[٦٥] یەوە دەبەستنەوە؛ وەك بۆ نموونە یاساکانی کوانتۆرەکان، کە بەستنەوەی کوانتۆرەکان مسۆگەرو گەرانتیی دەکەن.
* ئەو یاسایانەی بۆ فۆرمە فۆنۆلۆژیی[٦٦] ەکان لە کاردان.
ئەگەر لە پێشداو بۆ ماوەیەك واز لە یاسا فۆنۆلۆژییەکان بهێنم و لە شوێنێکی تردا بێمەوە سەریان، ئەوا ئێستا دەتوانم لە ڕژێمی ڕێساکان بدوێم.
(ب) ڕژێمی ڕێساکان ئەم تیۆریی و مەرجانەی تێدایە:
* تیۆرییەکی ڕەگەزیی پلەوپایەدار ( ´X یان X-bar Theory : ئەم تیۆرییە لەگەڵ هەندێك ڕێسای تردا، بۆ نموونە یاساکانی شێوەسازدان (فۆرمسازدان)، دروستەی فرێزەکان دیارییدەکەن و سنووریان بۆدادەنێن (تەحدیددەکەن).
* ئەو یاسایانە (مەرجانە) ی، گواستنەوەی وەچەپێکهاتەکان دیارییدەکەن و سنووریان بۆدادەنێن: یەکێك لەم مەرجانە مەرجی A بەسەر A دایە، یان پاڵێوەری دۆخی ڕێزمانییە[٦٧] ، کە جولاندنی خورتەکیی و بەناچاریی فرێزی ناویی دەخاتە کار.
* گەلێك دیارییکردن و سنووربۆدانانی تری دروستەکان، کە تیۆریی حوکمکردن جڵەوگیریانە: لەمانە ڕێسای ڕەگەزە بۆشەکان[٦٨] ؛ تیۆریی بەستنەوە[٦٩] ، کەڕێدەدات "ئەنافەر" (بەستراوە)[٧٠] لە ڕێی "وەچەبەستێنەوەر"[٧١] ەکەیەوە بناسرێتەوە؛ ڕێسای

---

Transformaionsregel ەکە جێبەجێکرا، دروستەی ڕووکەش دێتەپێشەوەو دروستەکەیش جێگەچۆڵەکەی کەرەستە گوێزراوەکەی تێدا دەردەکەوێت. لە زمانی کوردییدا گواستنەوەی بەزۆرخورتەکییمان نییەو جێگۆڕکێمان هەیە (بڕوانە بەشی یەککەم و بەراوردیی بکە لەگەڵ بەشی چوارەمدا):
(DS) ساکار بۆ قوتابخانە چوو. (SS1) ساکار چوو بۆ قوتابخانە. (SS2) ساکار چۆتە قوتابخانە.

[٦١] Bewege Alpha

[٦٢] Surface Structure (SS)

[٦٣] Deep Structure (DS)

[٦٤] trace, Spur

[٦٥] logische Form (LF)

[٦٦] phonologische Form (PF)

[٦٧] Kasusfilter

[٦٨] Empty Category Principle (ECP)

[٦٩] Binding Theory

[٧٠] Anaphora

[٧١] Antezentia

پرۆژەسازدان[٧٢] ، کە بوونی هەر تەواوکەرێك لەسەر هەر ئاستێکی زمان مسۆگەر دەکات (گەرانتیی دەکات).

بناغەی تیۆرییەکەی چۆمسکی ئەوەیە، کە پەسنکردنی هەر ڕستەیەك ئەم دارشتەیەی خراوەتەپاڵ یان هەیەتی[٧٣]:

-١٢

ئاستی بنەڕەت(S)

↓

ڕستەسازیی Syntax

↓

ئاستی ڕووکەش SS

ئاستی فۆنۆلۆژیی PF — LF فۆرمی لۆژیکیی

دارشتەی دەنگ P1 Pn

فۆرمی فۆنۆلۆژیی؛ یەککەم فۆرمی فۆنۆلۆژیی

ڕژێمی ڕستەسازیی چەند بۆچوون و گریمانەیەکی لەبارەی سروشتی پەیوەندیی نێوان دارشتەی فۆرم[٧٤] و دارشتەی واتا[٧٥] تێدایە. لێکۆڵینەوە لەم پەیوەندییە و خستنەڕووی، فرمان و ئامانجی ڕێزمانە. دارشتەی (١٣) ئەو پەیوەندییە دەخاتە ڕوو؛ ئەمە ئەوە دەبەخشێت، کە دارشتەکە ئاستێکی ڕووکەش (SS) ی نادیارو سەرپۆش بەسەردا دراوی تێدایەو کە فۆرمی فۆنەیتیك و فۆرمی لۆژیك وابەستەی یەکتریی نین[٧٦].

---

٧٢ Projection Principle

٧٣ Standardtheory, Chomsky (1965), Chomsky and Halle (1968); REST, Chomsky (1980, 1981)

٧٤ Formrepräsentation

٧٥ Bedeutungsrepräsentation

٧٦ Chomsky (1981:17-18)

بەم چەشنە چۆمسکی وەهای دادەنێت، کە لە نێوان - لەناو[٧٧] ئاستی ڕستەسازییدا هەڵگواستنێك لەڕێی گواستنەو[٧٨] وە هەیە. من لەم پەرتووکەمدا وەهای بۆ دەچم و بەڵگەکانیشم هەر وەها دێنمەوە، کە ئاستی ڕستەسازیی زاری سلێمانیی بەتەنها لە چەند گواستنەوەیەکی بەرایی[٧٩] و جێگۆڕکێی ڕستەسازیی[٨٠] زۆرتری نییە. جێگۆڕکێکانیش، کەم یان زۆر، تایبەتن بە زمانی کوردییەوە.

بەگوێرەی تیۆریی سەردەم جیاوازیی لە نێوان داڕشتەی بنەڕەتی (قووڵی) دەنگسازیی و دروستەی ڕووکەش و ڕواڵەتی (داڕشتەی فۆنەیتیکیی)[٨١] هەر ڕستەیەکدا دەکرێت. داڕشتەی دەنگسازیی بریتیی نییە تەنها لە ڕیزی یەك لە دوای یەکی سەگمێنتی دەنگەکان[٨٢] و کەوانەکان[٨٣] . داڕشتەی دەنگسازیی بەستراوە بە دروستەیەکی سینتاکسییەوە (ڕستەسازییەوە)؛ داڕشتە دەنگسازییەکە لە ڕیزێکی یەك لەدوای یەك لە بڕگە[٨٤] پێکهاتووە؛ کەواتە لە داڕشتەیەکی دەنگسازییدا پتر لە ئاستێکی "سەگمێنتی دەنگەکان"[٨٥] هەیەو ئەمیش بە "ئاستێکی ئازاد لە سەگمێنتەدەنگییەکان"[٨٦] ناسراوە[٨٧].

---

٧٧ innerhalb

٧٨ Transformationsderivation

٧٩ elementar Transformation

٨٠ من بۆ ئەو گواستنەوانەی وەچەپێکهاتەکانی ناو ڕستەسازیی، کە سەرپشکین، زاراوەی "جێگۆڕکێی ڕستەسازیی" Permutation بەکاردەهێنم: ئازیز بۆ قوتابخانە چوو. ئازیز چوو بۆ قوتابخانە. بۆ قوتابخانە چوو، ئازیز. بۆ جێگۆڕکێی دەنگەکان یان فۆنێمەکانیش زاراوەی "جێگۆڕکێی فۆنۆلۆژیی" Methathese مان هەیە: فڕین / ڕفین؛ یۆنان / وێنان/ . ئەگەر لە وشەسازییدا لەم دیاردەیە بەدیکرا، وەك /کردنەوە؛ وەکردن/ ئەوا زاراوەی "جێگۆڕکێی وشەسازیی" بۆ دادەنێم (وەرگێڕ).

٨١ Phonetische Repräsentation

٨٢ Lautsegmente

٨٣ Rubricken

٨٤ Silbe

٨٥ Segment

٨٦ ئاستی ئازاد لە سەگمێنتەکان autosegmental Ebene; قورساییخستنەسەر دەنگ و بڕگەکان ,Stress Betonung و ئاوازی ڕستە Intonation، لە نیشانەو مۆرکەکانی سەرووسەگمێنتیی دەنگەکان هەژمێردرێن؛ زاراوەی "ئاستی سەرووسەگمێنتیی" یان ئاستی جیا لە سەگمێنتەکان" یش بۆ suprasegmentale Ebene تەرخانکراوە، کە هەر ئەو دیاردانە دەگرێتەوەو هاوواتای زاراوەکەی پێشووە (وەرگێڕ).

من بۆیە ئەم تیۆرییەم وەرگرتووە کارپێدەکەم، چونکە ئەو چەمك و لێدوانانەی سەرەوە گونجاویی و لەباریی هەڵبژاردنەکەمیان سەلماندووە.
یەکێك لە بۆچوون و گریمانە بنەماییەکانی تیۆریی سەردەم، ئاکاردیارییکردنی[88] پەیوەندیی نێوان دروستەی ڕووکەشی ڕستەسازیی و Sn و داڕشتەی ڕووکەشی دەنگسازیی Pn ە؛ ئەمەی دواییان، لە هەمان کاتدا داڕشتەی ڕووکەشی دەنگسازییە. ئاکاردیارییکردنی لەم جۆرە، ئەمانەی لای خوارەوەی تێدایە:
(ا) یاسا ڕستەسازییە = دەنگسازییەکانی[89]، کە داڕشتەی ڕستەسازیی دەکەن بە داڕشتەی دەنگسازیی و داڕشتەی ڕستەسازیی وەك داڕشتەیەکی دەنگسازیی، بۆ نموونە فرێز، لێکدەدەنەوە. ئەم جۆرە یاسایانە داڕشتەیەك دەگۆڕن (دەیگوێزنەوە) بۆ داڕشتەیەکی تر، چونکە ئەم یاسایانە یەکگرتنەوەی تەواوی (تەتابوقی) داڕشتەی بنەڕەتیی دەنگسازیی P 1 و Sn بەیەکەوە دیارییدەکەن.

١٤ - ئازیزی کوڕم بەیەککەم دەرچوو. P1

بە یەککەم، ئازیزی کوڕم دەرچوو. S2

(ب) یاسادەنگسازییەکانی ڕێزمان، کە هەندێك داڕشتەی دەنگسازیی دیارییکراو لە هەندێك داڕشتەی دەنگسازیی ترەوە هەڵدەگوێزن؛ ئەم یاسایانە P1 بە Pn ەوە دەبەستن.

١٥ - ئارامی برام بە دووهەم دەرچوو. P1

ئارامی برام بە دووەم دەرچوو. P2

ئەم بۆچوون و وەهادانانە نەزەرییانە، هەر وەك چۆن لێرەدا لێیان دوام و خستمنە ڕوو، لە لایەن منەوە وەرگیراون و بەکاردەهێنرێن.
ڕێزمان دەبێت سروشتی ئەو داڕشتانەی لە لایەن پێکهاتەیەکەوە خراوەتە پاڵ ڕستەکانەوە (بە ڕستەکان دراون)، لە ڕێی هەمان پێکهاتەوەو جۆری یاساکانییەوە دیاریی و دەستنیشانبکات. دەبێت دەریشیبخات، ئەگەر بۆ پەسنکردنی زمان لەلایەن یەك پێکهاتەوە

---

[87] Van der Hulst Smith (1982) وە ئەو سەرچاوانەی لەوێ دراون.

[88] Charakterisieren

[89] syntaktisch-phonologische Regeln

پتر لە دارشتەیەك، بۆ ئەو پەسنكردنە، گرنگ بێت یان نا. لە ئەنجامی ئەمەدایە، ڕێزمانەكە دەبێت سروشتی ئەو یاسایانە دەربخات، كە دارشتەكان لەناو یەك پێكهاتەدا بەیەكەوە دەبەستن. لە لایەكەوە دەبێت ئەو ڕێزمانە پەیوەندیی نێوان پێكهاتە جیاوازەكان لەگەڵ یەكتریدا و لە لایەكی تریشەوە دەبێت پەیوەندییەكانی نێوان ئەو دارشتانە دەربخات، كە لە لایەن پێكهاتە جیاوازەكانەوە بۆیان دانراون. ئەركی من ئەوەیە، پێكهاتەی ڕستەسازیی زاری سلێمانیی ڕیزمانی كوردیی لەڕێی پەسنكردنەوە بخەمەڕوو.

## ١/٣-١) تیۆریی حوكمكردن و بەستنەوە[٩٠]

پێویستییە بنەماییە نەزەرییەكان: بەم تیۆرییە لە بابەتی فرەچەشن و كێشەی جیاوازی زمانی كوردیی دەكۆڵمەوەو شییاندەكەمەوەو دەیانپشكنم. بۆیە پێویستە لە سەرەتایەكی تێرو تەسەلداو بەوردیی ناوەرۆك و زاراوەكانی GB ڕوونبكەمەوە، بە تایبەتیی ئەو ناوەرۆك و زاراوانەی بۆ كارەكانم گرنگن[٩١]، ئاشكرابكەم.

### ١/٣-١-١) مۆدێلێكی ڕێزمان

ئەو مۆدێلەی چۆمسكی لە "وانەكانی حوكمكردن و بەستنەوە"دا[٩٢] LGB خسوویەتە ڕوو، لە (١٣) دا نیشادراوەو ڕوونكرایەوە.

### ١/٣-١-٢) دروستەی بنەڕەت[٩٣]

یاساكانی بنەڕەت دروستەی بنەڕەت بەرهەمدێنن[٩٤]. شێوەی دروستبوونی ئەم یاسا بنەڕتییە لەلایەن تیۆریی X- بار و وەچەدیاریكردنی كەوەستە سەرەتاییەكانی ناو

---

[٩٠] Rektion- und Bindungstheorie (GB) بڕوانە چۆمسكی (1981)

[٩١] Chomsky, GB (1981), Chomsky, LGB (1981)

[٩٢] Leactures on Government ynd Binding; Chomsky ;LGB, (1981)

[٩٣] Tiefen Struktur; Deep Structure

[٩٤] Chomsky (1970), Jackendoff (1977)

فەرهەنگەوە[٩٥] سنووری بۆ دانراوەو دیارییکراوە. تیۆری X= بار دەڵێت، کە هەر ڕەگەزێك سەرێکی (ڕێزمانیی) هەیە و کە پڕۆژە گەورەکەی ناوی سەرەڕێزمانییەکەی هەڵگرتووە.

١٦- فرێزی کردار (تەواوکەر، کردار)



بینای ئەم یاسا بنەڕتییە لە (١٧) دا دراوە.

... 17- Xn ⟶ ...Xn –1 ...

ئەو جوجمومەیە ئەوە دەردەبڕێت و دەبەخشێت: ناوێكN سەری فرێزێکی ناویی NP یەو کرباڕێك V سەری فرێزێکی کرداریی VPە. خاڵی دەستپێکردن ودەرچوونی ئەم بینایە نیشانەتایبەتییەکانی وەچەدیارییکردنی "سەرە فەرهەنگییەکانە"[٩٦]. داڕشتەو نەخشەی یاسایەکی بنەڕەتیی فرێزێکی کردار VP (١٦) ئەو واتایە دەبەخشێت، کە فرێزەکە لە کرباڕێكV و فرێزێکی ناویی NP سەرپشکیی دروستبووە.

18- VP ⟶ $\overset{o}{V}$ - (NP)

کرداری <نوستن>، بۆ نموونە، لە وەچەدیارییکردنەکەیدا ڕەگەزێکی وەك تەواوکەرێکی ناوەکیی[٩٧] بۆ دیارییەنەکراوە، بۆیە فرێزێکی ناویی (N P) ناتوانرێت لە نێوان فرێزە کردارییەکەیدا VP بهێنرێتە دیتن. لە وەچەدیارییکردنی کرداری <گرتن> دا هەیە، کە داوای

[٩٥] Subkategorisierung lexikalischer Elemente

[٩٦] lexikalische Köpfe

[٩٧] internes Argument تەواوکەری ناوەکیی (ئازیز سێوێکی خوارد)، "سێوێکی" تەواوکەری ناوەکیی و ڕاستەخۆیە؛ ئازیز بەدەست سێوێکی خوارد "بە دەست" تەواوکەرێکی ناوەکی ناڕاستەخۆیە؛ لە گشت ڕستەکاندا "ئازیز" تەواوکەرێکی دەرەکییە (وەرگێڕ).

تەواوکەرێکی ناوەکیی دەکات؛ بۆیە پێویست ناکات یاسا بنەڕەتییەکەی (١٨) درێژبکرێتەوە یان فراوانتر بکرێت.

١٩- (ا) ئازیز نوست.
(ب) ئازیز ئازادی گرت.

مەرجە بنەماییەکانی ڕێسای بابەتانە[٩٨] ئەوە مسۆگەر دەکەن، کە کرداری <گرت> یەك تەواوکەری ناوەکیی دەوێت و کە <نوست> لەگەڵ یەك تەواوکەری ناوەکیی بەرهەمناهێنرێت (سەیری خوارەوە بکە). ڕێسای لێکدانەوەی تەواو[٩٩] گەرانتیی ئەوە دەکات، کە کرداری <نوست> بە فرێزێکی ناویی ناوەکییەوە[١٠٠] بەرهەمنەهێنراوە (بڕوانە پارەکانی ئایندە). کردارەکان ڕۆڵی بابەتانە[١٠١] دەدەن . لەبەرئەوەی وەچەدیارییکردن ڕەگەزدیارییکردن بە دیهێنانی سینتاکسیی ئەو تەواوکەرانەیە و لەبەرئەوەی پێویستە گشت ڕۆڵە بابەتییەکانی کردارێك بەدیی بهێنرێن، دەبێت ڕەگەزی گشت کەرەستە سەرەتاییەکانی وەچەدیارییکراوەکان بهێنرێنە دیتن. ڕێسای بابەتانە بەم شێوەیە داڕێژراوە.

٢٠- ڕێسای بابەتانە[١٠٢]
هەر تەواوکەرێك یەك ڕۆڵی بابەتانەی هەڵگرتووە و هەر ڕۆڵێکی بابەتانە تەنها بە تەواوکەرێك دەدرێت.

بەپێی (٢٠) ڕێگە بە (٢١) نادرێت. چونکە کرداری <گرت> یەك ڕۆڵی بابەتانەی هەیەو پێویستە بە تەواوکەرێك بدرێت. لە (٢٢) دا ڕۆڵە ناوەکییەکە[١٠٣] بە فرێزێکی ناویی دراوە، کە ئەم پێوسیتیی و داواکارییەی بە جێهێناوە.

٢١- * ئارام گرتیی[١٠٤]

---

[٩٨] Themen Kriterien

[٩٩] Prinzip der vollständigen Interpretation (PVI), Principle of full Interpretation

[١٠٠] eine interne NP

[١٠١] thematische Rollen, Gruber (1965)

[١٠٢] Chomsky, LGB (1981:36)

[١٠٣] interne θ-Rolle

٢٢- ئارام ئازادی گرت.

ڕێسای ڕۆڵە بابەتییەکان (٢٠) داوای ئەوەدەکات، کە دەبێت هەموو ڕۆڵە بابەتییانەکان بەخشرابن (بە تەواوکەرەکان درابێتن). بەشی دووهەمی ڕێساکە لە "ڕێسای لێکدانەوەی تەواو" دا خۆی دەنوێنێت و دەردەکەوێت؛ ئەم ڕێسای لێکدانەوەیە گەرانتیی ئەوە دەکات، کە دەبێت هەر وەچەپێکهاتەیەک گۆکردنێکی لە ڕستەدا هەبێت.

٢٣- ڕێسای لێکدانەوەی تەواو[١٠٥]
دەبێت لە ڕێی هەندێك لە نیشانەتایبەتییەکانی لێکدانەوەوە ڕێی دەستووریی بە بوونی هەر کەرەستەیەکی سەرەتایی لەسەر ئاستی PF و LF درابێت[١٠٦].

مەرجی لێکدانەوەی تەواو دەتوانرێت لە ڕێی (ا) هوە یان (ب) وە جێبەجێبکرێت و بهێنرێتەدیتن: یان (ا) ڕەگەزدیارییکردن/ وەچەدیارییکردن یان (ب) کرداربەندیی[١٠٧]. لە فەرهەنگدا چەسپاوەو نیشاندراوە، کام ڕەگەزانەی (وەچانەی) کام کەرەستە سەرەتاییانە دیارییکراون.
"تیۆریی کرداربەندی" ی (1980) Williams ڕوونکردنەوەمان لەبارەی ئەو کەرەستەسەرەتاییانەوە دەداتێ، کە لە ڕێی کرداربەندێتییەوە ڕێی دەستوورییان پێدراوە. ئەگەر کەرەستەیەکی سەرەتایی بوونی لە DS دا مسۆگەرکرابێت، بە بێ ئەوەی (ڕەگەزەکەی) وەچەدیارییکراوبێت، ئەوا دەبێت کرداربەندیی ڕێی دەستووریی بە بوونی ئەو کەرەستەسەرەتاییە بدات (بە کرداربەندییەوە بەسترابێت). ئەم چەشنە پەیوەندییە (کرداربەندییە) جۆرێك لە پێشبینیکردنی واتایی دەردەبڕێت: بە یاریدەی ئەم پەیوەندییەیە دەتوانرێت ڕێی دەستووری بەبوونی کەرەستەسەرەتاییەکان بدرێت.

٢٤- ئازیز پەلە نوست DS : * ئازیز پەلە نوست SS
ئازیز بەپەلە نوست. SS

---

[١٠٤] ئەستێرەکە (*) لەسەر هەر ڕستەیەك بێت، نیشانەی ئەوەیە، کە ڕستەکە ڕێزماندروست نییە یان ڕاست نییە (وەرگێڕ).

[١٠٥] Principle of full interpretation

[١٠٦] lizensiert sein

[١٠٧] Predikation; prediction

٢٥- ئارام  من  پێگوتی  DS  ؛  * ئارام  منی  پێگوت  SS

ئارام  بەمنی  گوت. SS

٢٦- ئارام  من  لێدای  DS  ؛  * ئارام  منی  لێدا  SS

ئارام  لە منی دا.

ڕێسای (٢٣) ڕێگە بە (٢٤) نادات، چونکە <پەلە> وەك کەرەستەیەکی سەرەتایی لەم ڕستەیەدا، ڕێی دەستووریی بە بوونی نەدراوە (چونکە کرداری نوست (ڕەگەزی) وەچەی <پەلە> ی وەك تەواوکەرێکی خۆی دیاریی نەکردووە) و چونکە دەشێت فرێزی پێشناویی[١٠٨] "بەپەلە" ببێت بە فراوانکردنێکی سەرپشکیی بەشی کرداربەندییەکە.
وەها دادەنرێت، کە DS داڕشتەی ڕاستەوخۆی گۆکردنە ڕێزمانییەکانە[١٠٩] =ڕێزمانەکە چۆن گۆدەکات، وەهایش لە DS دا داڕشتەکەی دادەڕێژرێت-. ئەم گریمانەیە ئەو واتایە دەبەخشێت، کە ڕۆڵە بابەتییەکان بە گۆکردنە ڕێزمانییەکان دەبەخشرێت و کە ئەم گۆکردنە ڕێزمانییانە دەبێت لەسەر ئاستی DS بەتەواویی و بێ کەموکووڕیی هەبن. ئەو گۆکردنەڕێزمانییانەی هیچ ڕۆڵێکی بابەتانەیان پێنەدراوە، بۆ نموونە "پڕکەرەوەی بێ واتا"[١١٠] بۆ بەشی کارکەر، لە SS (دروستەی ڕووکەش) دا دادەنرێت، چونکە ڕێسای کرداربەندیی بەم شێوەیەی، کە هەن، داوای نەکردوون.

٢٧- ( pro) پێدەچێت، ئازیز یەککەم بێت.
(pro) لەوە دەچێت، ئارام برای ئازاد بێت.

ڕستەکانی (٢٧) لەگەڵ ئەو ڕستانەی خوارەوەدا بەراورد بکە.

(٢٨) (ئازاد) لە بازاڕە.
(pro) لە بازاڕە.

---

١٠٨ Preposition پێشناوە و Prepositional Phrase یش ناودەنێم "فرێزی پێشناویی" (وەرگێڕ)

١٠٩ Chomsky, LGB (1981:43)

١١٠ pleonastische Elemente

29- Es regnet.

(باران) دەبارێت))

30- It is rainig.

### ٣/١-١-٣) دروستەی ڕووکەش SS

دروستەی ڕووکەش بەرهەمەدەرچووەکانی[111] (کەرەستەو بەرهەمی) یاساگشتییەکەی "چشتێك لە α بکە"[112] یە. ئاستی ڕووکەش ( SS) بۆیە بۆ ئەم کارەم گرنگە، چونکە ئاستی قووڵ (DS) لێڵ و نادیاردەکات. لە پاشاندا لامان ئاشکرادەبێت و دەزانین، کە هەندێك لە جۆرە ئازادەکانی وشەڕیزبوون و جێگەتایبەتییەکانیان لەسەر ئاستی ڕووکەش لە ڕێی یاساکانی جێگۆڕکێوە[113] پەیدادەبن.

### ٣/١-١-٤) ئاستی فۆرمی لۆژیکیی[114]

ئاستی فۆرمی لۆژیکیی ئەو ئاستەی زمانە، کە چەشنێکی تایبەتییەو فۆرم و شێوەی لۆژیکیی دادەڕێژێت -دارشتەکەی دادەڕێژێت و دەیخاتەڕوو-. ئاستی لۆژیکیی ڕستەیەك، لە ڕاستیدا، دارشتەی واتاکەی نییە؛ ئاستی لۆژیکیی بەتەنها دارشتەیەکە، دارشتەی ڕستەسازیی و دارشتەی واتا بەیەکەوە گرێدەدات. ڕستەی پرسیار، بۆ نموونە، ئەو دوو دارشتەیەی SS و LF ی لەم چەشنەی هەیە:

31- Welches Buch hast du gekauft t ?
j j

---

[111] Output بەرهەمی دەرهاوردەو لێدەرچوو (کەرەستەو بەرهەم)؛ Input کەرەستەی هاوردەو پێدراو

[112] Lasnik and Saito (1984)

[113] Permutation

[114] LF-Ebene

32- Für welches X, X= Buch, has du X gekauft ?

کام X ە، X = پەرتووك، تۆ X ت کڕیی؟

ئەو یاسایانەی ئاستی ڕووکەش بە ئاستی لۆژیکییەوە دەبەستن، یاساکانی بەرزکردنەوەی کوانتۆرەکانن[115] . لێکدانەوەی وەچەپێکهاتەی هێنراوەپێش و قورساییخراوەسەر[116] و گواستنەوەی وشەی پرسیار[117] ، وەك ئەوانەی لە زمانی چینییدا[118] هەن. ئاستی لۆژیکیی بۆ ئەم جۆرە ڕستانە زۆر گرنگن، چونکە ئەو یاسای گواستنەوەو جوڵاندنانەی لە زمانی کوردییدا کاریگەر دەبن، دەتوانرێن لە سەر ئاستی لۆژیکیی جێبەجێبکرێن. جوڵاندن و گواستنەوەی وەچەپێکهاتەکان لە سەر هەردوو ئاستەکە، سنووریان دیارییکراوە؛ سنوورێك بۆ خستنەکارو جێبەجێکردنەکانیان دانراوە. گرنگ ترین بەڵگەهێنانەوەکان و داواکردنی بانگەشەکانی ئەم پەرتووکە بەستراون بەم یاسایانەی جوڵاندن و گواستنەوەوەو سەبارەت بەوانن. کەواتە بێ هۆ نییە، کە من وا بەتایبەتیی بایەخ بەم ئاستە دەدەم.

## ١/٣-١-٥) کرداربەندیی[119]

کرداربەندیی میکانیزمی گرنگیی ڕێپێدانی دەستوورییە[120]. لەتەك ئەمەیشدا کرداربەندیی بۆ ئەم بەڵگەهێنانەوانە وەك پارامێتری ئاڕاستەو ڕووەولایەك پێویست و پڕ واتایە. لەبەر ئەمەیە من ئەم زاراوەیەیش دەهێنمە ناو کارەکەمەوە. بەڵگە هێنانەوکانی Wi lliams (1980) لە

[115] Quantifire raising (QR), May (1977)

[116] Fokusinterpretation ناولێنانێکە بۆ دەرخستنی زانیارییەکی سەرەکیی ڕستەیەك، کە بۆ قسەکەر گرنگە، بە گوێگرێك یان بە کەسێکی تری ڕابگەیەنێت (گوتنی بە کەسێك). ئامرازی ڕێزمانیی بۆ نیشانەکردنی ئەو زانیارییە سەرەکییە یان ناوەندییانە ئەمانەن: وەچەپێکهاتەیەك لە ڕستەدا لە شوێنی وشەیکدایە Topikalisierung ؛ ئەکسێنت Akzent : دەنگەکان، کێ بردنییەوە؟ ، منداڵەکان، کێ هێنایاننەوە (وەرگێڕ).

[117] Wh-Bewegung

[118] Huang (1982)

[119] Predikation, prediction

[120] Litzensierung

بەرژەوەندیی کرداربەندێتیی بوو، بۆ ئەوەی نیشانیبدات و دەریبخات، کە ڕێگەی دەستووری بە بوونی هەندێك کەرەستەی سەرەتایی لەسەر ئاستەکانی PF و LF دراوە، بۆیە ئەو کەرەستانە دەتوانن دەرکەون (بڕوانە ڕستەکانی (٢٧-٣٠)). وا لە خوارەوە یاساکانی کرداربەندێتیی Williams و Rothstein و مەرجەکانی وەچە=ئاڕاستەکردن [١٢١] دەخەمەڕوو.

٢٣- (ا) یاساکانی کرداربەندیی
فرێزی ناویی NP و X لەگەڵ یەکدا وەکیەك نیشانە بکە (یەك جۆر نیشانەیان بدەرێ).
(ب) مەرجەکانی وەچە ئاڕاستەکردن[١٢٢]
ئەگەر NP و C وەکیەك نیشانە کرابوون، ئەوا دەبێت NP یەك ئەو X ە یان ڤاریابڵێکی[١٢٣] ئەو X ە وەچە ئاڕاستە بکات.

٢٤- یاسای گرێدان و بەستنەوەی کرداربەندیی[١٢٤]

(ا) هەر XP یێکی لەسەر ئاستی SS ڕۆڵە بابەتانەکەی دیاریینەکراوە، دەبێت بە ئارگومێنتێکەوە ببەسترێتەوە؛ بەمەرجێك ئەم، ئەو وەچە ئاڕاستە بکات و ئەویش، ئەم وەچە ئاڕستە بکات.
(ب) بەستنەوەکە دەبێت لە لای ڕاستەوە بۆ لای چەپ بێت؛ بە واتا بەشی کارکەر دەبێت لە پێش بەشی کردارەوە بێت.

٣٥- (ا) ئازیز هات.
(ب) ئازیز بەهێکەی <u>بەکاڵیی</u> خوارد.
(پ) ئازیز <u>بەهێی کاڵ</u> دەخوارت.

٣٦- خشتەی ڕستەکان (٣٧(ا، پ))

---

١٢١ C-Kommandbedingungen

١٢٢ Williams (1980:206)

١٢٣ variable

١٢٤ Rothstein (1983:27)

(ا)




(پ)




چ بۆ ولیامز و چ بۆ رۆتشتاین، هەر ڕەگەزێك دەشێت ببێت بە بەشێکی کرداربەندیی؛ ڕستەکانی (٣٧) لەگەڵ (٣٨) دا بەراورد بکە.

٣٧- (ا) ئازاد ئازیزی نەخۆشخست.
(ب) سەربازیی ئازیزی کرد بە پیاو.

38- John made Bill sik.
John made Bill a doctor.

## ٣/١-١-٦) ڕێسای پڕۆژەسازدان[١٢٥]

دارِشتەکان لەسەر هەر ئاستێکی ڕستەسازیی ( DS و SS و LF ) ئەو پڕۆژانەن، کە بەرهەمی فەرهەنگن و بە تەواویی نیشانەتایبەتییەکانی وەچەدیارییکردنی ئایتمە فەرهەنگییەکان[١٢٦] دەگرنەوە.

---

[١٢٥] Projection Principle; Chomsky, LGB (1981:29)

٣٩- ئەگەر ئەمەی لای خوارەوەمان هەبێت

g... a ... b ...

g ... a ... b ...

(ا) ئەگەر b لەسەر L وەچەپێکهاتەی ڕاستەوخۆی g بێت و a′ = g ، ئەوا a ڕۆلێکی بابەتانە لەناو g دا بە b دەدات.

(ب) ئەگەر a وەك نیشانەو مۆرکێکی فەرهەنگیی لەناو g دا b ی هەڵبژاردو جیایکردەوە[127] ، ئەوا a لەسەر L و لەناو g دا b هەڵدەبژێرێت و جیایدەکاتەوە.

(پ) ئەگەر a لەسەر L ، b ی هەڵبژاردو جیای کردەوە، ئەوا a لەسەر L و لەناو g دا b هەڵدەبژێرێت و جیایدەکاتەوە ( L و L پلەوپایەن لە سەروو ئاستەڕێزمانییەکانەوە[128]).

ئەو ئارگومێنتەی لەسەر ئاستی قوول ڕۆڵێکی بابەتانەی پێبەخشراوە، گۆکردنێکی ڕێزمانیی[129] هەیە. ئەم پەیوەندییە لەسەر ئاستی ڕووکەش بەهۆی گواستنەوەی وەچەپێکهاتەکانەوە لێڵ و نادیاربووە. ڕێسای پرۆژەسازدان مسۆگەریدەکات، کە ئەو ڕۆڵەبابەتییانەی بەخشراون، لەسەر هەر ئاستێکی زمان هەبن. ئەم داواکردن و فەرمانەیە پێماندەڵێت، بۆچی دەبێت جێگەی ئەو ناوەڕۆکەی (بۆ نموونە وەچەپێکهاتەکەی) گوێزراوەتەوە، شوێنپێیەك لە جێی بمێنێتەوە.

بەپێی "ڕێسای پرۆژەسازدانی فراوانکراوە"[130] هەر ڕستەیەك داوای بکەرێك (Su bject) دەکات. ڕۆتشتاین ئەم داواکردن و فەرمانەی لە (٣٤) دا دەربڕیووە.

## ٣/١-١-٧) حوکمکردن[131]

حوکمکردن زاراوەیەکی دروستەیییە، بە واتا بەستراوە بە چۆنییەتیی دروستەکانەوە. پێناسەکەی چۆمسکی (١٩٨١:١٦٥) بۆ حوکمکردن بەم شێوەیەی لای خوارەوەیە.

---

[126] Morphems and Items

[127] selektiert

[128] Ränge über der syntaktischen Ebene

[129] grammatische Funktion

[130] Extended projection principle (EPP)

[131] Chomsky , Markedness and Core Grammer (1980:12)

٤٠- a حوكمی g دەكات لە

ئەگەر b ... g ... a ... g ...,

X = a (ا)

(ب) ئەگەر b گەورەترین پرۆژە بێت، و ئەگەر b لە پلەدا بەسەر g دا زاڵبوو[١٣٢]، ئەمجا b لە پلەدا بەسەر a دا زاڵدەبێت؛

(پ) a وەچە ئاڕاستەی g دەكات.

## ١/٣-١-٨) پەیوەندیی ئاڕاستەكردن[١٣٣]

وەچەئاڕاستە[١٣٤]: پێناسە جیاوازەكانی وەچەئاڕاستەكردن پێشبینیی فرەچەشن و جۆراوجۆر لەبارەی جۆری ئەم پەیوەندییەوە دەكەن و بەدەستییانەوە دەدەن.

٤١- [١٣٥] - Reinhart

گرێی A وەچەئاڕاستەی گرێی B دەكات، ئەگەر A و B لەپلەدا بەسەریەكتریدا زاڵ نەبن و ئەگەر یەككەم گرێی دووفلیقانەی (دووپەلكیی) لەپلەدا بەسەر A دا زاڵە، بەسەر B یشدا زاڵبێت.

٤٢- [١٣٦] -Chomsky

a بەتەنها كاتێك وەچەئاڕاستەی b دەكات، ئەگەر

(ا) b لەناو a دا نەبێت (لەخۆیدا هەڵی نەگرتبێت)

(ب) گریمان، كە g، ... g، گەورەترین زنجیرەی یەك لەدوای یەكە، وەك لە

(i) a = g

(ii) g = g

---

[١٣٢] dominieren بەسەردازاڵبوون یان لەپلەوپایەدا كەوتنە ژێر ڕكێفی كەسێك یان چشتێكی پلە بەرزەوە (وەرگێڕ).

[١٣٣] Command

[١٣٤] C-Command

[١٣٥] Reinhard (1976)

[١٣٦] Chomsky, LGB (1981)

(iii) g ڕاستەوخۆ لەپلەدا زاڵە بەسەر g دا، ئەمجا
(پ) نە d لەپلەدا بەسەر b دا زاڵەو
(ت) نە g = d وە G لەپلەدا بەسەر b دا زاڵە.

پێناسەکەی ڕاینهارت بۆ "پەیوەندیی وەچەئاڕاستەکردن" بەشێوەیەکی سەرەکیی وابەستەی جیابوونەوەی دووفلیقانەیە (دووپەلکییە)[١٣٧]؛ پێناسەکەی چۆمسکی وابەستەی پرۆژەیە[١٣٨]. لە پێناسەکەی چۆمسکیدا سەرەکان لە ڕکێفی[١٣٩] گەورەترین پرۆژە[١٤٠] دا وەچەئاڕاستەی هەر وەچەپێکهاتەیەك دەکەن، بەمەرجێك هەموو ئەو پرۆژانەی لە ژێر گەورەترین پرۆژەکەدان، یەك جۆر نیشانەی تایبەتیی ڕەگەزیان (کاتەگۆریان) هەبێت. لە (٤٣) دا هەموو زنجیرەی پرۆژەکان X ، X′ ، Xm ، Xm2 ، لە ڕەگەزی X ن. بۆ چۆمسکی ڕکێفی وەچەئاڕاستەکردنی X، Xm2 ە. بۆ چۆمسکی ڕکێفی وەچەئاڕاستەکردنی Zm، X′ ە. بۆ ڕاینهارت ڕکێفی وەچەئاڕاستەی X و Zm، X′ ە، چونکە X′ بۆ X و Zm یەککەم گرێی دووفلیقانەی جیابووەوەیە.

-٤٣




---

[١٣٧] Verzweigungen

[١٣٨] Projection

[١٣٩] Domäne

[١٤٠] maximale Projektion

سەرەئاراستەکردن[141] :

کاتێك A سەرەئاراستەی B دەکات، ئەگەر A لە پلەدا زاڵ نەبێت بەسەر B داو ، ئەگەر هەر G یەکی لە پلەدا زاڵە بەسەر A دا، زاڵیش بێت (لە پلەدا) بەسەر B داو G یش گەورەترین پرۆژەیەك بێت.

لە پلەدا بەسەردا زاڵبوون [142] :

G بەتەنها کاتێك لە پلەدا زاڵە بەسەر A دا، کە هەر سەگمێنتێکی G لە پلەدا زاڵ بێت بەسەر A دا.

## ٣/١-١-٩) حوکمکردنی توند (تەواو) و ڕێسای ڕەگەزە بۆشەکان[143]

لە چۆمسکی (١٩٨١) دا، ئەم چەشنەی حوکمکردن وابەستەی چەشنی کەرەستەسەرەتاییەکەی سەرەو ئەم چەشنەی حوکمکردن بەشێکی پێناسەکەی چۆمسکییە بۆ حوکمکردن.

٤٤- Aoun and Sportiche [144]

کاتێك A حوکمی B دەکات، ئەگەر A لەپلەدازاڵبێت بەسەر B داو (ا) A فەرهەنگیی[145] ، یان (ب) A و B بەیەکەوە وەکیەك نیشانە کرابێتن[146].

ئەم نەخشەوناوەرۆکە لە ڕێسای ڕەگەزە بۆشەکاندا وەك لە (٤٥) دارێژراوە، دووبارە نووسراوەتەوە:

٤٥- ڕێسای ڕەگەزە بۆشەکان (ECP)
e دەبێت توند (تەواو) حوکمکرابێت.

(٤٤) و (٤٥) ئەو ناوەرۆکە نێواندژانە (دژبەیەك) ی لەو چەشنانەی خوارەوە ڕووندەکەنەوە.

---

[141] , Chomsky (1986), M-Command

[142] Dominanz, Chomsky (1986)

[143] Proper Government and the empty category principle (ECP)

[144] Aoun and Sportiche (1983)

[145] lexikalisch

[146] koindiziert

46-* c a dah t taht yas nhoJ did ohW at?
47- What did John say that Bill hat t ?
48- Who t had a cat ?

ڕستەی (٤٦) بۆیە ڕێپێنادرێت، چونکە ڕەگەزە بۆشەکە لەم ڕستەیەدا لەلایەن INFL ەوە حوکمی کراوە، کە کەرەستەیەکی سەرەتایی فەرهەنگیی[147] (ناوفەرهەنگ) نییە. لە (٤٧) دا ڕەگەزە بۆشەکە لەلایەن کردار (head) ەکەوە حوکمکراوە، کە کەرەستەیەکی سەرەتایی فەرهەنگییە. لە (٤٧) دا ڕەگەزە بۆشەکە لەلایەن کەرەستەیەکی سەرەتاییەوە حوکمکراوە، کە لە Comp دایەو لەگەڵیدا هەمان نیشانەی ناوەڕۆک[148] ی هەڵگرتووە.

## ١/٣-١-١٠) حوکمکردن و PRO[149]

چەمکی ئەم حوکمکردنە لە چۆمسکی (١٩٨١) دا بەکارهێنراوە، بۆ ئەوەی بەڕێکوپێکیی و ڕژێمناسا چۆنیەتیی دابەشبوونی PRO ڕوونبکاتەوە. بەڵگەو بەڵگەهێنانەوەکان بەم جۆرە خراونەتە ڕوو.

لەبەرئەوەی PRO هەم ئەنافەرە[150] و هەم جێناوە و لەبەرئەوەی ئەنافەر دەبێت لە ڕکێفی ڕەگەزی حوکمکەرەکەیدا بەستراوە بێت، بەڵام جێناو ئازادە لەو ڕکێفەدا، نابێت PR O ڕەگەزێکی حوکمکەری هەبێت.

## ١/٣-١-١١) تیۆریی دۆخی ڕێزمانیی[151]

دۆخی ڕێزمانیی لەلایەن ئەو ڕەگەزە فەرهەنگییەوە بە فرێزێکی ناویی دەدرێت، کە لەلایەن ئەو ڕەگەزەوە حوکمی دەکرێت.

---

[147] lexical Element

[148] Referenzindex

[149] Rektion und PRO

[150] Anapher

[151] Kasustheorie

## ١/٣-١-١٢) دۆخی ڕێزمانیی وەك پالێوەر[١٥٢]

پالێوەرەکە داوادەکات، کە دەبێت بەهەر فرێزێکی ناویی دۆخێکی ڕێزمانیی درابێت؛ لەبەر ئەمەیە NP*، ئەگەر ئەم فرێزەناوییە ناوەڕۆکی فۆنەیتیکیی[١٥٣] هەبێت و دۆخی ڕێزمانیی پێنەدرابێت[١٥٤].

---

[١٥٢] Kasusfilter

[١٥٣] phonetischer Inhalt

[١٥٤] Chomsky (1980:49)

# بەشی دووهەم

## ڕژێمی ´X و دروستەی فریز زەهەڵگوێزراوەکان وجێگەکانی وشە لە ڕستەداو دۆخی ڕێزمانیی لە زمانی کوردییدا

لەبەشی یەککەمدا، مۆدێلی ڕێزمانەکەی چۆمسکیی لە دارشتەی ژمارە (١٣) دا خرایە ڕوو. ئەگەر من ئەو مۆدێلە وەك سەرەتایەك بۆ دەستپێکردن بە هەوڵەکەم لە پەسنکردنی زمانی کوردییدا بەکاربهێنم و تیۆرییەکەی چۆمسکی "تیۆریی بەرهەمهێنان " وەك بناغەو بنەڕەتێك بۆ ئەم پەسنکردنە جێبەجێبکەم، ئەوا دەتوانم جیاوازیی لەو پارامیتّرانەدا بدۆزمەوە، کە زمانی کوردیی بۆ خۆی هەڵیبژاردوون. هەندێك جیاوازیی دیارییکراویش لە پێکهاتەی گواستنەوەدا[155] و لەو یاسایانەی گواستنەوە[156] دا، کە ئەم پێکهاتەیەی ڕێزمانیان پێکهێناوە، لەگەڵ سنووربۆدانان و مەرجەکانی بۆ ئەو یاسایانە دەخۆن، دەبینیینەوە. کەواتە یەکێك لە مەبەستە سەرەکییەکانم ئەوەیە، چۆنیەتیی یان سروشتی ئەم پێکهاتەی گواستنەوەیەو پەیوەندیی لە گەڵ پێکهاتەکانی تری ڕێزمانەکەماندا ڕوونبکەمەوە.

من دەمەوێت ڕێزمانی کوردیی وەك بەرنامەیەکی ڕێنمای دەستووریی[157] بۆ پێکهێنانی ڕستەکانی زمانی کوردیی پێناسەبکەم. بۆ ئەو مۆدێلەیش بەرنامەیەك پێکدێنم، کە ئەو یاسایانەی ڕێنما دەستوورییەکانی[158] تێدابێت. بابەتەکان بەتەنها بە کێشەو پرسیارەکانی دروستەی ڕستەسازییەوە بەستراون و لەبارەی ئەوانەوەن؛ خۆیان، بە مەبەستی لەیەکترازاندنی ئەو ئەندام و کەرەستانەی لێیپێکهاتوون، بە شیتەڵکردنی جومگەکانی[159] ڕستەکانییەوە خەریکدەکەن؛ بەواتا خۆیان بە جیاکردنەوەی ڕەگەزە فەرهەنگیی و ڕەگەزە سینتاکسیکانییەوە خەریکدەکەن. لەیەك ترازاندن و جیاکردنەوەی ئەندام و جومگەکانی ڕستە یاساجڵەوگیرن[160] و بە یاسا دەکرێن. بەم پێیە و بە گوێرەی ئەم ناوەرۆکە، "ڕێزمانی وەچەپێکهاتە"[161] ڕژێمێکی لە یاسا[162] تێدایە. ئەم ڕژێمەی لە یاسا پێکهاتووە "زنجیرەی

---

[155] Transformationskomponente

[156] Transformationsregeln

[157] Anweisung

[158] Regelanweisung

[159] Gliederung

[160] regelgesteuert

[161] Konstituentengrammatik

[162] Regelsystem

وشەڕێزمانییەکان"[١٦٣] بەرهەمدێنن و (داڕشتەی) "دروستەی وەچەپێکهاتە"[١٦٤] یەك یان چەند وەچەپێکهاتەیەك دەخاتە پاڵ ئەو زنجیرەی وشانە -بۆ ئەو زنجیرەو وشانە دادەنێت-.
"یاساکانی دروستەی فرێز" ی زاری سلێمانییم لە پارامێترەکانی زمانی کوردیی هەڵبژاردووە (ئاراستەی دۆخی ڕێزمانیی بەرەو لایەك، مەرجی هاوسێیەتیو ئارگومێنتەکان، ... هتد) و لە تیۆریی X´ م هەڵگواستوون. من وای دادەنێم، کە یاساکانی دروستەی فرێزی زاری سلێمانیی ڕژێمێکی لەیاسای لەم چەشنەی تێدایە:

1- (ا) V´ ⟶ V´ - N´´
(ب) V´ ⟶ (N´´) – (PP) - V´
(پ) N´´ ⟶ N - Det

بزانە کە:

V´ = S
V´ = VP
DP = N´´ = DP = NP

## ١/٢) ڕژێمی X´ و یاساکانی هەڵگواستنی دروستەی فرێز[١٦٥]

نیشانەتایبەتییەکانی "ئایتمە فەرهەنگییەکان"[١٦٦] و "مەرج و بنەما بابەتییەکان"[١٦٧] لە فەرهەنگەوە گوێزراونەتە ناو ئاستی قوڵی ڕستەسازیی DS ەوە. ئەم کردەیە لە ڕێی ڕێسای پرۆژەسازدان و نەخشەو شێوە ئەندازیارییەکان X´[١٦٨] ەوەو لەڕێی هەندێك لەمەرجەکانی نیشانەتایبەتییەکانی دروستەی فرێزەوە دیاریکراوەو سنووری بۆدانراوە[١٦٩]:
پارامێترەکانی (ا) دۆخی ڕێزمانیی (بوونی ئەو ڕگەزانەی وەك سەری ڕێزمانیی دۆخی ڕێزمانیی دەدەن؛ ئاراستەو ڕووی حوکمکردن؛ بەواتا سروشتی پێدانی دۆخی ڕێزمانیی و لایەنەبابەتییەکان و (ب) خەسڵەتەکانی کەرەستەسەرەتاییە فەرهەنگییەکان، ئەو خەسڵەت و نیشانانەی دروستەی فرێز دیارییدەکەن، کە تایبەتن بە زمانێکی وەك زمانی کوردییەوە.

---

١٦٣ grammatische Wortketten
١٦٤ Konstituentenstruktur
١٦٥ PS-Regeln
١٦٦ lexikalische Items
١٦٧ Theta-Kriterien
١٦٨ X´-Schemat
١٦٩ Chomsky (1985)

گشت ڕەگەزەکان پڕۆژەی ڕەگەزەکانی X ن[١٧٠]
نەخشەوشێوە ی ´X ی[١٧١] ژمارە (٢)، هی چۆمسکییەو نەخشەو شێوەئەندازیارییەکەی (٣) دەخاتەڕوو.

٢- نەخشەوشێوەی ´X ەکەی چۆمسکیی (١٩٨٥)

$$X'' \longrightarrow Spec - X'$$
$$X' \longrightarrow X - Comp$$




ڕێسای پرۆژەسازدانی فراوانکراو[١٧٢] شوێنی Spec دیارییدەکات. بە گوێرەی تیۆری ´X، وەچەپێکهاتەکان دەگوێزرێنەوە بۆ شوێنی Spec. بەم گواستنەوەیە شوێنی Spec بە کەرەستەی فەرهەنگیی پڕدەبێتەوەو بوونی شوێنی Spec یش ڕێی دەستووریی وەردەگرێت -هەرچ شوێنێك کەرەستەی فەرهەنگیی تێدابوو یان کەرەستەی فەرهەنگیی بۆ گوێزرایەوە، ئەوا بە پێی دەستوور ئەو شوێنە بوونی هەیە-. بەگوێرەی ئەم تیۆرییە، دەبێت (شوێنی) Comp سەرێك و وەچەپێکهاتەی INFL[١٧٣] (IP) ی هەبێت. بوونی شوێنی Comp یش بەوە ڕێی دەستووری پێدەدرێت، کە بە کەرەستەی فەرهەنگیی پڕدەبێتەوە.

---

[١٧٠] Chomsky (1986)

[١٧١] X′-Schema

[١٧٢] Extended Projection Principle (EPP)

[١٧٣] کردار لە "ڕەگی کردار" و کات و کەس" داڕێژراوە. لە کاتێکدا ڕەگی کردارو کات قەدی کردار دادەڕێژن، قەدی کردارو کەس کردارە کاتییەکەتەواودەکەن. بە کات و کەسی کردار دەگوترێت IN F L.

ئەم شیکردنەوە سەردەمییەی ڕۆشتووەو کاری پێکراوەو پێیدەکرێت، بەم جۆرە لەلایەن Fukui/Speas[١٧٤] ەوە بەدەستکارییکردنەوە گۆڕدراوە: لە شیکردنەوەکەی X´ ی تیۆرییەکەی خۆیاندا، فوکوی / سپییس ئەو X´ انەی گەورەترین پرۆژەی ڕەگەزی فەرهەنگین[١٧٥] لەو X´´ انە جیاکراونەتەوە، کە گەورەترین پرۆژەی ڕەگەزی گۆکەرن[١٧٦] (XP).

٢/١-١) Fukui/Speas (1986)

ڕەگەزی فەرهەنگیی (LK):

ڕەگەزەفەرهەنگییەکان پرۆژەکانی ئەو نیشانەتایبەتییانەی (+/-V, +/-N) ی چۆمسکین؛ ئەو خەسڵەتانەی لە "تۆمارکراوە فەرهەنگیی"[١٧٧] (تۆڕی لایەنەبابەتییەکان[١٧٨] و تۆڕی دۆخی ڕێزمانیی[١٧٩] Higginbotham[١٨٠]) ەکەدا هەبوون. پرۆژەکانی ڕەگەزە فەرهەنگییەکان LK و X´ ەکانن. چونکە ئەم X´ انە شوێنی Spec ی بەزۆرو خورتەکییان نییە؛ داواناکرێت، کە هەر دەبێت شوێنی Spec یان هەبێت. ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی، کە دووپاتبوونەوە ڕووبدات و دووبارەبوونەوە هەبێت. ڕێسای پرۆژەسازدان ڕێدەدات، کە ئارگومێنتێکی زۆر، کە لەڕێی دەستوورەوە ڕێپانیپێدراوەو لێکدراونەتەوە، لە سەر ئاستی لۆژیك بەرهەمبهێنرێن. نەمامەئەندازیارییەکەی[١٨١] (٤) بۆیە ڕێبپێدراوە، چونکە ئەو ڕەگەزەی دووبارە بووەتەوە نە سەرێکەو نە تەواوکەرێکە[١٨٢].

---

کات و کەسی کرداری کوردیی کەرەستەی فەرهەنگین (/گر/ت/م/ ؛ /دە/گر/م/). کات و کەسی کردار لە زمانی ئینگلیزیدا، بۆ نموونە، کەرەستەی فەرهەنگیی نین، بەواتا لاگری فەرهەنگیی نین.

١٧٤ Fukui/Speas (1986) بەراوردی بکە لەگەڵ Fukui (1986)

١٧٥ Lexikalische Kategorien (LK)

١٧٦ funktionale Kategorien (FK)

١٧٧ lexikalische Eintragung

١٧٨ Themen-Netz

١٧٩ Kasusnetz

١٨٠ Higginbothan (1985)

١٨١ Baumdiagram

١٨٢ Komplement

4-



هـەر ڕەگـەزێکی فەرهـەنگیی، وەك بەشـێکی تۆمـارکراوە فەرهەنگییەکـەی خـۆی، تۆڕێکـی بابەتانەی هەیە. ئەو دروستەقووڵەی لە فەرهەنگەوە بۆ ڕستە ڕەنگی ڕێـژراوەو سـنووری بـۆ دانراوە، هیچ لەو بارەیەوە نالێت، ئەگەر هەموو سەرە فەرهەنگییەکان شوێنێکی Spec یان هەبێت یان نا. بە پێی ئەم تیۆرییە گشت NP و S (ڕسـتە) ە کـانی زمـانی یابـانیی وەك پرۆژەدیاریخەرەکان[183] و پرۆژەی V′ سەیریان دەکرێت و مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت.

ڕەگەزە گۆکەرەکان:

XP کان پرۆژەکانی ئەو ڕەگەزە گۆکەرانەن، کە لە نەخشەو شێوەئەندازیارییەکانی X′ دا یەك شوێنیان بۆ Spec و یەك شوێنیان بۆ تەواوکەرەکەیان[184] هەیەو بەس.

5- a)



5- b)



ڕەگەزە فەرهەنگییەکان Comp و DET و INFL ن؛ گشتیان سەرن. هیچیان نیشانەی تایبـەتیی N یـان V یـان هەڵنـەگرتووە. لەبەر ئەمەیە وەك ڕەگەزی گۆکەر نـەك وەك ڕەگـەزی فەرهـەنگیی سـەیریاندەکرێت. لـە چۆمسـکی (١٩٨٥) دا هـەر ڕەگـەزێکی گۆکـەر لـە نەخشـەو

---

[183] Det-Projection, پیاوێك، پیاوەکە، پیاوەکان

[184] Komplement

شێوەئەندازیارییەکەی X´ دا خراوەتە پاڵ (دراوەبە) شوێنی Spec. لەم ڕژێمەدا هەر پرۆژەیەك بەتەنها یەك شوێنی Spec ی هەیەو ئەم شوێنی Spec ە یش پرۆژەکەی داخستووە. ئەم خەسڵەتەیە بۆتە هۆی ئەوەی، کە X´´ گەورەترین پرۆژەی ڕەگەزەگۆکەرەکان بێت. ئەمە ئەوە دەبەخشێت، کە ئەم شوێنی Spec ەی چۆمسکی بەپێی پەیوەندییەکانی نێوان نەخشەو شێوەئەندازیارییەکانی X´ پەسنیکردوون، لەم تیۆرییەی فوکوی/ سپیسدا وەك کەرەستەیەکی سەرەتایی سەیری دەکرێت، کە پرۆژەیەك دادەخات. هەر پرۆژەیەك Spec یێکی هەبێت، X´´ یێکی (یەکەیەکی) داخراوە. ڕەگەزە گۆکەرەکان بوون بە پارامێتەر: دەشێت، زمانەکان هەندێك لەو ڕەگەزە گۆکەرانەیان هەبێت یان هیچیانیان نەبێت. لەبەرئەوەی ڕەگەزەگۆکەرەکان ڕێی دەستووریی بە پرۆژە داخراوەکانی X´´ دەدەن، ئەو زمانانەی ڕەگەزی گۆکەریان هەیە، نە گواستنەوەی "وشەی پرسیار" و نە گواستنەوەی "فرێزی ناویی" یان لە ڕستەدا هەیە.

ڕەگەزەگۆکەرەکان ئەو کەرەستەسەرەتاییانەیان (نیشانەتایبەتییەکانی گۆکردن ((F-Features) Funktional-Features) تێدایە، کە بە کەرەستەسەرەتاییەکانی تری دەبەخشن. شوێنی Spec ی ڕەگەزێکی گۆکردن کاتێ'ك دەردەکەوێت، کە بتوانرێت خەسڵەتەکانی گۆکردنی سەرەڕێزمانییەحوکمکەرەکەی (F-Kopf) تێدا خاڵیی بکرێتەوە. نەبوونی شوێنی Spec ئاستی پرۆژەکە نزمدەکاتەوەو دەیکات بە ئاستێکی یەك باریی (X´). ئەو کەرەستەسەرەتاییەی ڕێی دەستووریی بەبوونی Comp دەدات، "وشەیەکی پرسیار"ە؛ لەبەرئەوە خەسڵەتی Wh+ وەك خەسڵەتەکانی گۆکردن و بەم پێیە وەك پێدەری دۆخی ڕێزمانیی سەیریدەکرێت. هاوتەریب و بەرامبەر بە سەرەگۆکەرەکان، کە Comp و INFL ن، ئەو شوێنەی "دیارییکەر" یش (پاشگری ناسیاریی و نەناسیاریی[185]) لە فرێزێکی ناوییدا پڕیدەکاتەوە، وەك "سەرێکی خاوەن نیشانەی تایبەتیی گۆکردن"[186] سەیریدەکرێت.

6-




---

[185] Artikel

[186] Fuktional-Kopf

کەواتە "هەلومەرجی هەڵبژاردنی یان گۆڕینی ئازاد"[187] لەنێوان to / TENSE لە INFL دا و لەنێوان Wh/that لە Comp داو لەنێوان Artikel/Genetiv-Marker لە Det دا هاوتەریبن.

7-a)



"دابەشبوونی تەواوکەرانەی"[188] ئەم کەرەستەسەرەتاییانە ئەوە دەسەلمێنێت، کە Wh، TENSE و Genetiv-Marker کەرەستەی سەرەتایین و دۆخی ڕێزمانیی دەبەخشن. ئەمەیش ئەوە ڕووندەکاتەوە، کە نابێت یان ناتوانرێت شوێنی Comp دووجار یان بە دوو کەرەستە پڕبکرێتەوە (Comp شوێنی دووکەرەستە نییە).

شوێنی Spec:

بەپێی چۆمسکی[189] تەنها فرێزی ناویی NP و پرۆژەی ڕستە S-Projektion شوێنی Spec یان هەیە بۆ ستاوڵ[190] کاتێك هەر X′′ یێك دەتوانێت شوێنێکی Spec ی تێدابێت، کە ئەو شوێنە بتوانرێت دۆخی ڕێزمانیی پێبدرێت. ئەگەر شوێنی Spec ی IP نە لە ڕێی نیشانەتایبەتییەکانی گۆکەرەکانەوە FK و نە لە ڕێی ڕێسای پرۆژەسازدانی فراوانکراوەو

[187] Alternation

[188] komplementäre Verteilung

[189] Chomsky (1970)

[190] Stowell (1983)

نه له ڕێی کاربەندیی Williams[١٩١] و Rothstein[١٩٢] ەوە دیارییکرابێت، ئەوا دەبێت سەرپشکیی و بە هەڵبژاردن بێت[١٩٣]. ئەوانەی دراخمان شوێنی Spec ی ئازاد[١٩٤]ی ناوناون: ئەو هەڵواسراوو لکێنراوانەن[١٩٥]، کە حوکمی دۆخی ڕێزمانیی ناکرێن. کەواتە ئەو شوێنی Spec ەی حوکمی دۆخی ڕێزمانیی ناکرێت، بەو NP یانە پڕدەکرێنەوە، کە خۆیان دۆخی ڕێزمانییان هەیە. لە ئەنجامی ئەمەدایە، دەشێت هەر ڕەگەزێك بەشێکی بە سەرپشکیی (A djunktion+ Comp+ Kopf+Spec) هەبێت[١٩٦]. بە پێی ئەم تیۆرییە، کاتێك شوێنی Spec ڕێی دەستووریی پێدەدرێت، کە پەیوەندیی لەگەڵ شوێنی ئارگومێنتێکی[١٩٧] بەشی کردارێکدا[١٩٨] هەبێت (وەك ئەوەی لە کرداری بکەرنادیار[١٩٩] دا هەیە). بۆیە شوێنی Spec بۆ کەسێکی وەك "تیرش"، لە ڕێی سەرێکەوە نەك لە ڕێی دۆخی ڕێزمانییەوە ڕێی دەستووریی پێدەدرێت. بۆ فوکوی/سپیس شوێنی Spec شوێنێکی ´A ە (جێی لایەنی بابەتانە نییە، بە واتا جێی ئارگومێنتێك نییە[٢٠٠])) و لە ئاستی قوڵدا DS چۆڵە، بەڵام پێویستە لەسەر ئاستی ڕووکەش SS پڕبکرێتەوە؛ چونکە شوێنێك، کە حوکمی دۆخی ڕێزمانیی کرا، دەبێت پڕبکرێتەوە یان پڕکرابێتەوە. کەواتە ئەو کەرەستەسەرەتاییەی شوێنی Spec ی IP دەگرێت، دۆخێکی ڕێزمانیی نییە، بەڵام ڕۆڵێکی بابەتانەی هەیە. لەم پەیوەندییەدایە، کە دۆخی ڕێزمانیی ڕێی دەستووریی بە N P/N دەدات و، کە Wh+ ڕێی دەستووریی بە Spec دەبەخشێت وە Wh- یش IP چالاك دەکات و دەیخاتەکار.

دۆخی ڕێزمانیی:

بەخشینی دۆخی ڕێزمانیی بەزۆرو خورتەکییە[٢٠١]. دەبێت گشت ئەو نیشانەتایبەتییانەی دۆخی ڕێزمانیی، کە هەن، خاڵیی بکرێنەوە -پێویستەببەخشرێن- (بەراوردیی بکە لە گەڵ

---

١٩١ Williams (1980)

١٩٢ Rothstein (1983)

١٩٣ Drachman (1988)

١٩٤ freie Spec-Position

١٩٥ Adjunktion

١٩٦ سەیری Thiersch (1978, 1985, 1987) بکە!

١٩٧ Argumentstelle

١٩٨ Prädikat

١٩٩ Passivverb

٢٠٠ nicht-Argumentstelle

٢٠١ obligatorisch

ڕێسای تێرکردنی تۆڕی دۆخی ڕێزمانیی و لایەنی بابەتانەدا[202]). لە کاتێکدا سەری فەرهەنگیی LK لە DS دا ڕۆڵی بابەتانە دەبەخشێت، لە SS دا دۆخی ڕێزمانیی دروستەیی[203] دەدات. دۆخی ڕێزمانیی زگماکیی[204] لە DS دا یان لە شوێنی خۆیدا[205] یان لە زنجیرەیەکدا دێتەدیتن[206]. وەهایش دانراوە، کە ئاڕاستەو ڕووی بەخشین و پێدانی دۆخی ڕێزمانیی بەلایەنی کەمەوە لەناو یەك زماندا، "یەك جۆریی"[207] ە[208]. بەڵام گۆکردنی ڕێزمانیی لە تیۆرییەکەی فوکوی/سپیسدا بەگوێرەی چەشنی ڕەگەزە؛ ڕەگەزە گۆکەرەکان F K لە چەپەوە بۆ لای ڕاست دۆخی ڕێزمانیی دەبەخشن، ڕەگەزی گۆکەری فەرهەنگیی LK بە پێچەوانەوە لە لای ڕاستەوە بۆ لای چەپ دۆخی ڕێزمانیی دەدەن. بەخشینی دۆخی ڕێزمانیی (خاڵیکردنەوەی خەسڵەتەگۆکەرەکان F–Features)، کە ڕێی دەستووریی بە کەرەستەسەرەتاییەکەی ناو شوێنی Spec دەدات، دەبێت یان لە لایەن سەرێکی گۆکەر(FK)ەوە بێت یان لەلایەن کەرەستەیەکی سەرەتایی فەرهەنگیی L K ەوە بێت. لەبەرئەوەی ئامادەبوونی کەرەستەیەکی سەرەتایی لە شوێنی Spec ی ڕەگەزێکی گۆکەر FK ی دیارییکراودا بە هەبوونی دۆخێکی ڕێزمانییەوە بەستراوە، بوونی شوێنی Sp ec لە ڕێسای پرۆژەسازدان پچڕاوەو جیابووەتەوە. ئەو NP -بکەرەی ڕاستەوخۆ لە کردارێکەوە ڕۆڵێکی بابەتانەی پێدەدرێت، خۆی لەناو پرۆژەی کردارێکدایە (بڕوانە (4)) و لەم شوێنەدا حوکمی دۆخی ڕێزمانیی ناکرێت. بۆیە پێویستی بە "مێکانیزمی لێکدراو"[209] ی پێدانی لایەنی بابەتانە نییەو ئێمەیش دەست لەم مێکانیزمە هەڵدەگرین.

## ٢-١/٢) هەڵگواستنی شێوەی ڕیزبوون لە ئاستی ڕووکەشدا[210]

لەم شیکردنەوەیەداو پەیوەست بە پەیوەندییەکانی کاربەندێتیی ڕۆتشتاینەوە[211] و پەیوەست بە پێناسەی لایەنی بابەتانەوە (تۆڕی بابەتانە) ی هیجینگ بۆتام[212] ەوە، "ڕێسای

[202] Sätigungsprizip für das Kasus- und Themen-netz

[203] struktureller Kasus

[204] inherenter Kasus

[205] in situ

[206] Chomsky (1984, 1986)

[207] homogen

[208] Stowell (1981), Koopman (1984)

[209] kompositioneller Mechanismus

[210] Ableitung der Oberflächenordnung

تـێرکردن" هێنراوەتەکایـەوەو گەشـەپێدراوە، بـۆ ئـەوەی ڕێپێدانــی دەسـتووریی شـوێنەکان لەلایـەن سـەرەفەرهەنگییەکانەوە (ئـەو سـەرانەی تـۆڕی بابەتانـەو دۆخـی ڕێزمانیـان هەیــە) یـان لەلایەن ئەو سەرانەی بەتەنها تۆڕی دۆخی ڕێزمانییان هەیە) بەڕەوا بسەلمێنرێت.

٨ - ڕێسای تێرکردن (Sätigungsprinzip) [213]:

(ا) هەر شوێنێك لە تۆڕێکدا بۆ خاڵیکردنەوەیە؛

(ب) ئەگـەر X لـە شـوێنی a ی تۆڕێکـدا خاڵیکرایــەوە، ئــەوا بەتەنــها یــەك دانــە خاڵیدەکاتەوە[214]. (Discharged)

ئەم ڕێسایە لایەنە بابەتییەکان بە مەرج و پێویستیی خاڵیکردنەوەی نیشانەتایبەتییەکانی دۆخی ڕێزمانییەوە[215] دەبەستێتەوە. بۆیە دەبێت ڕەگەزێك لە N´/ V´ دا بجوولێنرێت، تاوەکو بتوانرێت بەپێی گریمانە سەردەمییەکە لە ڕاستەوە بۆ لای چەپ دۆخی ڕێزمانیی پێبدرێت. ئیتر گرنگ نییە، ئەگەر D P لە (٩) دا ئارگومێنتێکی N بێت یان نا. گرنگ ئەوەیە، کە ئەو دۆخەڕێزمانییەی D داوێتی، تێیدا بێت یان وەریگرتبێت. بەرامبەر بەمە، بەرزکردنەوەی بکەر لـە (٨) دا هـۆو هـاندەرێکی یـان بزوێنـەرێکی هەیـە. بزوێنەرەکـەیش ئەوەیـە، کـە ئـەو بکـەرە بەتەنها لە ڕێی ئەم بەرزکردنەوەوەیـە، لـەم شوێنەدا ئەو نیشانەتایبەتییانە وەردەگرێت، کە INFL دەیانبەخشێت.

9-




---

[211] Rothstein (1983)

[212] Higgingsbotham (1985) and Stowell (1981)

[213] Fukui/Speas (1986)

[214] لەبارەت بۆچوونێکی دژ بەمەوە بڕوانە: Hornstein/Lightfoot (1987)

[215] Kasusfeatures

10-




له (۹) دا یـان ئـەو ئارگومێنتـە پێشـناوێکی پووکەشـیی " of" وەردەگرێت، یـان دەبێـت بگوێزرێتـەوە بۆ شوێنی Spec ، بۆ ئـەوەی لـەوێ لـە لایـەن " s" ەوە مارکـەی خسـتنەپاڵ[۲۱٦] وەربگرێـت. ئەمـەیش لەبەرئەوەیـە، چونکـە نـاو بـەلای چۆمسـکییەوە[۲۱۷] دۆخـی ڕێزمـانیی دروستەیی نادات، بەڵکو بەتنها دۆخی ڕێزمانیی زگماکیی[۲۱۸] هەیە.

## ۲/۱-۳) زمانی کوردیی (زاری سلێمانیی)

### ۲/۱-۳-۱) دروستەی ناوەوەی فرێزی ناویی

بۆ ڕوونکردنەوەی پێکهاتووی پێشناویی و خستنەپاڵ[۲۱۹] دوو هەلومەرج پێشـنیازکراون و خراونەتە بەردەستتان[۲۲۰] :

۱۱- هێنانە ناوەوەی (زیادکردنی) پێشناوێکی بۆش، وەك لە:

a) „the destruction of the city"

b) „the destruction of the city by enemy"

---

[۲۱٦] Genetiv Marker

[۲۱۷] Chomsky (1986)

[۲۱۸] inhärenter Kasus

[۲۱۹] Dative- aund Genetivkonstruktionen

[۲۲۰] Chomsky (1970; 1984)

١٢- هێنانەناوەوەو زیادکردنی مارکەی خستنەپاڵێك پاش جۆرێك لە جولاندنی فرێزێکی ناویی، وەك لە:

a) „the city`s destruction"

b) „the enemy`s destruction of the city"

بۆ دەستپێکردن بە لێکۆڵینەوەکانم، بە ئامانجێکی کارەکەمی دەزانم لە دوو خاڵی سەرەکیی بدوێم، کە ڕەچاومکردوون:
(١) زمانی تیۆریی و زانست ئاسانە و ڕستەکانی کورت و ساکارن. تیۆریی ساکارو ئاسان، ئەو تیۆرییەیە، کە تا ئەو ڕادەیەی دەکرێت، چەند ڕێزمانی زمانێك خۆی ئاڵۆزە یان ساکارە، وەك خۆی شیبکاتەوەو بیخاتەڕوو. ڕێزمانی ئاسانیش، ئەو ڕێزمانەیە، کە دە ستوورێکی/چەند دەستوورێکی یان یاسایەکی/چەند یاسایەکی گشتیی هەبێت، بۆ گشت یان زۆربەی زۆری پێکهاتەکانی بخوات/بخۆن، بەواتا پێکهاتەکانی بەو دەستوورە/دەستوورانە یان یاسا/یاسایانە کاربکەن. لێرەدا مەبەستمان لە پێکهاتەکانی ڕێزمان وەك ڕژێمێك، پێکهاتەی ڕستەسازیی و وشەسازیی و دەنگسازیی و واتاو واتالێکدانەوە یە. ڕێزمانی کوردیی کاتێك ئاسان دەبێت، گەر بۆ نموونە گشت دروستەو پێکهاتەکانی سەرکۆتایی بن: چونکە ڕستە سەرکۆتاییە ("نەوزاد سێو دەخوات.) و وشەی لێکدراویش بە هەردوو جۆرەکەیەوە سەرکۆتایین:

(ا) سەری ڕێزمانی: چاوشین´ (کەسێك، کە چاوی شینە)،

(ب) سەری واتایی مارماسیی´ (ماسییەك، کە لە مار دەچێت)؛

ئەو وشەلێکدراوانەی لەم دەستوورە بەدەرن، بە یاسایەکی تر ڕاستکراونەتەوە، کە یاسای سەرووسەگمێنتیی قورسایی خستنەسەرە. بەشێوەیەکی سەرەکیی کۆتایی وشە قورسایی لەسەرە. ئەم یاسا گشتییە، کاتێك دەگۆڕدرێت، کە وشەلێکدراوەکە سەرسەرەتایی بێت؛ لەم بارەدا وشەی یەککەم قورسایی دەخرێتەسەر.

(پ) گەردنبلوور´ ، نیشانەتایبەتییەئاوەڵناوییەکانی سەرە واتاییەکەی /بلوور/، کە [+ساف و سپی] ین، بەرزبوونەتەوە بۆ گرێی سەرەوەی پرۆژەی وشەلێکدراوەکە.

-١٢




بەرامبەر بە وشەی /گەردنبلوور´/ وشەی لێکدراوی سەرسەرەتاییمان هەیە، کە بەبۆچوونی من قورسایییەسەرەکییەکەیشی هەڵگرتووەو بەمە خۆی ڕاستکردووەتەوە؛ چونکە گرێی پڕۆژەکە خەسڵەتە ئاوەڵناوییەکانی سەرەواتاییەکەی بۆ بەرزبوونەتەوە، وەك لە /کەر´پیاو/ دا:

-١٤




لەبەرئەوەی ڕستەو وشەی لێکدراوو واتا لەسەر "ئاستی لۆژیك و واتالێکدانەوە" سەرکۆتایین و لەبەرئەوەی قورسایی سەرەکیی بەشێوەیەکی سەرەکیی دەخرێتە سەر دوا برگەی وشە یان دوا وشەی وشەی لێکدراو، ڕێزمانی کوردیی بەمانە ئاسان بووە. چونکە ڕژێمی فۆنۆلۆژیی کوردیی، بۆ نموونە دروستەو پێکهاتەی برگەکانی، سەرکۆتایی نیین، ڕژێمە فۆنۆلۆژییەکەی بۆ شیکردنەوەی پەسەندکردن و زمانپژاندن و فێربوونی بۆ بێگانە ئاڵۆزترو گرانترە وەك لە ڕژێمەکانی دییکەی ڕێزمانەکەی[٢٢١].

(٢) کاتێك تیۆرییەك لە تیۆرییەکی تر چاکترە، کە ئەو تیۆرییە لەم تۆرییە زۆرتر دیاردەکانی زمانێك ڕوونبکاتەوەو پێشبینیش لە بارەی چۆنییەتی ئەو دیاردانەوە بکات، کە هێشتا دەرنەکەوتوون و نەبوون.

من لەم هەوڵەمدا ڕستەسازیی کوردیی پەسندەکەم.؛ لە شیکردنەوەکانمدا دەستدەکەم بە لێکۆڵینەوەو شییکردنەوەی دروستەکانی ناوەوەی فرێزەکان. بۆ ئەم مەبەستەیش ڕەچاوی

---

[٢٢١] وەرگێڕ

ئەو چەمکانەی سەرەوە دەکەم و دروستەی ناوەوەی وشەلێکدراوەکان دەکەمە کەرەستەی یەککەمی بابەتی لێکۆڵینەوەکانم و لەگەڵ دروستەی ناوەوەی فرێزەکاندا بەراوردیان دەکەم. لە ئەنجامدا دروستەی ناوەوەی هەردووکیان دەخەمەڕوو.

## وشەلێکدراوەکان (ئاوێتەکان)[222]:

وشەلێکدراوەکانی زاری سلێمانیی لە ڕیزبوونی بەشەکانیاندا لەگەڵ شێوەی ڕیزبوونی وشەی ناو ڕستەکان - SOV - گونجاون و هەردووکیان سەرە ڕێزمانیی و واتاییەکانیان لە کۆتاییدایە (سەرکۆتایین[223]). لە دوو ڕەگەزی فەرهەنگیی، لەناو فەرهەنگدا سەربەخۆ تۆمارکراو، دەتوانرێت یاسائاساو[224] ڕێکوپێک "سەرەناوی لێکدراو[225]" و وشەی لێکدراوی

---

[222] لە ڕژێمی مۆرفۆلۆژیی ڕێزمانی کوردییدا وشەی سادەو وشەی ئاوێتە هەیە؛ وشە ئاوێتەکانیش وشەی لێکدراوو وشەی داڕێژراون (بڕوانە: ژن، براژن، هێومرژن، کەڵەژن).

[223] kopffinal

[224] یاسائاسا regelmäßig؛ ڕژێمئاسا systematisch

[225] تیۆرییەکان لەبارەی جۆرەکانی وشەوە (تیۆرییەکانی جۆرو چەشنەکانی وشە) وەك لێرەدا بەکورتیی لێیاندەدوێم، وشەکانیان جیاکردووەتەوە: (۱) پۆل و جۆرەکانی وشە: ئەمانە ئەنجام و بەرهەمی پۆلکردنی وشەکانی زمانێکن، کە بە پێی نیشانەتایبەتیی و مۆرکەکانی فۆڕم و واتان و ئەمانەیش هەشت جۆرن: سەرەناو، کردار، ئاوەڵناو، ناو، مۆرفێمی دیاریخەر (ناسیاریی و نەناسیاریی)، جێناو، پێشناو، ئاوەڵکردار، مۆرفێمی پەیوەندیی.

بەشکردنەکان بە گوێرەی ئەم ڕێسایانەن: (ا) لایەنی مۆرفۆلۆژیی، کە شکاوەو (سەرەناو، ئاوەڵناو، کردار، جێناو) و نەشکاوە (ئاوەڵکردار، مۆرفێمی پەیوەندیی، پێشناو) دەگرێتەوە. (ب) لایەنی سینتاکسییش پەیوەندیی بەم پرسیارەوە هەیە: ئایا وشەکە توانای ئەوەی هەیە وەك هەڵەفەی یان جومگەی ڕستە (Satzglied) یەك لە ڕستەدا بەکاربهێنرێت؟ جیاوازیی نێوان پۆلەکانیش لەم چەشنانەن: ئاوەڵناو دەتوانرێت بگۆڕدرێت، بەڵام ئاوەڵکردار نا؛ ناوو جێناو مۆرفێمی ناسیاریی وەردەگرن، بەڵام ئاوەڵناو وەریناگرێت؛ کردارو پێشناو لە حوکمکردندا دۆخی ڕێزمانیی دەدەن، بەڵام ئامرازی پەیوەندیی دۆخی ڕێزمانیی نادات. (پ) لایەنی سیمانتیکیی: لە ڕووی ناوەرۆك و واتاوە وشە سێ جۆری بنجیی (Grundwort) هەیە: سەرەناو، ئاوەڵناو، کردار؛ ئەمانەیش لەسەر بناغەی ڕەگەزە مۆرفۆلۆژییەکانی سەرەناو، نیشانەو مۆرك، پڕۆسە؛ پێشناو لەگەڵ مۆرفێمی پەیوەندیش لەسەر ڕەگەزی پەیوەندیی جیاکراونەتەوە.

ئاوەڵناو هەڵبگوێزرێت. سەری وشەلێکدراوەکە دەشێت ناوێك، بەتایبەتیی ئاوەڵناوێك یان ئاوەڵناوێکی کراو/کردووو[٢٢٦] یان کردارێکی بە ناو بوو[٢٢٧]، بێت. زۆربەی زۆری وشەکانی زمانی کوردیی لە شێوە فەرهەنگییەکانی ئەم لێکدراوانەیە، کە لە فەرهەنگدا تۆمارکراون و

---

لەتەك کرداردا، سەرەناو یەکێکە لە جۆری وشەسەرەکییەکان (ا) بەپێی لایەنی مۆرفۆلۆژیی سەرەناو بە ڕەگەزی توخم (نێرو مێ) و ڕەگەزی ژمارە (تاك و کۆ) وە بەدۆخی ڕێزمانیی No m inativ, Genetiv, (Dativ, Akkusativ) نیشانەکراوە. ئاوەڵناوی پەسنکەر، وەك کرۆکی فرێزی ناویی، ناو دیارییدەکات.

(ب) بەپێی لایەنی سێمانتیکیی، سەرەناوی بەرجەستە لە سەرەناوی نادیار لەیەك جیادەکرێنەوە: بەرجەستەکان ناوی کەس (ناونان:وەك /مرۆڤ/) و توخمەناو (G a ttungsname ناولێنان: وەك /کتێب/). لەناو ناوەبەرجەستەکاندا "ناوە گەلییەکان" k o llektiv ی وەك /دار، شاخ، هەور/ لە ناولێنانی پارچەو کەرەستەی وەك /خوێن، ئاڵتوون/ لەیەك جیادەکرێنەوە. ناوە نادیارەکان بۆ ناولێنانی مۆرکی وەك /ئازایی/ و کردەی وەك /خەو/ و پەیوەندیی وەك /هاوڕێیەتیی/ و پێوەرو پێوانەی وەك /سات، میل/ ن.

سەرەناو Substantiv دوو وەچەناو یان دوو وەچەپۆلی هەیە: (ا) ناوی توخمگەل (Ga t tungsname)، کە بە ئینگلیزییەکەی appelative noun یان common noun ەو ئەو چشتانەن یان گیاندارو زیندەوەرانەن، کە تاك و تەنها نین، بەڵکو هەر یەکەیان وەك توخمگەلێك لە ڕووەك، یان لە زیندەوەرو گیاندار یان لە چشت هەن (/ژن/ بەتەنها بۆ یەك ژن بەرامبە بە توخمگەلی ژن). (ب) ناوی کەس یان ناوی توخمتاك Individuativa بۆ ناونانی کەسەو بە تاك و تەنهایی هەیە (وەك /بەسێ، سیروان، ئازیز/). ئەم جیاوازییە لە پێشدا لە لۆژیکدا کراوەو پاشانیش زمان وەریگرتووەو بەکاریهێناوە؛ جیاکردنەوەکە بۆیە کراوە، چونکە هەر یەکێك لەو دوو وەچەناوە لە ڕووی مۆرفۆلۆژیی و سینتاکسەوە مۆرکی خۆی هەیە (بۆ نموونە، بە کۆکردن یان بەکارهێنانی ناسیاریی و نەناسیاریی: /ژن/، ژنان، ژنەکە، ژنەکان، ژنێك؛ /نەسرین/ *نەسرینان، *نەسرینەکە، *نەسلرینەکان، *نەسرینێك) (وەرگێڕ).

لە بواری وشە دروستکردنداو سەبارەت بە دروستکردن و هەڵگواستنی ناو، بڕوانە ناوی لێکدراو لەگەڵ کردن بەناو.

تێبینیی: /ناونان/ و /ناولێنان/ دووکرداری جیاوازن (بڕوانە: وا ناومان لێنا بەفرگر. واناومان نایت ئازیین)، بۆیە منیش بۆ دوو مەبەستی جیاواز، بەڵام گونجاو بەکارمهێناون (وەرگێڕ).

[٢٢٦] Partizip, participle

[٢٢٧] nominalisiertes Verb, nomielized verb

چەسپێنراون. من وەهای دادەنێم، کە سەرەکان[228] لە لای چەپەوە بۆ لای ڕاست حوکمدەکەن (ئەگەر بەپیتەکانی ئەلفوبێی عارەبیی بنوسیین، ئەگینا بەپێچەوانەوەیە، ئەگەر پیتەکانی ڕێژمی نووسینی لاتینی بەکاربهێنیین) و کە دۆخی ڕێزمانیی زگماکیی[229] زۆرکەم دێتەدیتن و بەرجەستەدەبێت.

١٥- وشەلێکدراوەکان

(ا) سەرەناو + سەرەناو (سەرەناوی ڕێزمانیی واتایی) ← سەرەناو

<ڕۆژ+ نامە> ← <ڕۆژنامە>

<ساڵ + نامە> ← <ساڵنامە>

<مار + ماسیی> ← <مارماسیی>

سەرەناو (سەرەناوی ڕێزمانیی واتایی) + سەرەناو ← سەرەناو

<سەر + چڵ> ← <سەرچڵ>

<ناو + شان> ← <ناوشان>

(ب) سەرەناو + ئاوەڵناوی کراو ← ئاوەڵناو

<دەنگ + نووساو> ← <دەنگنووساو>

<جەرگ + سووتاو> ← <جەرگسووتاو>

سەرەناو+ ئاوەڵناوی کردوو ← ئاوەڵناو

<کوڕ + مردوو> ← <کوڕمردوو>

<دەست + ڕۆشتوو> ← <دەستڕۆشتوو>

(پ) سەرەناو + کرداری بوو بەناو ← سەرەناو

<نان + کردن> ← <نانکردن>

<نان + خواردن> ← <نانخواردن>

<سەر + بڕین> ← <سەربڕین>

(ت) سەرەناو + ڕەگی کردار ← ناوی کارا (ئاوەڵناو)

<پیاو + گوژ> ← <پیاوکوژ>

---

[228] مەبەستم لە سەر، سەری ڕێزمانییە، کە حوکمکردنی دۆخی ڕێزمانیی هەیە: کردار، ئاوەڵناو، پێشناو لە فەرهەنگی زمانی کوردیدا وەك سەری ڕێزمانیی دیاریکراون (وەرگێڕ).

[229] Inhärenter Kasus

<نان + کەر> ⟵ <نانکەر>
<دەست + بڕ> ⟵ <دەستبڕ>

(ج) سەرەناو + ئاوەڵناو ⟵ ئاوەڵناو
<سەر + زل> ⟵ <سەرزل>
<قژ + زەرد> ⟵ <قژزەرد>
<دەنگ + خۆش> ⟵ <دەنگخۆش>

(ح) فرێزی پێشناویی، کە لە پاش لاوازبوونی ڤاوڵێك[٢٣٠] بووە بە وشەی سەربەخۆی ناو فەرهەنگ (سەرەناو)؛ ئەم جۆرە وشانە داڕێژراون و وەك سەرەناو واتای تایبەتییان هەیە، نەك گشتیی.
{بەرد بۆ پێ} ⟵ <بەردەپێ>
{بەرد بۆ بازدان} ⟵ <بەردەباز>
{بە دەم} ⟵ <بەدەم>
{بە کار} ⟵ <بەکار>
{بە قسە} ⟵ <بەقسە>

مەبەستی سەرەکیم لەم پەیوەندییەدا ئەو وشەلێکدراوانەن، کە سەرکۆتایین و دەتوانم بۆ ڕوونکردنەوەی دروستەی ناوەوەی فرێزەکان بیانهێنمەوە. لام ئاشکرایە، کە چەشنی زۆری وشەی لێکدراوی تریش هەن: یاسای دووپاتکردنەوەی وەك /دەنگەدەنگ/، /گرمەگرم/، /کونکون/، /چینچین/؛ یاسای کورتکردنەوە: PDK; PUK ...

## پێکهاتووی خاوەندارێتیی و پێکهاتووی خستنەپاڵ[٢٣١]:

(ا) مۆرفێمی خاوەندارێتیی /-ی/[٢٤٢]

---

[٢٣٠] Vokal-Abschwächung

[٢٣١] Possessive- und Genetivkonstruktionen

[٢٣٢] بەپێی جیاکردنەوەی جۆرەکانی وشە، پارتیکڵ (واژەگۆکەر) p article پارچۆلکەیەکی یان وشەیەکی "گۆکەر" و پارچۆلکەی دروستکردنی وشە"یان "پڕکەرەوە" یەکە؛ ئەو پارچۆلکانە دەگرێتەوەو پۆلێکیان لێدروستدەکات، کە ناتوانرێن بشکێنرێنەوە، لەمانە: پێشناو، ئەوەی لەلای ئێمە بە مۆرفێمی بەندو بەستنەوە ناسراوە، ئاوەڵکردار ... هتد. مەبەست لە شکاندنەوە یان چەماندنەوەی مۆرفۆلۆژیی دروستکردنی فۆرمە (ا) لە ڕێی شکاندنەوەی ناوەکییەوە، بۆ نموونە: /هات/ بەرامبەر /دێت/، /چوو/

مۆرفێمی خاوەندارێتیی / ی/ پەیوەندییەکی خاوەندارێتیی دەردەبڕێت و دۆخی ڕێزمانی خستنەپاڵ Genetiv لەلای چەپەوە بۆ لای ڕاست بە فرێزێکی ناویی دەدات. کەواتە /ی/ گۆکردنێکی مۆرفۆلۆژیی و ناوەرۆکێکی سێمانتیکیی هەیە. لەبەر ئەمەیە، کە /ی/ هێنانەدیتنی فۆنەیتیکیی خستنەپاڵ نییە. ئەگەر خاوەندارەکە (جێناوەکە) بوو بە جێناوی لکاو[٢٣٣] ،ئەم مۆرفێمە دەربڕینێکی فۆنەیتیکیی نابێت و نابیسترێت. لەهەردوو بارەکەدا، دوو فۆرمەکە ´N ن، وشەنین و هەر یەکەیان واتایەکی [+ تایبەتیی] هەیە. پێکهاتووی خاوەندارێتیی لەم خەسڵەتەیدا لەگەڵ وشەی لێکدراودا یەکدەگرنەوە.

لەبەرئەوەی پێکهاتووی خاوەندارێتیی ´N هو لە ڕستەسازیدایەو وشە نییە و چونکە دروستەی دیارییکەر[٢٣٤] لەناوێك یان جێناوێك لە گەڵ مۆرفێمێکی دیارییکەر[٢٣٥] دروستدەکرێت، دەتوانرێت بەشێکی پێکهاتووەکەیان بە گشتیی بکرێت بە پێکهاتوویەکی دیارییکەر؛ هۆی ئەمەیش ئەوەیە، کە هەردووکیان ناون. لە ڕووی سینتاکسییشەوە، دروستەی دیارییکەر لەپێش پێکهاتووی دیارییکەرەوە هەڵدەگوێزرێت. کەواتە دەشێت دروستەی دیارییکەر لەناو پێکهاتووی خاوەندارێتییدا بێت یان لە دەرەوەیدابێت.

١٦- (ا) دەستی من ´N — (ب) دەستم ´N

کوڕی تۆ — کوڕت

ماڵی ئەوان — ماڵیان

(پ) دەست + ێك ——► دەستێك (ت) دەستێك + ی + من ——► دەستێکی من / دەستێکم

---

بەرامبەر /دەچێت/، /خواردیی/، /دەخوات/ بەرامبەر /بخۆ/؛ (ب) شکاندنەوەی دەرەکیی لەڕێی لاگرێکەوە دەکرێت، بۆ نموونە: /کوڕ/ و /کچ/ بەرامبەر /کوڕان/ و /کچان/. شکاندنەوەو چەماندنەوە بەرامبەر بە مۆرفێمەکانی وشەدروستکردن دانراون، بۆ نموونە: /جوان/ بەرامبەر /جوانیی/ یان /کورد/ بەرامبەر /کوردیی/ یان کردار لە زمانی کوردییدا، کە لە ڕەگ و کات و کەس پێکهاتووە؛ هەر یەکێك لەو سیانە مۆرفێمن و کردار دروستدەکەن. من بەمەبەستی جیاکردنەوەی /ی/ ی خاوەنداریی لە /ی/ خستنەپاڵ یان بۆ دیارییکردنی پێشناوی ناڕاستەقینەی /ە/ واتاو گۆکردنم وەك سەنگی مەحەك خستووەتەکارەکەمەوە، دەنا لام ئاشکرایە، کامانە پارتیکڵن و کامانە پارتیکڵ نین. لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەکانم دەریدەخەن، کە زمانی کوردییش، شکاندنەوەو چەماندنەوەی زۆری تێدایە (وەرگێڕ).

[٢٣٣] klitisieren

[٢٣٤] Det-structure

[٢٣٥] Det-Morphem

(ج) من + يك ——— ◄ منێك    (ح) دەست + ی + منێك ——— ◄ دەستی منێك

لەبەرئەوەی دروستەی دیارییکەر لە ناوێك و مۆرفێمێكی ناسیاریی یان نەناسیاریی دروستبووەو چونكە جێناویش وەك ناو مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێت، چاوەڕێی دروستەی دیارییكەری وەك {منێك} لە زاری سلێمانیدا دەكرێت. ئەو دروستەیەی (١٤ب) دروستەیەكی ئاڵۆزی لەناویەكدا شكاوەیە و لە دروستەی ڕستەی لەناویەكدا شكاوە دەچێت، كە بە كرداری ئاڵۆزو چڕ یان دروستەی مۆرفۆسینتاكس ناسراوە: من تۆم گرت ◄ گرتمیت.

(ب) مۆرفێمی خستنەپاڵ[٢٣٦] /ی/:

وشەی لێكدراو دروستەی "تەواوكەر + سەر" ی هەیە. گشت وشەلێكدراوە سەركۆتاییەكان واتاو لێكدانەوەیەكی[+ تایبەتیی و دیار] یان هەیە (بڕوانە: <سەرزل>، <چاوجوان>، <ناونووس>، <خۆڵڕێژ> ...هتد). ئەگەر مۆرفێمی خستنەپاڵ /ی/ دانرا، پێكهاتووی خستنەپاڵەكە واتاو لێكدانەوەیەكی [+ گشتیی ] وەردەگرێت. گۆكردنەڕێزمانییەكەیشی ئەوەیە، كە دۆخی ڕێزمانیی خستنەپاڵ بە فرێزێكی ناویی دەدات. لەبەرئەوەی ئەم /ی/ یە بە لێكدانەوەی [+ گشتیی] ەوە بەستراوە، خۆی لە مۆرفێمی خاوەندارێتیی /ی/ جیادەكاتەوە. كەواتە دەتوانین بڵێین، كە ئەو مۆرفێمی خستنەپاڵە واژەگۆكەر نییە، بەڵكو مۆرفێمێكی سەربەخۆیەو هێنانەدیتنی فۆنەیتیكی خستنەپاڵە. چونكە، هەر وەك ئاماژەمان بۆ كرد، لەڕێی حوكمكردنی دۆخی ڕێزمانییەوە، لە لای چەپەوە بۆ لای ڕاست دۆخی ڕێزمانیی خستنەپاڵ بە فرێزێكی ناوی دەدات. لەم ڕاڤەكردنەدا ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت، كە دروستەی خستنەپاڵ N´ ە نەك وشە. ئەگەر بتوانین /ی/ خستنەپاڵكە لابەرین، ئەوا بەرهەمەكەی بێگومان سەرەناوێك، بە واتا وشەیەك دەبێت.

١٧- <سەرزل> N بەڵام {سەری زل} N´
<سەرخڕ> {سەری خڕ}
<چاوجوان> {چاوی جوان}
<چاوشین> {چاوی شین}

ئەگەر شوێنی هەڵفە (جومگە) سەرەكییەكانی لێكدراوێكی سەركۆتایی لەگەڵ یەكتریدا بگۆڕینەوە -جێگۆڕكێیان پێبكەین-، ئەوا بەرهەمێكمان چنگدەكەوێت، كە پێكهاتوویەكی سەرسەرەتاییە[٢٣٧] . لەبەرئەوەی دۆخی ڕێزمانی لە زمانی كوردییدا بەتەنها لەلای چەپەوە بۆ

---

[٢٣٦] Partikel

[٢٣٧] kopfinitial

لای ڕاست دەدرێت[238]، پێویستە ئێستاکانێ پێدەرێکی دۆخی ڕێزمانیی خستنەپاڵ[239] بهێنرێتە ئەم نێوانەوە. لەم بارەدا ئەو /ی/ یە دادەنرێت، کە جۆرێك لە پەیوەندیی خاوەنداریێتیی دەردەبڕێت. بەرهەمەکی ناوێکەو واتایەکی گشتیی دەبێت.

١٨- <نانکردن> N بەڵام {کردنی نان}N´
<گرەوبردنەوە> {بردنەوەی گرەو}
<ڕۆژنامە> {نامەی ڕۆژ}

ژمارەیەکی زۆر لە پێکهاتوو هەن، کە ئێمە هیچ وشەیەکی لێکدراومان بۆیان نییە. ئەم پێکهاتووانە بە دەستووری "دروستکردنی ئەنالۆژیی"[240] دروستکراون و هاتوونەتەکایەوە؛ بەواتا لەبەر ئەو پێکهاتووانە دروستکراون، کە هەبوون یان زووتر دروستکراون. N´ ەکان وەك هەمیشە واتای گشتییان هەیەو ناوەکانیش واتای تایبەتیی.

١٩- {پیاوی گرد}N´ کەچی <گردەپیاو>N
{کوژراوی پارە}
{شەوی پێشوو}
{ژنی کورد}
{ژنی باڵابەرز}

ئەم پێکهاتووانە ناتوانرێن یاسائاسا دیارییکەرێك (مۆرفێمێکی ناسیاریی یان نەناسیاریی) بخرێتەتەکیان، چونکە ئەمانە وشە نیین، بەڵکو N´[241] ن و N´ یش بەگشتیی وەك فرێز لە ڕستەسازییدا هەڵدەگوێزرێت نەك لە فەرهەنگدا. هۆی سینتاکسییش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی،

---

[238] لە گشت زمانەکانی جیهانداو، دیارە لە زمانی کوردیشدا، بە تەنها پێشناو لەلای ڕاستەوە بۆ لای چەپ دۆخی ڕێزمانیی بە فرێزی ناویی دەدات.

[239] Genetivzuweiser

[240] analogical building

[241] سەرە ڕێزمانییەکان حوکمدەکەن و دۆخی ڕێزمانیی دەدەن و فرێز هەڵدەگوێزن؛ مۆرفێمی ناسیاریی و نەناسیاریش، وەك بۆ نموونە /ی/ خستنەپاڵ، هەمان ئەرك و ڕۆڵیان هەیە: /پیاو/ بەرامبەر بە {پیاوێك} یان {پیاوی ناودار} بەرامبەر {پیاوێکی ناودار} بەڵام *{پیاوی ناودارێك} بە هەمان واتاوە.

کە دروستەی دیارییکەر دەبێت لە پێش پێکهاتووی خستنەپاڵەوە هەڵبگوێزرێت. کەواتە دروستەی دیارییکەر لەناو پێکهاتووی خستنەپاڵدایە[٢٤٢].

٢٠- (ا) یەك پیاو ⟵ پیاوێك *پیاوی گردێك
(ب) پیاوێك + ی + گرد ⟵ پیاوێکی گرد *پیاوی گردەکە
*پیاویگردەکان
(پ) شارگرتن + ێك ⟵ شارگرتنێك ؛ گرتنی شار ⟵ گرتنێکی شار / گرتنی شارێك

ئەم مەرجە سینتاکسییە بۆیە نموونەکانی (١٤) ناگرێتەوە، چونکە هەردووبەشەکەی ئەو چەشنە دروستانە ناون و دروستەی دیارییکەریش دەشێت لەناوەوەو لە دەرەوەی دروستەی لەم چەشنە پێکهاتووەی خستنەپاڵەدا هەبن (بڕوانە (٢٠(پ)). ژمارەیەکی زۆریش لە وشەی لێکدراو هەن، ئێمە هیچ پێکهاتوویەکمان بەرامبەریان نییە.

## ٢/١-٣-٢) پێکهاتووەکانی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ناڕاستەوخۆ

## ٢/١-٣-٢-١) پێشناوەکان و پێکهاتووەکانی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ناڕاستەوخۆ

پێشناوی ڕاستەقینە یان ڕەسەن: ئەو پێشناوانەن، کە سەربەخۆ لەناو فەرهەنگدا تۆمارکراون و نووسراونەتەوەو وەك خۆیان دەهەێنرێنە ناو ئاستی بنەڕەت و قوڵی ڕستەوە.

٢١- <بە>، <بۆ>، < لە> ... هتد.
(ا) ئێمە وەها بۆ کێشەکە دەچین.
(ب) ئازیز بەپێ دەچێت بۆ بازاڕ.
(پ) بایز لە شارە.

پێشناوی درۆیینە یان ناڕەسەن: ئەو پێشناوانەن، کە خۆیان سەربەخۆ لەناو فەرهەنگدا تۆمارنەکراون و نەنووسرانەتەوە، بەڵکو وەك بەشێکی بنجیی کردار بە فۆرمێکی فۆنۆلۆژیی و فەرهەنگییەوە لەفەرهەنگد تۆمارکراون. کاتێك ئەم کردارانە لەو ڕستانەدا دادەنرێن، کە فرێزو

---

٢٤٢ Genetivkonstruktion

وشـەکانیان کەرەسـتەی فەرهـەنگیی تـەواون[٢٤٣]، فۆرمـی فۆنۆلۆژییـان دەگۆردرێـت. ئـەم رسـتانەیش دەتوانرێـن دیسـانەوە، هـەر وەك خۆیـان لەبنـەڕەتدا چـۆن بـوون، وەهایـان لێبکرێتـەوە؛ بـە دروسـتەی ئـەم جـۆرە رسـتانە دەگوترێـت دروسـتەی مۆرفۆسینتاکسـیی[٢٤٤].
کردار وەك سەری رێزمانیی رستە لەرێی ئەو پێشناوە نارەسەنانەوەی، کە لە رستەدا بوونەتە پێشناوی رەسەن، حوکمی دۆخی رێزمانیی تەواوکەرەکانیان دەکەن و دۆخی رێزمانی بەو فرێزە ناویانە دەبەخشن. بەم پێیە دەتوانم لە شێوەی گریمانەیەکدا بڵێم: پێشناوی نارەسەن ناتوانێت دۆخی رێزمانیی بدات، بۆیە دەبێت لە ئاستی رووکەشی رستەدا فۆرمی فۆنۆلۆژیی پێشناوی رەسەنی پێبدرێت. ئەم شیکردنەوەیە ئەوە دەردەخات، کە جێناوی لکاوی بەرکار دەتوانێت لە رێی هاونیشانەکردنیەوە لەگەڵ شوێنپێکەیدا، کە جێی هێشتووەو شوێنی بنەڕەتیی خۆیەتی، دۆخی رێزمانیی وەربگرێت.

٢٢- <پێگوتن>، <لێدان>، <بۆناردن>، <ناولێنان>، <تێگرتن>، <تێکەوتن> ...هتد (بەراوردیی بکە لەگەڵ ئەو کردارانەی وەك <بەرکەوتن> ن)[٢٤٥].

من بە تۆم گوت، ... ← من پێمگوتیت، ...
من لە تۆم دا. ← من لێمدایت.
من ناوم لەو نا، ... ← من ناوم لێنا، ...
من تۆپەکەم گرتە تۆ ← من تێمگرتیت
تۆپەکە کەوتە حەوزەکەوە ← تێیکەوت

## ٢-٢-٣-١/٢ (واژە گۆکەر[٢٤٦]) ی دۆخی رێزمانیی پێشناو /ە/

[٢٤٣] volle lexikalische Einheiten

[٢٤٤] morohosyntaktische Strukturen

[٢٤٥] ئەم فرێزە پێشناوییانە {لە تۆ، بە تۆ ... هتد} بەرامبەر بە دۆخی رێزمانیی پێشناویی و دۆخی رێزمانیی خستنەپاڵ بەرکارە (ناڕاستەوخۆکانی) زمانە ئەورووپییەکانی وەك ئەڵمانیی و ئینگلیزیی: I give him a book. ; Ich gab ihn ein Buch. بەرامبەر بە: من پەرتووکێم بە ئەو دا. ئەو کردارە ناڕاستەوخۆیانەو ئەو فرێزە پێشناوییەی زمانی کوردیی لەو بەرکارانەن/ تەواوکەرانەن، کە کردار داوایاندەکات و سەرپشکیی نین (وەرگێڕ).

(ا) کاتێك پێشناوی ناڕەسەنی کردارێك لە ڕستەدا دەخرێتە پشت کردارەکەوە، دەبێت بە واژەگۆکەرێك و حوکمی دۆخی ڕێزمانیی کردارەکە جێبەجێدەکات. ئەمان وەك پێشناو لەلای ڕاستەوە بۆلای چەپ حوکمی ڕێزمانیی دەکەن (بڕوانە پەراوێزی (٦٥)).

٢٣- <تێکەوتن>، <تێخستن>، <تێگرتن>، <تێکردن> ...هتد.
ساکار کەوتە حەوزەکەوە.
ساکار خومەکەی کردە (ناو) ئاوەکەوە.
ساکار شووتییەکەی خستە (ناو) کانییەکەوە.[٢٤٧]
ساکار تۆپەڵەبەفرەکەی گرتە من.

(ب) زۆر جار پێشناوی /بۆ/ لە ڕستەدا وەك واژەگۆکەری /ە/ دەردەبڕرێت.

٢٤- ئارام چووە بۆ قوتابخانە. ⟵ ئارام چۆتە قوتابخانە.

(پ) ئەو گۆڕانکارییەی لە (ب) دا جێبەجێکراوە، لە هەندێك فرێزی تریشدا بەجێهێنراوەو بەرهەمەکەی لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا بووە بە فۆرمێکی سەربەخۆی ناو فەرهەنگ و وەك وشەیەکی سەربەخۆ مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت[٢٤٨]. ئەم بەرهەمانە وشەن و واتای تایبەتییان هەیەو هەڵسوکەوتی وشە نیشاندەدەن. کورد دەڵێت /بەردەپێ/ و {بەردەپێیەك} نەك *{بەردێك پێ} یان {بەردەپێیەکی تەخت} نەك *{بەردێك پێی تەخت} (بڕوانە (٢٨). ئەوەی گرنگ بێت، ئەوەیە کە پێشناوی /بۆ/ و ئەو /ە/ یانە واتای /ئاڕاستە/ و خستنە /ناو/ یان هەیەو لە وشەی تری وەك /دەستەسڕ/ و /دەستەمۆ/ ... هتد دا دەبینرێنەوە، دەگرێتەوە.

---

[٢٤٦] Partikel

[٢٤٧] چۆن پێشناوی ئاوێتەی /لەناو/ لەتەك پێدانی دۆخی ڕێزمانیی پێشناوییدا ڕۆڵی ئاوەڵکرداری ئاڕاستەکردن بۆ ناو شوێنێکی قووڵ یان داخراو دەبەخشن و چۆن هەر یەکێك لە هەردوو بەشی پێشناوە ئاوێتەکە، /لە/ ەکە، هەم دۆخی ڕێزمانی دەدات هەم و ڕۆڵەکەیش دەبەخشێت و لەم ڕێیەوە بەتەنهایش بەکاردەهێنرێت، بڕوانە: ژنەکە لەناو ماڵەکەدایە ~ ژنەکە لە ماڵەکەدایە ~ * ژنەکە ناو ماڵەکەدایە؛ پێشناوە ڕاستەقینەکەیش هەمان دابەشبوون و بەکارهێنانی هەیە، بڕوانە: چووەتە ناو ژوورەکەوە ~ چووەتە ژوورەکەوە ~ *چوو ناو ژوورەکەوە (وەرگێڕ).

[٢٤٨] Lexikalisierungsprozeß

له (٢٦) دا /چ/ ڕەگی کردارەکەیەو /وو/ مۆرفێمی کاتی ڕابوردووەو /ە/ مۆرفێمی کرداری ڕانەبوردووە؛ لەم کردارەدا ڕابوردوو بەستراوەتەوە بە ئێستاوە. دوودەنگیی[٢٤٩] وە بووە بە تاکەدەنگیی[٢٥٠] /ۆ/ و مۆرفێمی کرداری ڕابوردووی /ت/ خراوەتەوە تەکی و مۆرفێمی کرداری ڕانەبوردووەکەی /ە/ وەك خۆی ماوەتەوە؛ لەبەرئەوەی /چووە/ یان /چۆتە/ کرداری تێنەپەڕەو ناتوانێت حوکمی دۆخی ڕێزمانیی بەرکارێك بکات، واژەگۆکەری /ە/ خراوەتە سەر هەردوو کرارەکەی /چووەە/ و /چۆتەە/. ڕێسای VV* یەکێك لەو دوو کورتەڤاوڵەی[٢٥١] فرێداوە: /چووە/ وە /چۆتە/. ئێستا دەگوترێت: چووە قوتابخانە/چۆتە قوتابخانە. بەم پێیەو بەبوونی ئەم هەلومەرجانە توانراوە پێشناوی /بۆ/ فڕێبدرێت (وەرگێڕ).

| | |
|---|---|
| ٢٥-<بەردەپێ> | بەرد بۆ پێ |
| <دەستەسڕ> | بۆ سڕینی دەست |
| <بەردەباز> | بەرد بۆ بازدان |

(ت) ئەگەر هەڵەفەسەرەکییەکانی ئەو پێکهاتووانەی خستنەپاڵ، کە لەسەرەناوێك +ی + ئاوەڵناوێك پێکدێن، شوێنەکانیان گۆڕییەوە، بەرهەمێکی سەرکۆتاییمان دەستدەکەوێت. ئەم بەرهەمە پێکهاتوویەکی پێشناویی دەبێت، کە لە ئاوەڵناوێك + ە + سەرەناوێك دروستبووە. بەم یاسایە سەرەناوێکی داڕێژراو (وشەیەك) لە ´N یێکی خستنەپاڵەوە هەڵدەگوێزرێت؛ یەکەیەك بەواتای تایبەتییەوە لە ´N یێك بە واتایەکی گشتییەوە دێتەبەرهەم.

| | | |
|---|---|---|
| ٢٦- {ژنی شۆخ} | ⟵ | <شۆخەژن> |
| {پیاوی پیر} | ⟵ | <پیرەپیاو> یان <پیرکەپیاو> |
| {مێردی پیر} | ⟵ | <پیرەمێرد> |
| {بەردی خڕ} | ⟵ | <خڕکەبەرد> |
| {گیای سەوز} | ⟵ | <سەوزە گیا> |

پێکهاتووی پێشناویی واتەیەکی تایبەتیی هەیە. ئەو /ە/ یە، بەشێوەیەکی سەرەکیی، شێوەیەکی لاوازکراوی ئەو پێشناوە نارەسەنەیە، کە لەسەر ئاستی SS دانراوە. پێدان و بەخشینی دۆخی ڕێزمانیی پێشناویی (بەدیهێنانی مۆرفۆفۆنۆلۆژییە، وەك بەدیهێنانی فۆنەیتیکیی دۆخەکەی)، بە پێچەوانەی خستنەپاڵەوە، لەلای ڕاستەوە بۆ لای چەپ دەبێت؛

---

[٢٤٩] Diphthong

[٢٥٠] Monophthong

[٢٥١] ئەو کورتە ڤاوڵە لە زانستی زماندا بە "ڤاوڵەساردەکە" coald vowel [ I ] ناسراوە.

لەلای ڕاستەوە بۆ لای چەپ دۆخی ڕێزمانیی پێشناویی دەبەخشرێت. بۆ نموونەکانی سەرەوە، نموونەی تر دەدۆزمەوە، کە لە ڕێی پرۆسەی ئەنالۆژییەوە[252] دروستکراون.

٢٧-<سەرەڕۆ>، <سەرەتاتکێ>، <سەرەتا>، <خۆڵەمێش>، <خاکەناز> ... هتد.

(ج) فرێزێکی یان ´N یێکی ناویی، مەبەستمان سەرەناوێك و مۆرفێمێکی ناسیاریی یان نە ناسیاریی (Ar tikel+N) یە، دۆخی ڕێزمانیی نادات (پێدەری دۆخی ڕێزمانیی نییە). لە پێکهاتوویەکی NP+ N دا ئەو / ە/ یە بۆیە دادەنرێت، بۆ ئەوەی دۆخی ڕێزمانیی بە فرێزەناوییەکە ´N بدات. چونکە ئەو فرێزەناوییە سەرچاوەیەکی تری نییە، دۆخێکی ڕێزمانیی گونجاوی لێوە وەربگرێت.

٢٨-{پیاو ە ئازاکە}، {کوڕ ە کوردەکە}، {کیژ ە جوانەکە}

هەتا ئێستا ئەوەمان لە لا ئاشکرابووە: کە واژەگۆکەری /ە/ لە دروستەی وشەدا <پیرەمێرد> و لە دروستەی {کوڕە کوردەکە} دا هەیەو هەمان گۆکردنی هەیە. بە پێی تیۆرییەکەی چۆمسکی دۆخی ڕێزمانیی بە فرێزی ناویی دەدرێت؛ واژەگۆکەری /ە/ لەو دوو وشەیەی سەرەوەدا دۆخی ڕێزمانیی بە <مێرد> یش و بە {کوردەکە} یش دەدات. کەواتە ئەو /ە/ یە لە حاڵەتی یەککەمدا بۆ هەڵگواستنی وشەیەو لە حاڵەتی دووهەمدا یاریدەدەری هەڵگواستنی فرێزە. ڕوونکردنەوەکان دەردییدەخەن، کە پێشناوی /ە/ چالاکانە لە فەرهەنگ و لە ڕستەسازییدا گۆکردنی مۆرفۆلۆژیی و سینتاکسیی دەبینێت.

دروستەی دیارییکەر پێش فرێزی پێشناویی هەڵدەگوێزرێت؛ دروستی دیارییکەر لەناو فرێزی پێشناوییدایە. پێکهاتوویەکی پێشناویی وەك {پیاوەئازاکە} لە پیاو + ئازاکە دروستکراوە. فرێزی پێشناویی جیاوازیی لەگەڵ پێکهاتوویەکی خستنەپاڵی وەك {پیاوێکی ئازا} دا هەیە. چونکە پێکهاتوویەکی پێشناویی لە کۆتاییەکەیدا مۆرفێمی ناسیاریی یان نەناسیاریی وەرگرتووە. بەپێچەوانەوە بەتەنها پارچەسەرەناوییەکەی پێکهاتوویەکی خستنەپاڵ مۆرفێمێکی ناسیاریی یان نە ناسیاریی وەردەگرێت.

٢٩- <گردەپیاو> ← {گردەپیاوێك} ← *{گردێك پیاو}
<پیاوی ئازا> ← {پیاوە ئازاکە} ← *{پیاوەکە ئازا}

---

[252] analogische Prozesse

ئێستایش دەتوانرێت، ئەو دروستانەی خوارەوە بۆ پێکهاتووەکانی سەرەوە دابنرێن (بخرێتە پاڵیان)، ئەگەر من بۆ ئەو دروستەیە یاسای (٣٠) پەسەند بکەم.

30- a) X′ ⟶ X′
b) X′ ⟶ X

لەبەرئەوەی واژەگۆکەری /ە/ و /ی/ ی خاوەندارێتیی و /ی/ خستنەپاڵ گۆکردن و واتیان جیاوازە لە مۆرفێمەکانی ناسیاریی و نەناسیاریی و لەبەرئەوەی ئەمانەی دواییان سەری ڕێزمانیین و پرۆژە سازدەدەن، ئەوانەی سەرەتا وەک Det و ئەوانەی دوایی وەک DET دەنووسم.

٣١- چەند نموونەیەک بۆ پێکهاتووی داخراو: <گردەپیاو>، {پیاوی گرد}






(ب) چەند نموونەیەك بۆ پێكهاتووی كراوەی كوردیی:<گردەپیاو>، {پیاوی گرد}، {یەك پیاوی گرد}، {پیاوێكی گرد}.

33-



لەزاری سلێمانییدا دەتوانرێت مۆرفێمێکی نەناسیاریی /یەك/ بە پێشەوەی پێکهاتووەکەدا هەڵبواسرێت.

34-




35-




مۆرفێمی خستنەپاڵ /ی/ لەرێی یاسایەکی مۆرفۆلۆژییەوە لەسەر ئاستی SS دادەنرێت. ئەم یاسایەو بەپەیوەندیی لەگەڵ یاساکانی (٣٠) رێدەدەن، کە پێکهاتووی خستنەپاڵ و N′ ەکان لە شێوەی زنجیرەی دروستەی دووپاتبووەدا هەبن.

بزانە: براکە = N′

36-




٣٧- دەستی براکەی نەوزادی ئامۆزاکەی من




٣٨- یەك دەستی براکەی نەوزادی ئامۆزای من




نەخشەو شێوە ئەندازیارییەکەی لە (٣١) دا خراوەتەڕوو، شوێنێکی Spec ی تێدانییە. لەبەرئەمەیە پێویست ناکات ئاستی N´´ یان X´´ هەبێت. ئەمەیش بۆیە ڕێپێدەدرێت، چونکە دەشێت Spec لە گەورەترین پڕۆژەدا نەبێت.

39- a) [N´´ [N´ [N pictures of John]]]

b) [ [N´ [N pictures of John]]]

پێکهاتووی وەك ئەمانەی لای خوارەوەیان لەگەڵدا بەراوردبکە!

40- a) Mary´s picture of John

b)the pictures of John

ئەو ڕاستییە دەستکەوتوانە ئەوە دەبەخشن، کە (ا) ئامادەنەبوونی شوێنی Spec هیچ لادانێکی نەزەریی یان لادانێکی دروستەیی نییەو (ب) کە ئاستی ´´X کاتێك پێویستدەکات ببێت، کە سەرێکی گۆکەر F-K هەبێت. ئەمەیش دیسان ئەوە دەبەخشێت، کە شوێنی Spec لە نەخشەو شێوە ئەندازیارییەکەدا هەیە -Drachman یش ئاماژەی بۆ ئەمەکردووە- و کە ئەم شوێنی Spec ە هەمووکاتێك بەکار ناهێنرێت. نەخشەو شێوە ئەندازیارییەکانی (۲۷ب) و (۳۱) بۆ ئەمە باشترین نموونەن. ئەو ´´N ەی لە پێش دواترین ´N دا هاتووە، دەتوانرێت دروستەیەکی لەناویەکشکاوەدا[۲۵۳] وەربگرێت؛ ئەمەیش بەوە دەکرێت، کە ئەو جێناوە "من" بۆ جێناوێکی لکاو[۲۵٤] بگۆڕدرێت؛ پاش ئەوەی مۆرفێمە خستنەپاڵەکەی /ی/ دەقرتێنرێت و فڕێدەدرێت[۲۵۵]، ئەو کەرەستەسەرەتاییەی سەر نییە، بە سەرەفەرهەنگییەکەوە گرێدەدرێت[۲۵٦]؛ لەڕێی ئەمەوە ئەو کەرەستەسەرەتاییە شێوەی جێناوێکی خاوەندارێتیی[۲۵۷] گونجاو وەردەگرێت؛ ڕەنگە جێناوی خاوەندارێتیی زاری سلێمانیی لەم ڕێیەوە دروستبووبێت و هاتبێتەکایەوە.

٤١- (ا) [´N [N برا کە ی] [´N من]

(ب) [´N [N برا کەم] [´N [t]]

هەڵبژاردنی یەکێك لەهەردوو نەخشەکە (۳۱(ا) یان (۳۱(ب)) لەتەك تاقیکردنەوەیەکی شیکەرەوانەی زۆردا پێویستیی بە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە هەیە:

### ۲/۱-۳-۲) ئایا فرێزەناوییەکانی (NP) زمانی کوردیی ´N ن؟

(ا) فرێزەناوییەکانی زمانی کوردیی ئاکاری پرۆژەکراوەکانیان هەیە؛ ئەو پرۆژانەی دەتوانرێن بەبێ سنووربۆدانان درێژ بکرێنەوە. لە نموونەکانی (۳۳-۳۵) دا کەرەستەسەرەتاییەکانی "ێك، لاو" و "ەکە، بەجەرگ" و "یەك، ماڵ" پرۆژەی N داناخەن.

---

[۲۵۳] inkorporierte Struktur

[۲۵٤] Klitikform; klitisieren

[۲۵۵] Synkope; synkopiert

[۲۵٦] wird gekoppelt

[۲۵۷] Possessivpronomen

٤٢- کوڕەکە
کوڕەبەجەرگەکە
کوڕەبەجەرگەکەی ئارام

٤٣- یەك ماڵ
تاکە یەك ماڵ
تاکە یەك ماڵی بچووك

(ب) جێناوی درۆیینە[٢٥٨]ی وەك <ئەوەی> و <ئەوانەی> فرێزی ناویی داخراو نیین. لەگەڵ ئەمەیشدا دەتوانرێن وەك بکەر یان وەك وەچەپێکهاتەی گۆڕدراو یان وەك وەچەپێکهاتەی لەڕووی سیمانتیکییەوە گۆڕدراون، بەدەرکەون.

٤٤- ئەوەی، کە تۆ t دە ی ناسیت، برامە.
S S´´ N´´

٤٥- ئەوانەی، کە (pro) تۆیان بینیی، مامۆستان.
S S´ N´

بەپێی ئەو تیۆرییەی فوکوی/سپیس، کە من لێرەدا وەرمگرتووەو پەنایدەبەمەبەر، پرۆژەداخراوەکان کەرەستەی Spec یان هەیە. لەبەرئەوەی فرێزەناوییەکانی زمانی کوردیی پرۆژەی داخراونیین و لەبەرئەوەی جێناوە درۆیینەکان وەك فرێزی ناویی بەدەردەکەون، بۆم هەیە، ئەو فرێزە ناوییانە NP وەك ´´N شیبکەمەوە. ئەم دەربڕینەم ئەنجامێکدانەوەیەکی ڕوون و ئاشکرانییە. چونکە ئەو دەربڕینەم نە هەبوونی شوێنی Spec و نە نەبوونی بۆ پرۆژەی فرێزەناوییەکان لە زاری سلێمانیدا داوادەکات.

---

[٢٥٨] Proform ئەو کەرەستە سەرەتاییانەی زمانن، کە بەشێوەیەکی سەرەکیی بە سەرەناوەوە بەستراون و لەبری ئەوان بەکاردەهێنرێن: ئەگەر بەسترابوون بەو سەرەناوانەوە، کە لە پێشیانەوە هاتوون، ئەوا پێیان دەگوترێت ئەنافەر، ئەگەر سەرەناوەکان لە دوای ئەمانەوە هاتن، ئەوا ناوی کەتافەریان لێدەنرێت (وەرگێڕ).

(پ) ئەگەر بە وردیی بڕوانیینە دروستەی ناوەوەی فرێزەناوییەکانی زمانی کوردیی و لێیانوردببینیینەوە، بۆمان دەردەکەوێت، کە ئەم فرێزەناوییانە هیچ شوێنێکیان بۆ Sp ec نییە. مۆرفێمی ناسیاریی و نەناسیاریی دەبن بە سەری فرێزی ناویی و وەك چۆن کردار دواشوێنی گرتووەو سەرکۆتاییە، ئەمیش قرەییە[259] و سەرکۆتاییە. لە کاتێکدا (٤٦) سەرپشکییە[260]، (٤٧) بەزۆرو خورتەکییە[261].

٤٦- یەك پیاو ———◄ پیاوێك

٤٧- *ەکە پیاو———◄ پیاوەکە

ئەو پێکهاتووانەی نەخشەی ئەندازیاریی بەپلەو پایە "دروستەی بە پلەوپایەدار"[262] یان هەیە، وەك citysitie`s destruction، لە زمانی کوردییدا وشەی لێکدراون (بڕوانە (٤٨)). ئەو وشەلێکدراوانەی نەخشەیەکی یەکگرتووی سێمانتیکییان هەیە، بەم واتاو ناوەڕۆکەوە، دروستەیەکی ناوەکییان نییە.

٤٨- شارتێکدان
N

بەم زووانە بۆمان دەردەکەوێت، کە زاری سلێمانیی ڕێدەدات وەك زمانێکی سەرکۆتایی[263] شییبکرێتەوە. زمانەوان دەتوانێت وەهای دابنێت، کە سەرە فەرهەنگیی "تێکدان" دۆخی ڕێزمانیی زگماکیی دەبەخشێت و کە لە وشەیەکی لێکدراوی سەرکۆتاییداردا بە فۆنەیتیکی ناهێنرێتە دیتن. بە گوێرەی ئەم گریمانەیە، سەرە فەرهەنگییەکانی ئەو وشەلێکدراوانەی بوونوتە وشەی سەربەخۆی ناو فەرهەنگ[264] لەو ڕێگەیەوە ڕێی دەستووریی بەبوونیان دراوە، کە ئەو وشانە دۆخی ڕێزمانیی زگماکییان هەیە. لە ئەنجامی ئەمەدایە، کە تەواوکەری "شار"

---

[259] Postpositional

[260] obtional

[261] obligatorisch

[262] hierarchische Struktur

[263] Kopfletzt-Sprache

[264] lexikalisierte Komposita

له (٤٨) دا لەگەڵ تەواوكەرەكانی وشەی لێكدراوی لـەم چەشـنەدا، پێویسـتیان بـە ڕێپێدانـی دەستووریی نییە. چونكە وەك ڕەگەزی ناو، دروستەیەكی پلەوپایەداریان (بەپلە) نییە.

چۆن دەتوانرێت بەبەڵگە بسەلمێنرێت، كە ئەم سـەرە فەرهەنگییانـە دۆخـی ڕێزمـانی زگمـاكی دەبەخشن؟

بەرجەسـتەبوون و بەدیـهێنانی فۆنەیتیكیی دۆخی ڕێزمـانیی زگمـاكیی[٢٦٥] (بڕوانـە ٣١(ب)) و بەستنەوەی ئەم بەدیهێنانـەی دۆخـی ڕێزمانییـە بەتەنـها بـەو سـەرە فەرهەنگییانـەوە، كـە نـە "دۆخی ڕێزمانیی دروسـتەییان "[٢٦٦] هەیـەو نـە "دۆخـی ڕێزمـانی كرداوریسـت"[٢٦٧]، بەڵگـەی ئـەزەریی و ئـەزموونیی بابەتانـەن بـۆ ئـەوەی، كـە بەتەنـها دۆخـی ڕێزمـانیی زگمـاك بەرجەستەدەبێت و دیتەدیتن. هێنانەدیتنی دۆخی ڕێزمانیی خستنەپاڵی زگماكیی "تێكدان" لە دروستەی پلەوپایەداری لەم چەشنانەی لای خوارەوەدا بەدیدەكرێت و دەدۆزرێتەوە.




گۆاستنەوەی بەزۆرو خورتـەكیی N "تێكدان" بۆ ئەو "شـوێنی هەڵواسـین و لكاندن"[٢٦٨] ەی (N`1 )، دەبێتـەهۆی هێنانـەدیتنی فۆنـەیتیكیی دۆخـی ڕێزمـانیی زگمـاكیی. لـەم شـێوە

---

[٢٦٥] phonetische Realisierung des inhärenten Kasus

[٢٦٦] struktureller Kasus

[٢٦٧] Kasus obliquer (Casus obliquus): ناوێكـە بـۆ ئـەو دۆخانـەی وابەسـتەی كـردارن، وەك دۆخـی ڕێزمـانیی خسـتنەپاڵ، دۆخـی ڕێزمـانیی بـەركاری ناڕاسـتەوخۆ، دۆخـی ڕێزمـانیی بـەركاری ڕاسـتەوخۆ، لۆكاتیڤ، ئەبلاتیڤ؛ جیاواز لەمە Casus Rectus ە، كە دۆخی ڕێزمانیی بكەریی دەگرێتەوە.

[٢٦٨] Adjuktionsstelle

ئەندازیارییە بە پلەیەدا[269] هیچ "دۆخنێواندژییەك[270]" (قەیرانی دۆخ)[271] نایەتەکایەوە. چونکە دیارییکەر (مۆرفێمی ناسیاریی و نەناسیاریی) لە ڕژێمەکەی فوکوی/سپیسدا لەو ڕەگەزانە نین، کە دۆخی ڕێزمانیی دەبەخشن.

بەڵگەکان:

(ا) دروستەی لەم چەشنە لە زاری سلێمانیدا ڕێپانپێنادرێت، چونکە سەرەفەرهەنگییەکانیان دۆخی ڕێزمانیی زگماکییان نییە، تاوەکو بەرجەستەبکرێن و بهێنرێنەدیتن.

٥٠- (ا) * بازدان ی بەرد (ب) * پێ ی بەرد

ئەمانە لەگەڵ ئەو وشە لێکدراوانەی لای خوارەوەدابەراورد بکە، کە بوونەتە وشەی سەربەخۆی ناو فەرهەنگ و ئەو /a/ یەشیان تێدایە !

٥١- (ا) بەردەباز (ب) بەردەپێ

ڕەگەزە فەرهەنگییەکانی "بازدان" و "پێ" لەبنەڕەتدا دۆخی ڕێزمانیی کرداروییستیان هەیە. لەبەرئەوەی بەتەنها دۆخی ڕێزمانیی زگماکیی بەرجەستەدەبێت، هێنانەدیتنی دۆخی ڕێزمانیی لە (٥٠) دا نەبوونەکراوە. بۆ ئەمەیش (٥١) بەڵگەیەکی ئاشکرایە.

52- „enemy`s destruction of the city“

٥٣- (ا)* دوژمن ی تێکدان ی شار (بە واتای تێکدانی شار (لەلایەن) بەدەستی دوژمن)
(ب) تێکدان ی شار لەلایەن دوژمنەوە
(پ) * دوژمن ی شارتێکدان (بە واتای تێکدانی شار لەلایەن (بەدەستی) دوژمن)
(ت) شارتێکدان لەلایەن دوژمنەوە

نموونەکانی (٢٨) دەریدەخەن، کە فرێزە ناوییەکان لە شێوەی دروستەی دووپاتبووەدا وەك زنجیرە ڕوودەدەن و دەردەکەون؛ نەبوونی دروستەی لەچەشنی (٥٣(ا)) و (٥٣(ب))

---

[269] Konfiguration

[270] Kasuskonflikt

[271] Chomsky (1985)

ناتوانرێت بەو راستییەوە ببەسترێت. چونکە بۆ وەچە پێکهاتەیەکی جولێنراو شوێنێکی Spec و بە خشکەییش بۆ چەند وەچە پێکهاتەیەکی جولێنراو چەند شوێنێکی Spec مان پێویست دەبێت.

٥٤- (ا) دوژمن ی تێکدان ی شار




٥٥- (ب) * دوژمن ی تێکدان ی شار



شوێنی ڕەگەزی N`4 "دوژمنی" دۆخێکی ڕێزمانیی وەرناگرێت. لەبەر ئەمەیە گشت پێکهاتووەکە ڕێپێنادرێت و دەشێت و دەیشکرێت فرێزێکی پێشناویی PP بۆ ئەوشوێنە ببرێت.

کورتەی شییکردنەوەو لێدوانەکەم ئەوەیە، کە دوو هەلەمەرجی دروستکردنی وشەی لێکدراو دەرکەوتوون و چەسپێنراون:

(ا) بۆزیادکردنی /W/ یەك، وەك لە <گردەپیاو> داو

(ب) دۆخی ڕێزمانیی زگماگ، وەك لە <نانکردن> دا.

دروستەیەکی پلەوپایەدار خراوەتەپاڵ وشەلێکدراوەکانی لە چەشنی (ا) ن؛ بۆ وشەلێکدراوەکانی لەچەشنی (ب) ن، دروستەی پلەوپایەدار دانەنراوە. بەڵام هەر یەك لەو دوو چەشنەی وشەلێکدراوەکان نەخشەیەکی واتایی یەکگرتووی هەیە. چەشنی دووهەمی وشەلێکدراوەکان، وەك <سەرخڕ>، <دەستبڕ>، سەرکۆتاییە و چەشنی یەککەمیان، وەك <کەڵەپیاو>، <شۆخەژن>، سەرسەرەتاییە[272].

ئەو پێکهاتووانەی لەم وشەلێکدراوانە هەڵگوێزراون، وەك {کردنی نان}؟؟ و {بڕەری دەست}؟؟ وە {سەری خڕ} بوونی ئەو شوێنەی Spec ناسەلمێنن، کە دۆخی ڕێزمانیی زگماگیی تێدا دێتەدیتن. ئەم فرێزە ناوییانە سەری گۆکەر FK یان نییە. لەبەرئەمەیە ئەو NP یانە نە شوێنی Spec ی بەزۆرو خورتەکییان هەیەو نە پرۆژەی داخراویان هەیە. لەبەر ئەمەیە ڕێ بە گواستنەوەی وشەی پرسیار[273] نادەن، بەڵام ڕێ بە دووپاتبوونەوە دەدەن.

٥٦- (ا) تێکدانی شار

(ب) بەخراپیی تێکدانی شار

(پ) تێکدانی شار بەخراپیی

کەواتە "ناو" دۆخی ڕێزمانیی دروستەیی نیشاننادات. بەخشینی دۆخی ڕێزمانیی دروستەیی و بەخشینی مۆرفۆلۆژیی دۆخی ڕێزمانیی زگماگیی لە زاری سلێمانییدا لەلای چەپەوە بۆ لای ڕاستە.

فرێزەناوییەکانی زاری سلێمانی شوێنی Spec ی بەزۆریان نییە، بەڵکو شوێنێکیان هەیە، کە حوکمی دۆخی ڕێزمانیی ناکرێت. ئەم دوو زانیارییەی بەدەستمخستوون، نیشانەیەکی

---

[272] präpositional

[273] Wh-Bewegung

پرسیار دەخەنە سەر بوونی رەگەزی ´´X. فرێزەناوییەکان پێویستییان بە شوێنێکی نیشتنەوە[٢٧٤]ی تایبەتییە، کەشوێنی ´A یێکی حوکم نەکراوەو بەواتا شوێنێکی لایەنی بابەتانە[٢٧٥] نییە؛ لەم شوێنەدا دۆخی رێزمانیی زگماکیی دێتەدیتن. شوێنی ´A ی حوکم نەکراو، شوێنی هەڵواسین و لکاندنە کەیە. بەڵام دەڵێین، رەنگە بەبێ بوونی سەرێکی گۆکەر FK، شوێنێکی Spec ی ئازادو پڕنەکراوە هەر هەبێت[٢٧٦]؛ پێدەچێت ئەم شوێنی Spec ە ئازادە لە هەندێك هەلومەرجدا بە وەچەپێکهاتەیەك پڕببێتەوە، کە سەرچاوەیەکی تری بۆ دۆخەرێزمانییەکەی هەبێت؛ لە (٤٤ب) دا بۆ نموونە بە فرێزێکی پێشناویی پڕبووەتەوە.

لە رەگەزی <شارتێکدان> دا "شار" لە لایەن سەرێکەوە "تێکدان"، کە کردارە. وەچەدیارییکراوە[٢٧٧]، لایەنی بابەتانەی نیشانەکراوە[٢٧٨] و دۆخی رێزمانیی زگماکیی پێدراوە. لە وەچەپێکهاتەی {تێکدانی شار} دا هەر "تێکدان" سەری "شار"ە. چونکە، وەك لە نەخشەو شێوە ئەندازیارییەکەی (٥٧) دا دەردەکەوێت، "تێکدان" وەك سەری حوکمکەری فرێزەکە، لەو زنجیرەیەدا حوکمی ئەو NP یەی "شار" دەکات، یان ئەوەتا ئەو /ی/ خستنەپاڵە دۆخەکە دەدات.

٥٧- تێکدانی شارێك/شارەکە




---

[٢٧٤] Landestelle

[٢٧٥] eine nicht regierte A`-(nicht-themen) Landestelle

[٢٧٦] بەراوردیی بکە لەگەڵ (1989, 1999) Hamasaeed: "نەبوونی سەرێکی گۆکەر دەبێتەهۆی ئەوەی شوێنێکی Spec ی ئازاد نەبێت"!

[٢٧٧] subkategorisiert

[٢٧٨] Themen-markiert

ئەگەر ئێستا بە وردیی سەیری پێکهاتووی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ناڕاستەوخۆ <گردەپیاو> و دۆخی ڕێزمانیی خستنەپاڵ {کردنی نان} بکەینەوە، بۆمان دەردەکەوێت، کە کاتێك کردارەکان دەکرێن بەناو، کە هیچ پێویستییەکیان بە یاسایەکی گواستنەوە[٢٧٩] نییە. ئەوەمان بۆ دەرکەوت و داوای ئەوەم کرد، کە بە دیهێنانی دۆخی ڕێزمانیی زگماکیی بە زۆر نییە، و کەدەشێت یان پێشناوێکی بۆش یان فرێزێکی ناویی دابنێین و کە کاتێك ڕێ بە بەرهەمە دەستکەوتوو[٢٨٠]ەکە دەدرێت، کە ئەمەی دواییان جێبەجێنەکرێت، کەواتە بەرهەمی ئەمەی دواییان نەبێت.

58- a) „destruction of the city by Nero“
b) „city`s destruction by Nero“
c)*

بەخشینی دۆخی ڕێزمانیی خستنەپاڵ لە {کردنی نان} دا دۆخێکی مۆرفۆلۆژیی زگماکییە. بۆیە ڕێ بە پێکهاتووی لەو چەشنانەی لای خوارەوە نادرێت، چونکە ئەوانە دۆخنێواندژیی دەهێننەکایەوەو ناکۆکی لە دۆخدا بەرپا دەکەن.

٥٩- (ا) * ە پیاو گرد
(ب) * ی نان کردن

نموونەکانی (٥٩) دەریدەخەن، کە (٦٠) یاسایەکی بنەڕەتیی و بنجیی زاری سلێمانییە.

60- NP ⟶ N – Det

لەگەڵ ئەمەیشدا هەر کەرەستەیەکی سەرەتایی پێکهاتوویەکی خستنەپاڵ دەتوانێت دەرخەرو دیارییکەرێك[٢٨١] یان مۆرفێمێکی ناسیاریی و نەناسیاریی وەربگرێت. پێکهاتووی خستنەپاڵ دروستەیەکی پلەوپایەداری هەیەو بەم پێیە نەخشەی واتایەکی یەکگرتووی نییە.

---

[٢٧٩] Transformationsregel

[٢٨٠] Output

[٢٨١] Artikel

٦١- تێکدانێکی شارەکە

پێکهاتووەکانی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ڕاستەوخۆ بەهۆی لاوازبوونی ڤاوڵەکەیەوە واتالێکدانەوەیەکی یەکگرتوویان هەیە؛ کەواتە دەشێت دروستەی پلەوپایەداری زەق و لەڕوویان نەبێت. بۆیە گشت پێکهاتووەکە وەك "ناوێك" دەتوانێت دەرخەرو دیارییکەرێك وەربگرێت و وەك ڕەگەزێکی ناو فەرهەنگ شیبکرێتەوەو ڕەفتارو مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.

٦٢- (ا) <کەڵەپیاو> (ب) {کەڵەپیاوێك} *{کەڵێك پیاو}
{کەڵەپیاوەکە} *{کەڵەکەپیاو}
{کەڵەپیاوەکان} *{کەڵەکان پیاو}

کە زاری سلێمانی ژمارەیەکی زۆری لە پێکهاتووی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ناڕاستەوخۆی هەیەو بوون بە وشەی سەربەخۆی ناو فەرهەنگ و تاکوتەرایش پێکهاتووی خستنەپاڵی وەك وشەی سەربەخۆ نییە، بەڵگەن، بۆ ئەوەی کە پێکهاتووی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ناڕاستەوخۆی لەم چەشنە وشەن. مەبەستم وشەی سەربەخۆو تۆمارکراوی ناو فەرهەنگی کوردیین. لەمەوە ئەوە هەڵدەهێنجم، کە (ا) دەشێت فرێزی ناویی زاری سلێمانیی شوێنی Spec حازروبزربێت، و (ب) دەتوانرێت بگوترێت، کە دەرخەرو دیارییکەرەکانی ئەم زارە بە واتاو ناوەرۆکی فوکوی/سپیسەوە سەری گۆکەریی FK نەبن.
نەخشەو شێوە ئەندازیارییە پلەوپایەدارەکانی لای خوارەوە ڕاستیی بانگەشەی ئەو گریمانەیەم دەردەخەن، کە ئەوان دروستەی ناوەوەی فرێزی ناویی زمانی کوردیی[٢٨٢] دەردەخەن و گرنگیی دابەشبوونی تەواوکەرانە[٢٨٣]ی نیشانەی خستنەپاڵ و دەرخەرو دیارییکەر[٢٨٤]ەکانی لە دروستەکانی فرێزەناوییەکاندان، دەخەنەڕوو. لەبەرئەوەی ڕەگەزە فەرهەنگیی و سینتاکسییەکان وەك بناغە بۆ پێکهاتووەکانی خستنەپاڵ لە زنجیرەی دوپاتبووەدا دەردەکەون، پێکهاتووی خستنەپاڵ و پێکهاتووی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ناڕاستەوخۆیش لەو زنجیرە دووپاتبووانەدا دەبینینەوە.

[٢٨٢] interne Struktur der kurdischen NPs

[٢٨٣] komplementäre Verteilung

[٢٨٤] Determinator, Artikel

63- a)




b)




٦٤- (ا) یەك تێكدانی شار




(ب) تێكدانی شارەكە




(پ) تێكدانێكی شارەكە



٦٥- (ا) باوکی ئارام




(ب) ئامۆزاکەی ئارام




لەئەنجامی لێدوانەکان و بەپێی ڕوونکردنەوەکانی لای سەرەوەم، دەتوانرێت دروستەی ئەو پێکهاتووانەی خستنەپاڵ، کە لە زنجیرەی چڕو ئاڵۆزدا دەردەکەون، وەك لە (٦٦) و (٦٧) دا بخرێنەڕوو.

٦٦- دەستی براکەی نەوزادی ئامۆزای برای من



٦٧- یەك دەستی براکەی نەوزادی ئامۆزای من




ئاکامێکی لۆژیکیی ئەم ڕوونکردنەوەو ئەنجامەی بەدەستمکەوتوون، ئەو ڕاستییەیە، کە هیچ کەرەستەیەکی سەرەتایی ناو فرێزێکی ناویی ناتوانرێت بۆلای ڕاست بجولێنرێت یان بگوێزرێتەوە. ئاکام و داهاتووەکانی شیکردنەوەکانم لەگەڵ داوای گریمانە نەزەرییەکانی فوکوی/سپیسدا یەکدەگرنەوە تەتابوقیان هەیە.

## دروستەکانی ناوەوەی فرێزەناوییەکان:

سەرەناوێك، تاك یان كۆ، ناتوانێت بەتەنها وەك بکەر[٢٨٥] دەربکەوێت. فرێزێکی ناویی دەبێت دیارییکەرێکی لەگەڵدا بێت. هەندێك فۆرمی مۆرفۆلۆژیی تایبەتیی بە کۆکردنی سەرەناو هەن، کە لە زاری سلێمانیدا وەك پاشماوە ماونەتەوەو دەتوانرێن وەك فرێزی ناویی بەکاربهێنرێن (بڕوانە: /کوڕ/ {کوڕان} بەڵام {کوڕگەل}، /گا/ {گایان/ بەڵام {گاگەل}...هتد.).

٦٨- (ا) منداڵەکە هات/یارییدەکات. به منداڵەکە بڵێ: ...
من منداڵەکەم بینیی.
(ب) منداڵەکان هاتن/یارییدەکەن. به منداڵەکان بڵێ: ...
من منداڵەکانم بینیی.
(پ) منداڵێك هات/یارییدەکات. به منداڵێك بڵێ: ...
من منداڵێکم بینیی.
(ت) کچگەل هاتن/یارییدەکەن. به کچگەل بڵێ: ...
*من کچگەلم بینیی
(ج) * منداڵ هات/یارییدەکات
(ح) منداڵان هاتن/یارییدەکەن.

ئەم مەرجە، شێوەکانی بانگکردن و ئەو ڕستانەی واتاولێکدانەوەیەکی گشتییان هەیە، ناگرێتەوە.

٦٩- (ا) کوڕینە! وەرن!
(ب) کچینە ! بڕۆن!

٧٠- (ا) پۆڵا ڕەقە.
(ب) هاوین گەرمە.

ناوی کەس و ناوی تایبەتییش لەم یاسایە بەدەرن.

٧١- (ا) وان دەریاچەیەکی باشووری کوردستانە.
(ب) سیروان بەیەککەم دەردەچێت.

---

٢٨٥ Subject

پێکهاتووی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ناڕاستەوخۆ ناتوانێت بەتەنها وەك فرێزی ناویی گۆبکات. بەڵام هەندێك پێکهاتووی خستنەپاڵ گۆکردنی فرێزی ناوییان دەبێت، بەواتا وەك فرێزی ناویی بەدەردەکەون. پێکهاتوویەکی خستنەپاڵ دەتوانێت واتاو لێکدانەوەیەکی گشتیی دەربڕێت؛ بەڵام دروستەیەکی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ناڕاستەوخۆ ناتوانێت واتاولێکدانەوەیەکی گشتیی هەبێت یان بەدەستەوەی بدات. چونکە پێکهاتوویەکی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ناڕاستەوخۆ [ +definit] و پێکهاتوویەکی خستنەپاڵ [- definit] ی هەیە.

٧٢- (ا) کوڕی ئازا زۆر بە دەگمەن دەستدەکەوێت. کوڕی ئازا دانسقەیە.
(ب)* کەڵەپیاو زۆر بە دەگمەن دەستدەکەوێت. * کەڵەپیاو دانسقەیە

بەپێچەوانەی پێکهاتووی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ناڕاستەوخۆوە، دروستە خاوەندارییەکان[٢٨٦] وەك فرێزی ناویی بەکاردەبرێن.

٧٣- (ا) دەستی من شکا. ؛ کوڕی من زیرەکە.
(ب) من بە کوڕی خۆم دەڵێم، ... ؛ ؟؟پۆلیس کوڕی منی گرتووە

کەواتە فرێزێکی ناویی لە سەرەناوێك و مۆرفێمێکی دیارییکەر دروستدەبێت. دروستەیەکی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ناڕاستەوخۆ[٢٨٧]، کە واتایەکی یەکگرتووی وەك یەکەیەکی[٢٨٨] هەیە، دەتوانێت مۆرفێمێکی دەرخەرو دیارییکەر وەربگرێت و فرێزێکی ناویی بەرهەمبهێنێت.

٧٤- (ا) کەڵەپیاوێك هات.
(ب) کەڵەپیاوەکە هات.
(پ) پیرەمێردەکە نوێژدەکات.
(ت) کەڵەپیاوەکان هاتن.

---

[٢٨٦] Possessivstrukturen

[٢٨٧] Dativbildung

[٢٨٨] eine einheitliche Interpretation

لەبەرئەوەی پێکهاتووی خستنەپاڵ (بەکارهێنانی ئاوەڵناویی[289]) واتایەکی گشتیی [definit -]و دروستەیەکی بە پلەوپایەداری هەیە، بە تەنها بنەڕەت و بناغەی پێکهاتووەکە[290]، بەواتا سەرەناوەکە، دەتوانێت مۆرفێمێکی نەناسیاریی وەربگرێت. لەم بارەدا فریزێکی ناویی، لە شێوەی ناوئاخندا، لەناو پێکهاتوویەکی خستنەپاڵدا شکاوەتەوە. پاشان گشت پێکهاتووەکە وەك فریزێکی بکەریی بەکاردەهێنرێت.

٧٥- (ا) {قوتابیی زیرەك}
(ب) {قوتابییەکی زیرەك}
(پ) {قوتابییەکی زیرەکی ژیر}
(ت) *{قوتابییەکانی زیرەك}
(ج) *{قوتابییەکەی زیرەك}
(چ) {قوتابییانی زیرەك}

بۆ ئەوەی پێکهاتووی خستنەپاڵەکە مۆرفێمێکی دیارییکەر وەربگرێت، دەبێت پێکهاتووی خستنەپاڵەکە بگۆڕدرێت و بکرێت یە پێکهاتوویەکی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ناڕاستەوخۆ. دەرکەوتنی نیشانەیەکی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ناڕاستەوخۆ /W/ لەنێوان هەڵەفەسەرەکییەکانی فریزێکی ناوییدا لەگەڵ مۆرفێمێکی دیارییکەر لە کۆتاییەکەیدا، [definit+] ی ڕێکەوتنی (هاوکەسێتیی)[291] پێکهاتووی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ناڕاستەوخۆ دەگرێتەوە، کە هی پێکهاتوویەکی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ناڕاستەوخۆیەو ئێستا بە نیشانەیەکی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ناڕاستەوخۆوە هی فریزێکی ناوییە.

٧٦- (ا) {قوتابییە زیرەکەکە}
(ب) {قوتابییە زیرەکەکان}

## ٣-٣-١/٢) ئایا ڕستەکانی زمانی کوردیی ´V ن؟

ئەو دیاردانەی زمان، کە دەتوانن بیسەلمێنن ´V لەجێی پرۆژەکانی ڕستە (پرۆژەی - S ) ن، ئەمانەن: (ا) بکەری دووپاتبووە (هەر ڕستەیەك دوو کەرەستەی بکەری هەیە) و (ب) چەندجار

---

[289] attributiver Gebrauch

[290] Basis der Konstruktion

[291] Kongruenz

دووپاتبوونەوەی پرۆسەکانی "Scrambling" . ئەو دروستانەی ڕستە، کە دەتوانن هاو تەریبی (ا) بن، ئەو ڕستانەن، کە بکەری دووهەمیان پێوە هەڵواسراوەو پێوەلکێنراوە[٢٩٢].

٧٧- ئەوان خۆیان کوشت t.
i i

کە ئەو جێناوی خۆییە[٢٩٣] "خۆیان" لە (٧٧) دا بکەری ڕستەکەیە، بەوە بابەتانە دەسەلمێنرێت، کە وەك بەرکاری ڕاستەوخۆی ناوەکیی[٢٩٤] کردارەکە جێناوی لکاوی بکەر[٢٩٥]ی هەڵنەگرتووە. ڕستەکانی (٧٨) و (٧٩) یش بۆ ئەمە ئاشکراترین نموونەن.

٧٨- ئەوان خۆیان یان کوشت t .
i i i

٧٩- ئەوان خۆیان خۆیان یان کوشت t .
i i i i

ئەو ڕستانەی لای خوارەوە نموونەی ترن بۆ ئەوەی، کە ڕستەکانی زمانی کوردیی دەتوانن دوو کەرەستەیان وەك بکەر هەبێت.

---

[٢٩٢] adjungiertes Subjekt

[٢٩٣] Reflexivpronomen

[٢٩٤] بەرکاری ڕاستەخۆی ناوەکیی کردار، تەواوکەری ڕاستەوخۆی کردارەکەیەو لە بندەستیدانییەو دوورە لێوەی؛ ئەگەر کرداری سەرەکیی ڕستەکە، کرداری ڕابوردوو بوو، ئەوا ئەم بەرکارە ڕاستەوخۆیە جێناوەلکاوەکەی بکەر هەڵدەگرێت: نەوزاد منی گرت. *نەوزاد من گرتی.

بەرکاری ناڕاستەوخۆی ناوەکیی کردار لە زمانی کوردیدا هەمیشە فرێزێکی پێشناوییە: نەوزاد منی بەدەست گرت. تەواوکەری دەرەکیی کردار بکەرەکەیە (وەرگێڕ).

[٢٩٥] زمانەکەمان جێناوی لکاوی بکەری subject clitics لە جێناوی لکاوی بەرکار object clitics جیاکردووەتەوەو بۆ هەریەکەیان ژمارەیەکی دیارییکراوی هەیەو بۆ هەر یەکەیان دانەیەکی سەربەخۆی بۆ ئامادەکردووین. ئەم جێناوەلکاوانە لە ڕستەی مۆرفۆسینتاکسدا چالاکن (وەرگێڕ).

٨٠- ئێمە، دەستمان t شکا.

i i

ڕاستییەدەستکەوتووەکانی سەرەوە ڕوونیدەکەنەوە، بۆچی فرێزە ناوییەکەی {دەستمان} لە (٨٠) دا بکەری ڕستەکەیە؛ ئەو ڕستەیەی بکەرێکی دووهەمی {ئێمە} پێوە هەڵواسراوەو پێوەلکێنراوە. چونکە کردارەکەی (٨٠) "شکا"، بەپێچەوانەی کردارەکەی (٨١) ەوە "شکاند"، کردارێکی تێنەپەڕە.

٨١- ئێمە دەستمان شکاند t .

i i

٨٢- ئێمە دەستی خۆمانمان شکاند t .

i i i i

هەروەك چۆن ڕستەکانی (٧٧) و (٨٠) دەریدەخەن، دەشێت ڕستەکانی زمانی کوردیی دوو کەرەستەی بکەریان (دوو بکەریان) هەبێت. بۆیە ڕەنگە وەهابێت، کە گشت ڕستەکانی زمانی کوردیی پرۆژەی کرداریی ´V بن. چونکە ئەگەر گشت ڕستەکانی زمانەکەمان پرۆژەی S بن، ئەوا ناتوانرێت هیچ بە ڕستکانەوە هەڵبواسرێن یان هیچ بخرێتەسەریان. دیاردەی تر هەن، وەك بەڵگە داکۆکی لەم بۆچوونەم یان بیرۆچکەیەم دەکەن و پشتیدەگرن؛ ئەو دروستانەی ڕستەی لەم چەشنەن، کە تیایاندا جێناوی لکاوی بەرکار[٢٩٦] و پێشناوەکان چەند جوڵاندنێکی دروێینەی وەچەپێکهاتووەکان لە پێکهاتووەکانی left dislocation دا دەردەخسێنن.

---

٢٩٦ Objectklitika

٨٢- نامەکان، بەدەست، ئارام ویستیی، (pro) t t بیبیان نووسێت.

z j j i z z z i j

ئەو نموونەیە بەتەواویی ئاشکرایدەکات، کە بە هیچ جۆرێك گواستنەوە یان پرۆسەی "scrambling" لەم چەشنەی رستەی کوردیدا نییە؛ رستەکە، وەك رستەکانی دیکە، دەریدەخات، کە وەچەپێکهاتوویەك بۆ گەورەترین پرۆژەکانی رستەکە (IP) زیادکراوە یان وەچە پێکهاتوویەکی تری خراوەتەسەرو پێوەی لکێنراوە.

ئەو فرێزەناوییانەی خراونەتەسەر رستەکان و پێیانەوە لکێنراون، لەرێی هاونیشانەکردنیانەوە[٢٩٧] لەسەر ئاستی SS پێداویستیی و مەرجەکانی لایەنە بابەتییەکان و مەرجەکانی دۆخی رێزمانیی بەجێدەهێنن. ئێمە دەزانین، کە دەشێت پرۆژەکانی سەرەفەرهەنگییەکان یەك لەدووی یەك دووپاتببنەوە. بۆ نموونە IP و VP دەتوانن وەك پرۆژەی سەرەرێزمانییە فەرهەنگییەکانی INFL و V دووبارەببنەوە. لەم رستەیەدا فرێزێکی ناویی NP و فرێزێکی پێشناویی PP بۆ رستەیەك زیاددەکرێن و بە رستەکەوە دەلکێنرێت. ئەنجامەکانی ئەمانە دەبن:

(ا) لەبەرئەوەی V´ەکان نە سەرن و نە تەواوکەرن و لەبەرئەوەی ئەمانە دەتوانن دووپاتببنەوە، رستەکانی زمانی کوردیی دەتوانن V´ بن. بەڵام لەبەرئەوەی دەتوانن شوێنی Spec ێکی ئازادیان هەبێت، بۆیان هەیە پرۆژەی داخراویش بن.

(ب) وەچە پێکهاتەی INFL ی زاری سلێمانی سەری گۆکەرنییە FK بەڵکو سەری فەرهەنگییە LK. ناوەرۆکی فۆنۆلۆژیی ئازاد -ناوابەستەیی- ی INFL[٢٩٨] و دەرکەوتن و بەکارهێنانی سینتاکسیی INFL لە ناو کرداره ئاڵۆزە لەناوخۆشکاوەکاندا[٢٩٩]، هەر یەك بەپێی "چەشنی رێزمانیی کردار"[٣٠٠]ەکە (فۆرمی ئاسایی یان فۆرمی راستەقینەیی[٣٠١] و یان فۆرمی مەرجیی یان شێوەی ئەگەر[٣٠٢])، سەلماندنێکی بەهێزە بۆ ئەم ئەنجامانەوەیە:

---

[٢٩٧] koindizierung

[٢٩٨] der unabhängige phonologische Gehalt von INFL

[٢٩٩] sein syntaktisches Vorkommen innerhalb des inkorporierten Verbkomplexes

[٣٠٠] Modusdes Verbs

[٣٠١] Normalform od. Wirklichkeitsform als Teilkategorie des Modus des Verbs (indikativ)

[٣٠٢] Konjunktiv; engl. Subjunctive: Möglichkeitsform als Teilkategorie des Verbs

**فۆرمی ئاسایی**



٨٤- ( pro)  t  دە یان گرم.

i    j    j    i

**مەرجیی،ڕانەبوردوو**



٨٥- ئەگەر (pro)  t  دەیان  گرم.

i    j    j    i

**مەرجیی، ڕابوردوو**



٨٦- ئەگەر ( pro)  t  دەم  گرتن.

i    j    j    i

گێڕانەوەو بەستنەوەی ڕێسای پڕۆژەسازدانی فراوانکراو بە بەخشینی نیشانەتایبەتییە گۆکەر F - Feature ەکانی INFL ەوە، هەروەك فوکوی/سپیس دانیانپێدادەنێن، ئەو ئاکامەی هەیە، کە ئەو زمانانەی FK یان نییە، گواستنەوەی وشەی پرسیار Wh یشیان نەبێت. چونکە نیشانەتایبەتییەکانی وشەی پرسیار Wh-Features ئەو نیشانانەن، کە لە تۆڕی نیشانەتایبەتییەکانی سەری گۆکەر F-Kopf ی (Comp) دان. کەواتە لەم زمانەدا شوێنێکی نیشتنەوە بۆ ئەو کەرەستەسەرەتاییەی وشەی پرسیار Wh-Element نییە. لە تیۆرییەکەی فوکوی/سپیسدا نەبوونی گواستنەوەی وشەی پرسیاری ڕستەسازیی بە نەبوونی FK وەرگیراوەو هەڵگوێزراوە. بزربی یان نەبوونی گواستنەوەی وشەی پرسیار لە سەرەتای ڕستەسازیی کوردییدا بەڵگەیەکی ترە بۆئەوەی، کە INFL لە زاری سلێمانییدا FK نییە.

لەبەر بوونی ئەم ڕاستییانەو بەهۆی بەڵگە کەرەستەییە نەزەرییەکانەوە، وای بۆدەچم و وەها تیدەگەم، کە گشت شوێنەکانی لایەنەبابەتییەکان (-Themen-Positionen bzw. A Positionen) لە ئاستی قووڵدا DS لە نێوان (S) ´X دا دەردەکەون. لە ئەنجامی ئەمەدایە، کە

شوێنی بکەر[٢٠٣] شوێنێکی بابەتانەیەو بەپێی ڕۆتشتاین[٢٠٤] لەگەڵ بەشی کردار لە پەیوەندیدایە[٢٠٥]. کە کەرەستەکانی شوێنی بکەر وەك بکەر دەردەکەون، بەڵگەیەکی ئاشکرایە بۆ ئەمە.

٨٧- پیاو دەکوژرێت.
i i

ڕەگەزەکان (بەتایبەتیی فرێزەپێشناوییەکان PP)، کە بە پرۆژەگەورەکانەوە (V´) لکێنراون، ڕەگەزی گوێزراوەن. بەم پێیە، شوێنەکانی ئەم ڕەگەزانە شوێنی پێوەلکاندن و هەڵواسینن[٢٠٦].

٨٨- (ا) ئازیز نامەکەی بەدەست نووسی.
i j i
V V´ V´

(ب) ئازیز بەدەست نامەکەی نووسی.
i j i
V V´ V´

(پ) بەدەست، ئازیز نامەکەی نووسی.
i j i
V V´ V´ V´

ئەو ڕستانەی سەرەوە، پڕاوپڕ بەپێی تیۆرییەکەی فوکوی/سپیس، ئەم نەخشەوشێوە ئەندازیارییانەیان دەخرێتەتەك، ئەگەر ئێمە بەشێوەیەکی چەوت و نادروست وەچە پێکهاتەیەکی[٢٠٧] کات وکەس I NFL ی جیایان (جیاوپچڕاو لە ڕەگی کردار) بدەینێ.

---

٢٠٣ Subjektposition

٢٠٤ Rothstein (1983)

٢٠٥ Prädikationsrelation

٢٠٦ Adjunktionsstellen

٢٠٧ Konstituente

٨٩- (ا)


IP
I′
Spec
ئازیز
I
V′
V′
N′
V
PP
N′′
نامەکی بەدەست نوسیی

(ب)


IP
I′
Spec
ئازیز
I
V′
V′
N′′
V′
PP
بەدەست
V′
PP
N′′
نووسی
نامەکەی




لەتەك بەرزکردنـەوەی فرێـزە ناوییەکـەوە بـۆ شـوێنی Spec ، دەبێـت ئێمـە چـاوەڕێی گواستنەوەیەکی تریـش بیـن؛ ئـەویش بەرزکردنـەوەی کـردارە بـۆ INFL. دووپاتکردنـەوەی لکاندنی زۆر بە V′ (لێرەدا IP ) ەوە هـانمدەدات سـەیری ڕستە S و فرێزی کـردار VP وەك پرۆژەی V′ بکەم و هـەر وەهـایش مامەڵەیان لەگـەڵدا بکەم. بەڵگەهێنانـەوەکان لەبـەرژەوەندیی دروستـەیەکی ئاڵۆزو فەرهـەنگیی کـردار ی وەك V+TENSE+AGR [٣٠٨] ی زمـانی کوردیـی، نیشانە تایبەتییەکانی ئەو کەرەستەسەرەتاییانە دەسەلمێنن، کە کردار دروستدەکەن. لەڕێی وەچـە پێکهاتەیـەکیINFL ی ( TENSE+AGR) ی بـەهێزەوە کردارشـکاندنەوە Flexion دۆخی ڕێزمانیی بکەریی بەو کەرەستەیە دەدات، کە لە شوێنی بکەردایە. لەبەرئەمەیە، هـەرچ وەچەپێکهاتەیەکی لە کەس و ژمارەیدا لەگەڵ بەشی کرداردا هاوکـەس kongruenz بێـت، لەلایـەن دۆخـی ڕێزمـانیی بکەرییـەوە حوکمـی دەکرێـت. بـەپێی تیۆرییەکـەی منیـش، ئەمـە ڕێنیپێدەدرێـت و دەتوانـن بـبن. ئەمـەیش، هـەر وەك ڕسـتەکانی (٧٦ تـا ٧٨) نیشـانیدەدەن، نیشانەیەکە لە نیشانەتایبەتییەکانی دۆخی ڕێزمانیی دروستەیی.

٩٠- [لە نەوزاد] [درا[V]]

---

[٣٠٨] کات TENSE و کەس AGR, Agreement ی کردارن، کە لەگەڵ ڕەگی کردار، کرداری کاتداری تەواو دروستدەکەن؛ ڕەگی کردارو کاتیش قەدی کردار بەبەرهەمدێنن.

٩١- [گرانیی] [یەV]]

٩٢- [درەنگ] [ەV]]

ئەم چەشنە ڕستانە و بەتایبەتیی ڕستەی بکەرنادیار[٣٠٩] لەگڵ فرێزی پێشناویی وەك بکەر کێشەی ئاڵۆز بۆ تیۆرییەکەی فوکوی/سپیس دەهێننەکایەوە. بەخشینی ڕاستەوخۆی دۆخی ڕێزمانیی بکەریی[٣١٠] لە ڕێی کردارشکاندنەوەیەکی زەنگینەوە[٣١١]، کە ئاکارێکی تایبەتمەندی زمانە pro خراوەکانە[٣١٢] و ئەو نیشانەتایبەتییە فەرهەنگییانەی ، کە ڕێ بە گرێیەکی IN FL ی جیاو سەربەخۆ نادەن، ڕێ نە بە بەرزکردنەوەی فرێزی ناویی دەدەن و نە بە بەرزکردنەوەی کردار بۆ INFL . بۆیە فرێزەکانی کرداوو پرۆژەکانی ڕستە گشتیان لە ڕەگەزی X´ ن و لەگەڵ شوێنێکی Spec ی حازروبزردا شیدەکرێنەوە.

## ١/٢-٣-٣-١) ڕستەی کرداری بکەرنادیار[٣١٣]

دەبێت تیۆرییەکەی فوکوی/سپیس ئەو دارشتە دروستەییانەی لای خوارەوە بداتە تەك ئەم ڕستانەی بکەرنادیار؛ چونکە (ا) ئەو ڕەگەزانەی تیایاندا دووپاتبوونەتەوە، نە سەرن و نەتەواوکەرن و (ب) لەبەرئەوەی پێدەچێت ئەو NP بکەرەی حوکمی دۆخی ڕێزمانیی نەکراوە، بۆ شوێنی Spec گوێزرابێتەوە، بۆ ئەوەی پێویستییەکانی ڕێسای تێرکردن جێبەجێکات و بیانهێنێتەدیتن. من دەبێت وەهایشی دابنێم، کە فرێزەناوییەکان پاش بەرزکردنەوەی بکەرو پێش بەرزکردنەوەی کردار حوکمی ڕێزمانی دەکرێن.

---

٣٠٩ Passivsätze

٣١٠ direkte Nominativzuweisung

٣١١ reiche Flexion

٣١٢ pro-drop Sprachen

٣١٣ Passivsätze

٩٣- ئازیز پەرتووکێکی پێشکەشکرا.




٩٤- پەرتووکێک بە ئازیز درا



٩٥- بە ئازیز، پەرتووکێک پێشکەشکرا.




نیشانەتایبەتییە فەرهەنگییەکانی وەچەپێکهاتەی INFL و بەخشینی ڕاستەوخۆی دۆخی ڕێزمانیی لە لایەن وەچە پێکهاتەیەکی INFL ی زەنگینەوە، هەر وەک ئاماژەمان بۆ کرد، کێشەی زۆر ئاڵۆز بۆ تیۆرییەکەی فوکوی/سپیس دەهێننەکایەوە. با ئێستایش لە ڕستەی (٩٠) وردببینەوەو سەیرێکی نەخشەئەندازیارییەکەی بکەین.

٩٦- لەنەوزاد درا.



نەخشەئەندازیارییەکەی (٩٦) دۆخێکی ڕێزمانیی نێواندژی[٣١٤] تێدایە (دۆخنێواندژە). چونکە ئەو بکەرە NP یەی دۆخی ڕێزمانی کرداریستی هەڵگرتووە، حوکمی دۆخی ڕێزمانیی بکەرییش کراوە. ئەگەر بانگەشەی ئەو گریمانەیە بکەم، کە بەهۆی پرۆژەی پێشناوەکەوە[٣١٥] حوکمی ئەو بکەرە NP یە ناکرێت، ئەوا من بانگەشەی ئەو گریمانەیەدەکەم، کە زاری سلێمانی هیچ نرخێك بۆ ڕێسای تیرکردن دانانێت و هیچ باخەیەکی پێنادات. بەڵام ئەمە ڕاست نییەو ڕاستیش نابێت.

کردارە بکەرنادیارەکانی زاری سلێمانی بوون بە کرداری سەربەخۆی ناو فەرهەنگی کوردیی و حوکمی بەرکاری ڕاستەوخۆ دەکەن. کەواتە ماف ئەوەم هەیە، ئەم پرسیارە بکەم: ئایا وەچە پێکاتەکان (و فرێزەپێشناوییەکانیش) لە جێی بنەڕەتیی خۆیانەوە بۆ شوێنی Spec گوێزراونەتەوە یان نا؟ بە واتا: ئایا ئارگومێنتێکی ناوەکیی لەجێی بنەڕەتییەوە لەناو فرێزی کرداریدا گوێزراوەتەوە بۆ شوێنی Spec یا نا؟ دۆخی ڕێزمانی هۆو هاندەری گواستنەوەی فرێزی ناوییە. کەواتە لە تیۆرییەکەی فوکوی/سپیسدا، هیچ هۆیەك نییە ئارگومێنتێکی ناوەکیی کردارێکی بکەرنادیار یان فرێزێکی پێشناویی بۆ شوێنی Spec بگوێزرێتەوە. بەپێی تیۆرییەکەی خۆم، تیۆری بەخشینی ڕاستەوخۆی دۆخی ڕێزمانیی بکەر، دەشێت هەر ڕەگەزێکی لەگەڵ بەشی کرداردا هاوکەس بێت (لە کەس و ژمارەدا وەکیەکن)، ببێت بە بکەری بەشی کرداری بکەرنادیار. کەواتە لە بەخشینی ڕاستەوخۆی دۆخی ڕێزمانیی بکەرییدا ئەم چەشنە ڕستانەی لای خوارەوە ڕێیانپێدەدرێت.

٩٧- بەدەست، لە نەوزاد درا.




٩٨- لە نەوزاد، بە دەست درا.

---

[٣١٤] Kasuskonflikt

[٣١٥] P-Projektion




٩٩- نەوزاد$_i$، بە دەست لێی$_i$ $t_i$ درا.




### ٢-٣-٢-١/٢) فرێزی "شکاندنەوەی کردار" V′ (IP)[216]

وەچەپێکهاتەی INFL هەمیشە کەرەستە سەرەتاییەکانی TENSE و AGR ی تێدایە، چونکە زاری سلێمانی ڕستەی تەواوکەری چاوگیی[217]ی نییە. ڕوونکردنەوەکانی سەرەوەم ڕێیان بۆ ئەوە خۆشکردووە، وەچەپێکهاتەی INFL وەك سەرێکی فەرهەنگیی LK جیابکەمەوەو دەستنیشانبکەم. لەبەرئەمەیە زاری سلێمانی گواستنەوەی فرێزی ناویی نیشاننادات =نییەتی-. چونکە جێبەجێکردنی گواستنەوەی فرێزی ناویی دەبێتەهۆی دروستبوونی دۆخی ڕێزمانیی نێواندژ. ڕستەی زاری سلێمانی نابێت نە بەزۆر شوێنی

[216] Flexionsphrase

[217] Infinitiv-Komplementsätze

S pec ی هەبێت و نە گرێیەکی جیاو سەربەخۆی INFL ی هەبێت. بەڵام وەچەیەکەتی INFL ی فەرهەنگیی ڕێدەدات بە ئازادی شوێنی Spec بەکاربهێنرێت.
کاتێك کرداربەرزکردنەوە بەزۆرە، کە وەچەپێکهاتەی INFL گرێیەکی سەربەخۆی جیابێت. بەڵام لەبەرئەوەی INFL ی زمانی کوردیی ڕەگەزێکی فەرهەنگیی LK یە. INFL ناتوانێت گرێیەکی جیاو سەربەخۆی ڕستە بێت. بەخشینی ڕاستەوخۆی دۆخی ڕێزمانیی "دۆخی ڕێزمانیی بکەریی" لە لایەن شکاندنەوەیەکی زەنگینی کردارەوە لەگەڵ ئەم ڕاستییانەدا گونجاون و بەتەواویی لەگەڵ یەکتیریدا یەکدەگرنەوە.

## یەککەم: Comp و دیارییکردنی دروستەیی جەمسەرەکانی ڕستە[318]

وشەی پرسیار یاسائاسا و هەمیشە دەگوێزرێتەوە بۆلای چەپ، ئەگەر ڕەگەزی Comp نیشانە تایبەتییە گۆکەرەکانی وشەی پرسیاریان (F-Feature +Wh) هەبێت. لەبەرئەوەی زمانی کوردیی گواستنەوەی وشەی پرسیاری لە ڕستەسازییدا نییە، ئەم ڕەگەزە گۆکەرە (Comp) هیچ نیشانەی تایبەتیی وشەی پرسیار (+Wh-Feature) ی نییە. لەبەرئەمەیە ئەم ڕەگەزە پڕۆژەیەکی کراوەیەو ڕێ بە بوونی دووپاتبوونەوەو پرۆسەکانی هێنانە پێشەوەو دەرخستنی[319] ڕستە دەدات.
شوێنی Comp ی ڕستەی کوردیی بە دوو جۆر یان شێوە بە کەرەستەی فەرهەنگیی پردەبێتەوە:
(ا) شوێنی Comp ی ڕستەی شکاوەی کوردیی جارجارێك یەکێك لە واژەگۆکەرە تەواوکەرەکانی (<ئەگەر> یان <کە>) ی تێدایە. بەکارهێنانی هەر یەکێك لەو دوو واژەگۆکەرە بەپێی چەشنەڕێزمانییەکانی کردارەکەی دەبێت. وەك ڕستەکان دەریدەخەن، واژەگۆکەری <ئەگەر> بۆ ڕستەی مەرجیی و واژەگۆکەری <کە> بۆ ڕستەی ئاسایی- ڕوونکەرەوە[320] تەرخانکراوە.

١٠٠- ئارام دەزانێت، کە ئێمە هاتووین.
j j i i

١٠١- ئێمە دەڕۆین، ئەگەر ئەوان بێن.

[318] Comp und die struktureller Bestimmung der Satzperipherie

[319] Topikalisierungsprozesse

[320] deklerativsätze

(ب) گواستنەوەی ئازادانەو سەرپشكیی ڕستەی شكاوە (S′-Sätze) دروستەی ڕستەی وەها بەرهەمدێنێت، كە تیایاندا شوێنی Comp ی ڕستەی سەرەكیی (بنجیی)[٣٢١] بە كەرەستەی فەرهەنگیی پڕدەبێتەوە.

١٠٢- كە ئێمە هاتووین، ئەوان دەزانن.
١٠٣- ئەگەر ئەوان بێن، ئێمە دەڕۆین.

لەسەر بناغەی (ا) و (ب) وەهای دادەنێم، كە ئەم یاسا گشتییانە لە زمانی كوردییدا هەن:

104- V′′ ⟶ Comp – V′

بزانە:

V′′ = S′

V′ = S

V′ = VP

(ا) ئاكارە كرلومكەی فرێزەكوییەكانی زمانی كوردیی و (ب) ئەو ڕستانەی لەچەشنی "leftdislocation" ن و هاوبابەت و هاوتۆرخن[٣٢٢] لەگەڵ پرۆسەكانی Scrambling كر دا؛ (پ) لەبا شوێنی Comp ەی بە "واژەگۆكەرێكی تەولوكەری" فەرهەنگیی[٣٢٣] پڕدەبێتەوە و (ت) هەلومەرجە ڕەخساوەكانی پێوەلكاندن و هەڵواسینی زۆر[٣٢٤]، ڕێماندەدەن (١٠٤) لە تیۆریی X′ بۆ زاری كوردیی هەڵبگوێزین.

---

[٣٢١] Matrixsatz

[٣٢٢] äquivalent

[٣٢٣] lexikalische Komppartikel

[٣٢٤] Adjunktionsmöglichkeiten

105-




(ا) بـــەو ڕژێمـــی پرۆژانـــەی پێشـــنیازمکردن و (ب) بـــەیاریدەی پێناســـەی پەیوەندییەئەندازیارییـــەکانی ڕاینـــهارت و چۆمســـکی[٣٢٥]، کـــە بەســـەر زاری ســـلێمانیدا جێبەجێکراون و (پ) بە کۆمەکی ئاراستەی پێکهاتوو و وەچەپێکهاتە لەگەڵ بەسەردا زاڵبوون و حوکمکـردن، دەتوانرێـت دروسـتەکانی ڕسـتەی زمـانی کوردیـی پەسـنکەرانەو تـەواوپڕاوپڕ ڕوونبکرێنەوە ڕاڤەبکرێن.

## دووهەم: بۆچیی دروستەیەکی ئەندازیاریی بەپلەوپایە؟

هەتا ئێستا ڕاستییەکانی زمانی کوردییم وەها شیکردووەتەوە، کە کردار سەری ڕستە بێـت و بەم شێوەیە کردارم لە ڕستەدا داناو ڕوونکردەوە. لەبەرئەمەیە، کە کارەکەم لـە کارەکـانی S aito (1984), Fukui (1986), Speas (1986) و (1986) FukuiLSpeas دەچێـت. پرسـیارو بابـەتێکی گرنـگ بـۆ شـییکردنەوەی زمـان، شـێوەی ئـەندازیاریی ئـەو زمانـەن، کـە لێیاندەکۆڵرێتەوە. پەیوەست بەمەوە، ئەم پرسیارانە دەکرێن: ئایا ڕستەکانی زمانی کوردیـی وەچەپێکهاتـەی کردار (فرێزی کردار) یـان هەیـە یـان نـا؟ ئایـا زمـانی کوردیـی دروسـتەیەکی ئەندازیاریی بەپلەی هەیە یان دروستەیەکی تەختی هەیە؟

بۆئەوەی بتوانم بە تەواوی وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەمەوە، لەلایەکەوە بەڵگە بـۆ سـەلماندنی بوونـی دروسـتەی ئـەندازیاریی بەپلـە دەهێنمـەوەو لەلایـەکی تریشـەوە بەڵگـە بـۆ سـەلماندنی دروسـتەی تـەختی زمـانی کوردیـی دەخەمـەڕوو. ئـەم هەلانـە (بەڵگەهێنانـەوە دژ یـان

[٣٢٥] Reinhart (1983), Chomsky (1981, 1985)

لەبەرژەوەندیی شێوەی ئەندازیاریی بە پلە) ئەوە دەبەخشن، کە گشت پرۆژەکانی (S) V′ لە ڕەگەزی V ن وە لە ئەنجامی ئەمەدایە، کە "پەیوندییە هاو نیشانەکراوەکان"[٣٢٦] سنووریان کەمتر بۆ دانراوەو ژمارەیان تەواو دیارییەنەکراوە.

بەڵگەکان لەبەرژەوەندی دروستەی ئەندازیاریی بەپلەو پایەدا:

بەڵگەو بەڵگەهێنانەوەکانم زاری سلێمانی لە ڕووی دروستەوە -دروستەی فرێزی بکەری N P -Subject لە دروستەی فرێزی بەرکاری NP-Object جیایە- دەکەن بە دووبەشی جیاوە: فرێزی بکەر NP-Subject لەدەرەوەی فرێزی کردار VP دایەو فرێزی بەرکار -NP Object لەناو گەورەترین پرۆژەدایەو گەورەترین پرۆژەکەیش فرێزی کرداریییە؛ بەڵگەوبەڵگەهێنانەوەکان دەتوانرێن بەم شێوانە بخرێنەڕوو.

(ا) ئامادەبوونی ڕەگەزیی ئارگومێنتەکان[٣٢٧] (ئامادەبوونی فرێزەناوییە فەرهەنگییەکان لەشێوەی بەرجەستەییدا وەك کەرەستەی مۆرفۆلۆژیی و فۆنۆلۆژیی تەواو) ، دەریدەخات، کە کات TENSE و کەس AGR لە دروستکردنی یان داڕشتنی کردلردا کەرەستەی سەرەتایین و نابنە ئارگومێنتی تەواو لەڕستەدا. چونکە ڕەنگە ڕووبدات، کە کەس AGR وەك کەرەستەیەکی سەرەتایی جێناویی[٣٢٨] پێویستییە بابەتییەکانی کردار یان لایەنەبابەتییەکانی کردار جێبەجێبکات؛ لەم حاڵەتەدا فرێزەناوییە فەرهەنگییەتەواوەکان[٣٢٩] وەك شوێنی پێوەلکێنراوو هەڵواسراو[٣٣٠] دەربکەون و بێنەپێشەوە.

بەڵگەیەك بۆ ئەمە ئەو ڕاستییەیە، کە فرێزە ناوییە فەرهەنگییە تەواوەکان نە قورساییخستنەسەر و نە ئاکاری ئاوازی ئەو فرێزەناوییانەیان هەیە، کە بەڕستەوە لکێنراون و نە ئەو ئاوازبڕینە[٣٣١]ی فرێزەناوییە پێوەلکێنراوەکانیان هەیە.

(ب) ئەگەر زمانەوان پەنابەرێتەوە بەر تیۆرییە سەردەمییەکەی چۆمسکی[٣٣٢] و بەر تیۆریی حوکمکردن[٣٣٣] و بەستنەوە، ئەوا بۆی دەردەکەوێت، کە کردلر و بەرکارەکەی لە زمانی

---

[٣٢٦] Korreferenzrelationen

[٣٢٧] kategorische Anwesenheit der Argumente

[٣٢٨] pronominales Element

[٣٢٩] volle lexikalische NPs

[٣٣٠] adjungierte Position

[٣٣١] Intonationsbruch

[٣٣٢] Chomsky (1965)

[٣٣٣] Chomsky (1981)

کوردییدا بەشێوەیەك وەك وەچە پێکهاتەیەك گۆدەکەن، کە دەتوانرێت یاساکانی "جولاندن" و "بوونەجێناو" و "فرێدان یان قرتاندن"[٣٣٤] یان بەسەردا جێبەجێبکرێن.

١٠٦- سکالا نامەکەی نووسی، هەروەها ساکاریش.

(پ) من دەمەوێت بە یاریدەی هۆو هۆهێنانەوەکانی مارانس[٣٣٥] بەبەڵگە بیسەلمێنم، کە فرێزی ناویی بکەر وەچە پێکهاتەیەکی دەرەکیی فرێزی کرداره؛ ئەمەیش بۆیە دەسەلمێنم، بۆ ئەوەی دەریبخەم چۆن هەڵبژاردنی بەرکار، وەك ئارگومێنتێك، لەگەڵ کردارەکەدا بەیەکەوە کاردەکەنە سەر ئەو ڕۆڵە واتاییەی (سێمانتیکیی)[٣٣٦]، بە بکەردەدرێت.

١٠٧- ئازاد ئارامی گرتەوە.
١٠٨- ئازیز تۆپەکەی گرتەوە.
١٠٩- پۆلیس دزەکەی گرتەوە.
١١٠- پیسیی زێرابەکەی گرتەوە.

(ت) شوێنی دروستەیی بکەر بارو حاڵەتی جیاوازە لە هی بەرکار. دەرکەوتنی بکەری-pro لە ڕستەدا دەریدەخات، کە بەرکار لە کردارەوە نزدیك ترە وەك لە بکەر.

١١١- (ا) پەخشان و پرشنگ هاتن.
(ب) ( pro) هاتن.

(ج) ڕاستییە زۆر جیاوازەکانی بەستنەوەو پەیوەندییەکانی هاونیشانەکردن[٣٣٧] نیشانیدەدەن، کە بکەر لە دروستەدا -لەشێوە ئەندازیارییەکاندا- بەرز ترە لە بەرکار. لە پێکهاتووە خۆییەکاندا هەمیشە بەرکار بە بکەرەوە بەستراوە، نەك بە پێچەوانەوە. لەبەر ئەمە دەبێت بەخشینی دۆخی ڕێزمانیی جیاوازبێت لە هی بەرکار، بە واتا وەکیەکیی تەواو نەبێت (ئەسیمەتریی)[٣٣٨] بێت. ئەم نموونانە بەڵگەی ترن، بۆ ئەوەی کە ئەم دوو ئارگومێنتە لە شێوە ئەندازیارییە بە پلەکاندا لە یەکتر جیاوازن.

---

[٣٣٤] Regeln der Bewegung, der Pronominalisierung und der Tilgung

[٣٣٥] Maranz (1984)

[٣٣٦] semantische Rolle

[٣٣٧] Korreferenzrelationen

[٣٣٨] assymmetrisch

١١٢- (ا) ئەو خۆی کوشت.
(ب) * خۆی ئەو کوشت

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم جۆرە پەیوەندییانە پەنادەبەمە بەر لێکدانەوەیەکی مای و چۆمسکی[٣٣٩]، کە دەڵێت: کاتێك X زاڵدەبێت بەسەر Y دا، کە گشت پرۆژەکانی X زاڵبن بەسەر Y دا. ڕستەکەی (٩٨ب) بۆیە ڕێیان پێنادرێت، چونکە ئەو V´ ەی زاڵە بەسەر فرێزی ناویی بەرکارەکەدا، زاڵ نییە بەسەر فرێزی ناویی بکەرەکەدا.

١١٣- [ V´ [N´´ ئەو [ V´ خۆی کوشت]]]

(ح) با ئێستایش سەیری دیاردەی "پەڕینەوەی گچکە"[٣٤٠] و پەیوەندییەکانی بەستنەوەی بکەین. لە کاتێکدا چۆمسکی[٣٤١] هەوڵدەدات حاڵەتەکانی ئەم دیاردەیە لە ڕێی مەرجی (١١٤) ەوە ڕوونبکاتەوە، کووپمان و شپۆرتیشە[٣٤٢] دەیانەوێت لە ڕێی مەرجەکانی بەستنەوەی ڤاریابڵەکانەوە[٣٤٣] (١١٥) ڕوونیبکەنەوە.

١١٤- مەرجی چەپیی[٣٤٤]
ڤاریابڵێك (گۆڕدراوێك)[٣٤٥] نابێت بە وەچەبەستێنەرەوەی[٣٤٦] جێناوێك، کە لەلای چەپیەوەیەتیی.

١١٥- مەرجی دوولایەنیی[٣٤٧]

---

[٣٣٩] May (1985), Chomsky (1986)

[٣٤٠] weak crossover

[٣٤١] Chomsky (1976)

[٣٤٢] Koopman/Sportiche (1981)

[٣٤٣] Bedingung der Variablen-Bindung

[٣٤٤] Chomsky (1976) ,Leftness Condition (ئەگەر بەپیتی لاتینیی بنووسین، ئەوا مەرجەکە بۆ کوردیی دەبێت بە مەرجیی لای ڕاست (وەرگێڕ)

[٣٤٥] Variable

[٣٤٦] Antecedent

[٣٤٧] Koopman/Sportiche (1981), Brody (1984), Safir (1984), and Bijection Condition Higgingsbotham (1984),

هەر ئۆپەراتۆرێك[348] دەبێت تەنها یەك ڤاریابڵ لە شوێندا ببەستێتەوەو هەر ڤاریابڵێك بەتەنها لەلایەن ئۆپەراتۆرێكەوە بەسترابێتەوە.

116-a) His mother loves John:

c) Who loves his mother?

d) * Who does his mother love e ?

e) Everyone loves his mother.

f) * His mother loves evryone.

g) * His mother loves John.[349]

لە (١١٦) د،ف،گ) دا کەرەستەکانی „John“، „evryone“، „Who“ فرێزی ناویی جوڵێنراون (کوانۆرەکانن[350]) و "مەودای کاریگەرێتییان"[351] یان SS دەگرێتەوە، وەك لە (١١٦) د) دا، یان LF دەگرێتەوە، وەك لە (١١٦) ف، گ) دا.

ڕستەی (١١٦) س) بۆیە ڕێپێدەدرێت، چونکە لەم ڕستەیەدا ڤاریابڵێك (گۆڕدراوێك، هەرامەکییەك) لەلایەن ئۆپەراتۆرێکەوە بەستراوەتەوە.

117- Who$_i$ t$_i$ loves his$_i$ mother?




لەڕستەی (١١٤(د)) دا شوێنپێی بزوێنەرەکە لە جێی بەرکارێکدایە. ئێستا ئەو جێناوە لەلایەن ئەو ئۆپەرتاۆرەوە بەستراوەتەوە. بۆیە ئەو جێناوە بەستراوەیە ڤاریابڵێکە. دوای ئەمەیش ئەو جێناوە ناتوانێت لە پێکهاتوویەکی پەڕینەوەی گچکەدا ئەو شوێنپێیەی بەرکارەکە وەچەئاڕاستە بکات. بۆیە ئەم شوێنپێیەیش بە هەمان ئۆپەراتۆرەوە بەستراوەتەوەو بەهۆی ئەمەیشەوەیە، کە مەرجی (١١٥) بڕیندراربووە.

[348] Operator (مەبەست لە "بزوێنەر" کارکەرێکە، کە فەرمانەکان ئاڕاستەدەکات و جێبەجێکردنیان دەبزوێنێت.)؛ ئەمە جیاوازە لە "هەرامەکیی".

[349] نموونەکان هی Speas (1986) ن.

[350] Quantor

[351] Einflußbereich

118-- * Who does his mother love t ?




با ئێستایش لەم ڕستانەی خوارەوە وردببینەوە، بۆ ئەوەی بزانین، زمانی کوردیی چۆن بە یاریدەی پێوەلکاندن و پرۆسەی بەجێناوکردنی لکاندنی لە ′V دا، بە واتا لە ڕستەدا خۆی لەو کێشانەی سەرەوە دەربازدەکات.

١١٩- (ا) [ دایکی ئازاد] [ئازادی خۆشدەوێت]].

i j j i

(ب) * [دایکی] [ ئازادی خۆشدەوێت]] . (بە واتای "دایکی ئازاد ئازادی خۆشدەوێت".)

j i j

(پ) [کێ] [ ئازادی خۆشدەوێت]] ؟ (ئەگە پرسیارەکە، پرسیاری ڕستەی (ب) بێت، ڕستەی پرسیارەکە ڕاست نییە)

(ت) * [دایکی ئازاد] [(pro)] کێ ی خۆشدەوێت]]

i i i j

١٢٠- (ا) [ئازاد [ دایکی [ t خۆشی دەوێت]]]. (بەواتای: دایکی ئازاد ئازادی خۆشدەوێت.)

i i i j i

---

Speas (1986)

[ کێ [دایکی [ t خۆشی دەوێت]]] ؟ (بە واتای: کێیە، ئەوەی دایکی خۆشیدەوێت؟)
i i i j I

نەخشەو شێوەی دروستەیی (١١٩) پ) و بەتایبەتیی (١٢٠) ب):

121-a)*




b)




وەك ئێمە بەم زووانە بۆماندەردەکەوێت و پێیدەزانین، ڕستەکانی (١١٩) ب، د) لەبەرئەوەنییە، ڕێیان پێنادرێت، چونکە ئەم ڕستانە لەسەر ئاستی لۆژیکی ئەو جۆرە جولاندن و ئۆپەراتۆرانەیان تێدایە، کە ڕێیانپێنادرێت، بەڵکو لەبەرئەوەیە، کە ڕەگەزی "Q W„ (وشەی پرسیار) لەو ڕستانەدا بە هەڵە لەگەڵ هەندێك کەرەستەی سەرەتاییدا هاونیشانەیە، کە نیشانەی تایبەتیی جیاوازیان هەڵگرتووە، وەك بۆ نموونە: [+definit ] وە ]definit -[. کەواتە لێرەدا ڕێسای ڕەگەزە بۆشەکان بریندار نەکراوە.

ڕێسای ڕەگەزەبۆشەکان داوای ئەوەدەکات، کە دەبێت گشت ڕەگەزەبۆشەکان توند/تەواو حوکم کرابێتن[٣٥٣]. بەم جۆرە ئەم ڕێسایە ڕوونیدەکاتەوە، بۆچی دەرهێنان لە جێی بکەر، بە پێچەوانەی دەرهێنان لە جێی بەرکارەوە، ڕێپێنەدرێت (بڕوانە: ١١٧ و١١٨ ). پێچەوانەو دژی لەم چەشنە، لە زمانەکانی تردا زۆرن و لە کوردیدا نین؛ ئەم ڕستانەی لای خوارەوە بەڵگەن بۆ ئەمە.

١٢٢- (ا) ئازاد پرسی، کێ کێی کوشت؟
(ب) پێم ناڵێیت، کێ لە کێی دا؟

لە ئەنجامی ئەو داتایانەی سەرەوەدایە، بە ڕاستی دەزانم، کە ڕستەکانی سەرەوە ڕێسای ڕەگەزە بۆشەکانیان بریندار نەکردووە.
با ئێستایش بگەڕێینەوە سەر ڕستەی (١٢١) ب): لەناو V´2 هیچ یاسایەك بریندارنەکراوە. بۆیە ئەم ڕستەیە ڕێپێدەدرێت. لەم ڕستەیەدا وشەی پرسیارەکە لەڕێی هاونیشانەکردنێکی ڕاستەخۆوە پێویستییەکانی لایەنەبابەتییەکان و پێدانی دۆخی ڕێزمانی جێبەجێدەکات و دەهێنێتەدیتن. هاونیشانەکردنی ئەم کەرەستەسەرەتاییەی نیشانەتایبەتییەکانی "کەسی سێ هەمی تاك و نادیار"[٣٥٤] ی هەڵگرتووە، لەگەڵ کەرەستەسەرەتاییەکانی تری ڕستەکەدا دەگونجێت و دەشێت لەگەڵ یەکترییدا هاونیشانە بکرێن. چونکە ئەو کەرەستە سەرەتاییانەی لەگەڵ ئەودا هاونیشانەن، هەمان نیشانەی تایبەتیی و نیشانەی ڕێزمانییان هەیە. بە پێچەوانەی ئەمەوە، ئەم چەشنە ڕستانەی لای خوارەوەی زمانی کوردیی ڕێیانپێنادرێت، چونکە ئەو چەشنەڕستانە هاونیشانەکردنی وەهایان تێدایە، کە زمانی کوردیی ڕێیانپێنادات.

١٢٣- *[ کێ دایکیان [ t خۆشیان دەوێن]] (بەواتای: کێن ئەو کەسانەی، کە دایکیان خۆشیان دەوێن؟)
i i i i j !

پڕاوپڕ بە پێی ئەم ڕاستییانە، زمانی کوردیی بەگوێرەی پەیوەندییە دروستەییە ئەندازیارییەکان[٣٥٥] بکەر لە بەرکار جیادەکاتەوە. لە ڕستەدا بکەر پێش ئەوانە دەکەوێت، کە

[٣٥٣] بڕوانە: Chomsky (1981), Huang (1982), Longobardi (1982), Pesetzky (1983), Kayne (1984), Aoun (1984),Lasnik/Saito (198)

[٣٥٤] [ -definit ]

[٣٥٥] konfigurationell

بکەر نیین. ئەمەیش پشتی شیکردنەوەی SOV ی زمانی کوردیی دەگرێت و دەڵێت، کە جۆرە ئازادەکانی[٣٥٦] ڕیزبوونی وشە لەسەر ئاستی ڕووکەش SS، لە ڕێی بۆ زیادکردن و لکاندن و هەڵواسیینەوەو لەڕێی جێگۆڕکێوە، بوونەتە دروستەی هەڵگوێزراوی ڕستە. ڕاستیی و بەڵگەی دییکە نیشانیدەدەن، کە زمانی کوردیی دروستەی ئەندازیاریی بەپلەوپایە[٣٥٧]ی نییە، بەڵکو دروستەیەکی تەختی[٣٥٨] هەیە. ئەمانەیش لەم بەشانەی خوارەوەدا دەخرێنە بەردەستتان.

بەڵگەکان لە بەرژەوەندیی دروستەی تەختدان[٣٥٩]:

(ا) بوونی یاسای "لەبریدانان بە هەروەها ... یش" „do-so-Substitution" (بڕوانە (١٠٦))، کە فرێزی کردار وەك وەچە پێکهاتەیەکی تاك و تەنها شییەکاتەوە، دەریدەخات کە فرێزی کردار دەتوانێت وەچەپێکهاتەیەکی جیاو سەربەخۆ نەبێت.

124-a) Mary wrote a book carefully, and Kate did so too.
b)Mary wrote a book and Kate did so a dissertation.

ڕستەی (١٢٤) نییشانیدەدات، کە نەك بەتەنها قرتاندنی فرێزی کردار ڕێزماندروستە، بەڵکو قرتاندی فرێزی ناوییش لە زمانی کوردییدا ڕێزماندروستە. ئەمە نیشانەیەکە بۆ ئەوەی، کە زاری سلێمانی دروستەی تەختی هەیە.

١٢٥- (ا) ئازاد نامەیەکی بەپەلە نوسیی و ئارامیش هەڵبەستێك.
(ب) ئازاد نامەیەکی بەپەلە نوسیی، هەروەها ئارامیش.

(ب) بکەر، ناتوانرێت لەڕووی دروستەی ئەندازیارییەوە لە بەرکار (ی ناوەکیی ڕاستەوخۆ) جیابکرێتەوە. چونکە جێناوە خۆییەکان[٣٦٠] دەتوانرێن بە بکەریش و بە بەرکاریشەوە ببەسترێنەوە. ڕستەی (١٢٦)، بۆ نموونە، دوو واتاییە[٣٦١].

---

٣٥٦ Variationen

٣٥٧ hierarchische Struktur

٣٥٨ flache Struktur

٣٥٩ لەبەرئەوەی گشت پرۆژەکانی ڕستەی کوردیی لە ڕەگەزی کردارن، ئەو نموونەو بەڵگانەی لەبەرژەوەندیی دروستەی تەخت هەن و دەهێنرێنەوە، نرخێکی هێندە گرنگیان نییە؛ چونکە ڕەگەزە کردارییەکانی ڕستە کاریگەرێتیی زۆربەی زۆری مەرجەکانی ڕێزمانی بەرهەمهێنان و گواستنەوە لە ڕێزمانی کوردییدا سست دەکەن (وەرگێڕ)

١٢٦- نەوزاد  سیروانی  لە ماڵەکەی خۆیدا کوشت.
(ا) نەوزاد  سیروانی لەماڵەکەی (نەوزاد) خۆیدا کوشت.
(ب) نەوزاد  سیروانی  لە ماڵەکەی (سیروان) خۆیدا کوشت.

لێکدانەوەی لەم چەشنە، لە باری ئاساییدا، بەیاریدەی بۆزیادکردن و لکاندن لادەبرێن و چارەیاندەکرێت.

١٢٧- نەوزاد  سیروانی لەماڵەکەی خۆیدا  کوشت.
نەوزاد  لەماڵەکەی خۆیدا سیروانی کوشت.
V′  V′  V′

١٢٨- خشتەی دروستەیی و ئەندازیاریی ڕستەی (١٢٧):




(پ) وەك لە زمانی هەنغاریدا[٣٦٢]، هەڵبژاردن و جیاکردنەوەی بکەر دەتوانێت کاریکاتە سەر لێکدانەوەی بەرکار.

١٢٩- (ا) سیروان  نەوزادی کوشت.  (Agent-Patient)
(ب)  خەفەت  کوردی کوشت.  (Theme-Experience)
(پ)  عارەق  نەوزادی کوشت.  (Idiom)

---

[٣٦٠] Reflexiva, z.B. Reflexivpronomen

[٣٦١] ambig

[٣٦٢] بڕوانە: Kiss (1981, 1985)

(ت) بکەرو بەرکار لە زمانی ئینگلیزیدا وەکیەك نیین؛ ئەم ناوەکیەکییەی بکەرو بەرکار لە زمانی ئینگلیزیدا رێنادات، بکەر لە جێگاکەی دەربهێنرێت و بگوێزرێتەوە بۆ شوێنێکی تر.

130-a) Who did you say that they called in e first?
i i

b)* Who did you say that e went in first?
i i

(ج) بە پێی گریمانەی جوڵاندنی وشەی پرسیار لەسەر ئاستی لۆژیك دەبێت رستە کوردییەکەی (١٣١/١٣٠) رێپێنەدرێت. بەڵام رستەکە رێزماندروستەو راستە. بۆیە زمانەوان دەتوانێت بڵێت، کە زاری سلێمانی زمانێکی شێوەئەندازیاریی نییە.

١٣١- شیرین پرسیی، کێ پەروینی خۆشدەوێت.

(چ) کە زمان شێوەی ئەندازیاریی هەیە، تا رادەیەك جیهانیی[٣٦٣] یە. ئەو بەڵگانەی، لە سەر ئاستی قووڵ بکەر لە رووی دروستەییەوە لە بەرکار جیادەکەنەوە، بەهێزترن لەو بەڵگانەی ریزبوونی ئاسۆیی ئارگومێنتەکان لەسەر هێڵێك دەسەلمێنن. ئەگەر (VP) V´ ی کوردیی وەچەپێکهاتەیەك بێت یان نا، تا ئێستایش هەر پرسیارێکی کراوەیە. لەبەر ئەمە زمانەوان دەتوانێت وەهای دابنێت، کە V´ لە زاری سلێمانیدا وەچەپێکهاتەیەکی ناوەندییە[٣٦٤] و وەچەپێکهاتەیەکی تەواو نییە. زمانانێکی زۆر، کە نیشانەی تایبەتیی دروستەییان هەیە، دەتوانرێن لە ناو زمانەکاندا بدۆزرێنەوە. فرێزی کردار VP، بۆ نموونە، لە زمانی نۆرڤێگیی[٣٦٥] و یابانیی[٣٦٦] دا پرۆژەیەکی ناوەندییە، کە نەدەتوانرێت بقرتێنرێت و نە بگوێزرێتەوە.
پەیوەست بەمەوە، هەڵسوکەوتی فرێزی کرداری زمانی کوردیی جیاوازە. ئەمە واتای ئەوەیە، کە رستەی زمانی کوردیی کردارو کات و کەسی (Verb and INFL) وەك سەرێکی رێزمانیی لێکدراوی[٣٦٧] هەیە. بە پێی ئەم بیرکردنەوەیە، فرێزی کردار VP بۆ کات و کەس

---

universell [٣٦٣]

Zwischen-Konstituente [٣٦٤]

Taraldson (1982) [٣٦٥]

Fukui (1986) [٣٦٦]

kompositioneller Kopf [٣٦٧]

وەچە پێکهاتەیەکی ناوەندییە وە بۆ کردار گەورەترین پرۆژەیە. چونکە ڕەگی کردارو INFL وەچەپێکهاتەی کات و کەس [٣٦٨] بەیەکەوە سەرێکی لێکدراوی وەها دروستدەکەن، کە کەرەستەسەرەتاییەکانی، هەر یەکەیان بەتەنها، حوکمی دۆخی ڕێزمانیی دەکات. ئەمە پێشەکیی پێماندەڵێت، بۆچی دەتوانرێت هەردوو ئارگومێنتەکە (ناوەکیی و دەرەکیی) لە جێگاکانیانەوە دەربهێنرێن و بگوێزرێنەوە، چونکە فرێزەناوییەکەی بکەر لەلایەن کات و کەسەوە بەڕاستەقینەیی حوکمی دەکرێت[٣٦٩]. ئەم ئەنجاملێکدانەوەی دواییم لەگەڵ هیپۆتیزەی شێوە ئەندازیارییەکە ڕوونیدەکەنەوە، بۆچی زمانی کوردیی دیاردەی زمانە بکەرە خراوەکان (دەرنەبڕاوەکان) [٣٧٠] نیشاندەدات.

ئەم ئەنجاملێکدانەوەیە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی، کە گشت پرۆژەکانی نێوان V´ ەکان لە ڕەگەزی V ن و کە ئەمە پەیوەندییەکانی هاونیشانەی ڕاست و حاڵەتەکانی دەرهێنان لە جێگەی بکەرو بەرکار دەڕەخسێنن و ڕێیانپێدەدەن. چونکە وەچەپێکاتەی کات و کەس وەك بەشێکی کردار دەتوانن، بۆ نموونە بەسەر، V´ دا حوکمی ڕێزمانیی ئەو فرێزەناوییەی بکەر بکات، کە لەگەڵیدا لە خەسڵەتی کەس و ژمارەدا هاونیشانەیە. هەڵسەنگاندن و بیرێکی تر، کە ڕەنگە بەم ڕوونکردنەوانەوە پەیوەستبن، جیاکردنەوەی چەشنەکانی زمانن[٣٧١]. یەلینێك "زمانە ئارگومێنت فەرهەنگیی[٣٧٢]" ەکان لە زمانەکانی تر جیاکردووەتەوە: ئەو زمانانەی "فرێزی ناویی فەرهەنگیی" بەرجەستەکراوو بەدیهێنراویان[٣٧٣] هەیەو ئەو زمانانەی "ئارگومێنتی جێناوییان[٣٧٤]" هەیە، کەواتە ئەو زمانانەی، کە تیایاندا جێناوەلکاوەکان[٣٧٥] (کەسی زەنگین) مەرج و پێویستییە بابەتییەکانی کردار بەجێدەهێنن، دوایی تیایاندا فرێزەناوییە فەرهەنگییە تەواو پڕەکان[٣٧٦] بۆ (ڕستەکان) زیاددەکرێن. لەم شیکردنەوەیەدا جێناوی لکاوی بکەر جێناوێکە، لە شوێنی ئارگومێنتێکدایە. بە پێی ئەم شیکردنەوەیە

---

[٣٦٨] کرداری زمانی کوردیی لە ڕەگ و کات و کەس دروستبووە؛ ڕەگی کردارو کات بەیەکەوە قەدی کردار دروستدەکەن وە قەدی کردارو کەس کرداری تەواو دروستدەکەن. ئەمە وەك پێشەکییەك بۆ ئەو کردارانە دەخوات، کە یەك کاتیان هەیەو خاوەنی کاتی لێکدراو نیین.

[٣٦٩] Echt regiert

[٣٧٠] pro-drop-Sprachen

[٣٧١] Sprachtypologie von Jelinek (1984:43ff)

[٣٧٢] lexical Argument Sprachen

[٣٧٣] manifest vorhandene lexikalische NPs

[٣٧٤] Pronominal-Argument-Sprachen

[٣٧٥] Klitikpronomina

[٣٧٦] volle lexikalische NPs

پێدانی ڕۆڵی بابەتانەی بکەر لە دروستە مۆرفۆلۆژییەکەی کرداردا جێبەجێدەکرێت[277]. بە پێچەوانەی جێناوی لکاوی بکەرەوە بەرکار نیشانینادات، ئەگەر بەرکار لە ئاستی بنەڕەتدا وەك جێناوی لکاوی بەرکار بەرهەمهێنرابێت[278] یان نا. کەواتە فرێزەناوییە فەرهەنگییەکەی بەرکار لە شوێنی ئارگومێنتێکدایەو جێبەجێکردنی ڕۆڵی بابەتانەی بەرکار لە دروستەی سینتاکسدا جێبەجێدەکرێت و دێتەدیتن.

ئەگەر ئەم شیکردنەوەیەی زاری سلێمانیم ئامانجی ڕاستی پێکابێت، ئەوا زاری سلێمانیی بە پێی Saturation parameter ی سپییس[279] و گونجاو لەگەڵ جیاکردنەوەی چەشنەکانی زمانی ساکسۆن[280] نەك بەتەنها "زمانێکی پرۆژەفەرهەنگیی[281]" یە، بەڵکو "زمانێکی پرۆژەسینتاکسیی[282]"شە. ئەم شیکردنەوەیە ڕێ بە ڕوونکردنەوەی زۆرتر و گەلێك گرنگ دەدات. لەبەرئەوەی مەرج و پێویستییە بابەتییەکانی کردار لە V′ دا جێبەجێدەکرێن و دێنەدیتن، دەشێت و دەیشکرێت، کە بکەر، بۆ نموونە، کاریکاتە سەر لێکدانەوەی بابەتانەی[283] بەرکار + کردار یان بەرکار+ کردار کاریکەنە سەر لێکدانەوەی بابەتانەی بکەر. لەمەیش دەتوانرێت زۆر فرێزی ناویی بکەری فەرهەنگیی[284] بە دروستەیی حوکمی دۆخی ڕێزمانیی بکرێت.

لەگەڵ ئەمەیشدا من لەم کارەمدا زاری سلێمانیی وەك زمانێکی پرۆژەسینتاکسی شیدەکەمەوە. چونکە کردارو کات وکەس ئەو داڕشتانەی ڕستەمان دەدەنێ، کە لەگەڵ بۆچوون و لایەنی تیۆریی گچکەی[285] تیۆریی حوکمکردن[286] و بەستنەوە یەکدەرنەوەو گونجاون. مەرج و پێداویستییەبابەتییەکان، بۆ نموونە، لە ناو V′ دا جێبەجێدەکرێن. لەم داڕشتەیەدا فرێزەناوییە فەرهەنگییە تەواو پڕەکان بە دروستەیی حوکمی دۆخی ڕێزمانیی دەکرێن. ئەمە ڕوونیدەکاتەوە بۆچی، پارامێتری ئاراستەی پێدانی دۆخی ڕێزمانیی ڕێنادات، کە فرێزی ناویی بکەر بخرێتە پشت بەشی کردارەوە. لەئەنجامی ئەوەی، کە گشت پرۆژەکانی

---

[277] بڕوانە: Speas (1986:195ff)

[278] basisgenerierte Klitikpronomina

[279] Speas (1986:208)

[280] Saxon (1986)

[281] lexically-projected-language

[282] syntactically-projected-language

[283] thematische Interpretation

[284] lexikalische NP-Subjekt

[285] modularer Aspekt

[286] Chomsky (1981)

V´ ەکان لە ڕەگەزی V ن، کەرەستەسەرەتاییەکانی پێکهاتووی ڕستە بۆیان هەیە لەگەڵ بکەرو لەگەڵ بەرکاری سەرەکیی[٣٨٧] هاونیشانە بن. کەوابێت، ڕستەی فرەواتا[٣٨٨] ی لەم چەشنانەی لای خوارەوە گەلێك جار بەرەو ڕوومانەدەبنەوە.

١٣٢- ئازاد داوای لە ئارام کرد، کە (pro) بڕوات.
(ا) ئازاد داوای لە ئارام کرد، کە ئازاد خۆی بڕوات.
(ب) ئازاد داوای لە ئارام کرد، کە ئارام بڕوات.

لە کۆتاییشدا دەڵێم، کە ناوەکان[٣٨٩]، هەر وەك چۆن سپییس ئامارژەی بۆکردوون، دەتوانن ئارگومێنت یان گۆڕەر[٣٩٠] یان گرێدەر[٣٩١] یان هەڵواسراوو لکێنراو[٣٩٢] یان بەشی کردار[٣٩٣] بن.

١٣٣- ساکار نەسرینی خۆشدەوێت.
١٣٤- خوشکەکەم ساکار، (pro) نەسرینی خۆشدەوێت.

**کورتەو پوختەو ئەنجاملێکدانەوە:** زاراوەی "وەچە پێکهاتەی ناوەندیی[٣٩٤]" ئەو ڕاستییە دەردەبڕێت، کە گشت پرۆژەکان لە ڕەگەزی Vن. جێناوەلکاوەکان (جێناوی لکاوی بکەرو جێناوی لکاوی بەرکار) ناتوانرێن وەك ئەو ڕەگەزانەی کردار دەیانهێنێتە دیتن، سەیر بکرێن. وەچەپێکهاتە دیارییکردنەکانی کردار لەناو V´ دا جێبەجێدەکرێن. جیاوازیی نێوان ئارگومێنتی دەرەکیی و ئارگومێنتی ناوەکیی لە نەخشەی ئەندازیاریی بە پلەدا نیشاندراون و خراونەتەڕوو. ڕەگەزەکان و وەچەپێکهاتەکانی ڕستە لە شوێنە تایبەتییەکانیاندا لە سەر ئاستی قووڵ DS لە بنەڕەتدا بەرهەمهێنراون[٣٩٥]. ڕیزبوونی، تازە ڕادەیەك ئازادی، وشەکان لە ڕستەدا لەسەر ئاستی ڕووکەش کاردانەوەو بەرهەمی

[٣٨٧] Matrixsatz

[٣٨٨] mehrdeutig

[٣٨٩] Nomina

[٣٩٠] Modifikator

[٣٩١] Binder

[٣٩٢] Adjunkte

[٣٩٣] Prädikate

[٣٩٤] Zwischenkonstituente

[٣٩٥] basisgeneriert

بۆزیادکردن و هەڵواسین و لکاندن و جێگۆڕکێن. ئەم جۆرە ئازادەی ڕیزبوونی وشەکان لە ڕستەدا بەتەواویی لەگەڵ دروستەی شێوە ئەندازیارییەکاندا ناگونجێت و ڕێکانکەوێت.

## یاساکانی هەڵگواستنی فرێز:

یاساکانی لە (١) دا پێشکەشکران، بریتین لە ژمارەیەك لە یاساکانی هەڵگواستنی فرێز، کە "مارکەی فرێزەکانی بنەڕەت"[٣٩٦] بەرهەمدێنن. دەبێت لەڕێی وەلامدانەوەی ئەم دوو پرسیارەوە تەواویی و پراوپڕیی مۆدێلەکە هەڵبسەنگێنین و تاقیبکەینەوە: ئایا مۆدێلەکە هەر زنجیرە وشەیەکی ڕێزمانیی بەرهەمدێنێت و ئایا دروستەیەك یان چەند دروستەیەك دەخاتەپاڵ هەر یەکێك لەو زنجیرە وشانە؟ بۆ وەلامدانەوەی پرسیارەکان و بۆ ئەم مەبەستەیش دەستدەکەم بە شییکردنەوەی ئەم ڕستانە.

١٣٥- پەخشان گوڵدانەکەی لەسەر مێزەکە دانا.
١٣٦- ئازیز شووتیەکەی خستە ناو کانییەکەوە.

بۆ ئەوەی بتوانم ئەو دروستە ڕووکەشییانەی، خراونەتەپاڵ ڕستەکانی (١٣٥) و (١٣٦)، بەرهەمبهێنم، وەهای دادەنێم، کە زاری سلێمانی یاساکانی (١) ی هەیە. ئێمە دەزانین، کە وەچەدیارییکردنی ئایتمەکان پەیوەستە بە زنجیرەی تەواوکەرە دەستەخوشکەکانەوە[٣٩٧]، کە کردار ڕێیاندەدات یان ڕێیاننادات، بێن. بۆ نموونە، کرداری <خستن> ڕێ بە فرێزێکی پێشناویی شوێنیی[٣٩٨] لەلای ڕاستی خۆیەوەو و بە ´´N یێك لەلای چەپی خۆیەوە دەدات. کەواتە <خستن> کردارێکە، کە داوای دەقێکی سینتاکسیی[٣٩٩] ´´PP-V-N دەکات. بە پێچەوانەوە، کرداری <دانان> دەقێکی سینتاکسیی PP-V-´´N ی دەوێت.

بەپێی یاساکانی (١) ڕستەکانی (١٣٥) و (١٣٦) تا ڕادەیەك دروستەیەکی قووڵی لەیەکچوویان هەیە. کەواتە دەبێت دروستە ڕووکەشەکانی[٤٠٠] (١٣٧) و (١٣٨) لە دروستە قووڵەکانی[٤٠١] (١٣٩) و (١٤٠) ەوە هەڵگوێزرابێتن؛ ئەم دوو دروستە قووڵە هێشتا پێویستیان بە یاسای مۆرفۆلۆژیی هەیە، بۆ ئەوەی فێرمەگچکەکان[٤٠٢] بگۆڕێن و بیانکەن بە وشە.

---

[٣٩٦] Basis-P-Marker

[٣٩٧] Schwesterkomplement

[٣٩٨] eine lokative PP

[٣٩٩] syntaktischer Kontext

[٤٠٠] Oberflächenstruktur

[٤٠١] Tiefenstruktur

١٣٧- دروستەی ڕووکەشی ڕستەی (١٣٥) لە نەخشەی ئەندازیارییدا.




١٣٨- نەخشەی ئەندازیاریی دروستەی ڕووکەشیی ڕستەی (١٣٦)




١٣٩- نەخشەی ئەندازیاریی دروستەی قوڵیی ڕستەی (١٣٧)



١٤٠- نەخشەی ئەندازیاریی دروستەی قووڵیی ڕستەی (١٣٨)




ئەو ڕستانەی، من هەوڵدەدەم، بە یاسا پەسنیانبکەم، دروستەبەندن، بەواتا پابەندی دروستەن[٤٠٤]. بۆیە یاساکان بەستراون بە وەچەپێکهاتەوەو بۆ وەچەپێکهاتەکانن نەك بۆ ڕگەزەکان. یەککەم پرسیار لەم چێوەیەدا لەبارەی کێشەی ڕیزبوونی وشەوەیە، بە واتا سەبارەت بە شوێنەکانی کەرەستەسەرەتاییەکانە، لە ڕستەدا. گفتوگۆو لێدوانەکانی داهاتووم بەچڕیی لەسەر دروستەی قووڵ دەبێت. ئەم کێشانە، کێشەکانی یاساکانی هەڵگواستنی فرێزەکانن لەگەڵ کێشەی شوێن و ڕیزبوونی وشەکان لە ڕستەدا. ئەو پرسیارە کراوانەی، کە لە ڕستەدا سەر بە سەرەڕێزمانییەکان و ڕیزبوونی وشەن، ئەمانەن:

کام کەرەستەسەرەتاییانە لە دروستەی قووڵدا هەن؟
چۆنیەتیی ڕیزبوونی ئەم کەرەستانە لە دروستەی قووڵدا (کەرەستەکان چۆن ڕیزبوون؟):
کام یاسایانەن ئەو جۆرە ڕیزبوونانەی ڕگەزەکان بەرهەمدێنن؟
کام سنوورە دانراوو دیارییکراوانە بۆ یاساکان هەن؟

## یاساکانی دروستەی فرێزە هەڵگوێزراوەکان:

لەم بەشەی کارەکەمدا لە کێشەکانی پێخهاتەی بنەڕەت[٤٠٥] دەکۆڵمەوەو دەیپشکنم؛ کێشەکانیش کێشەی یاساکانی دروستەی فرێزەکانن لەگەڵ کێشەی شوێنی وشەکان و

---

[٤٠٣] بۆ چۆنییەتیی ڕیزبوونی وشە لە ئاستی بنەڕتدا/لە ئاستی قووڵدا، چەند لێکدانەوەیەك هەن، پاشان گفتوگۆیان لەسەردەکەم و هەڵیاندەسەنگێنم و تاقیاندەکەمەوە: ئازیز شووتی ناو کانیی خستیی/ئازیز ناوکانی شووتیی خستیی ...

[٤٠٥] Basiskomponente

ڕیزبوونیان لە ڕستەدا. یاساکانی دروستەی فرێزەکان بۆیە پێویستن، بۆ ئەوەی بتوانیین ڕیزبوونی وەچە پێکهاتەکان دیاریی و دەستنیشانبکەین.

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو وەچەپێکهاتانەی سەر نیین و بۆ ڕوونکردنەوەی پەیوەندییەکانی ئەو وەچەپێکهاتانە دۆخی ڕێزمانیی و تیۆریی بابەتانە زۆر گرنگن. ڕکێفەکانی دەستەڵاتی پێدانی دۆخی ڕێزمانیی و بەخشینی بابەتانە دەریدەخەن، ئەگەر ڕکێفی دەستەڵاتێکی وەك ڕکێفی دەستەڵاتی دۆخی ڕێزمانیی[٤٠٦]، بتوانرێت ببردرێت و ببچرێنرێت یان نا. بۆئەوەی بتوانم ڕیزبوونی وەچەپێکهاتەکانی، کە سەرنیین، پەیوەست بە سەرەکانەوە ڕژنماسا ڕوونبکەمەوە، پارامێتری ئاراستەو ڕووی دۆخی ڕێزمانیی پێدان و بەخشینی بابەتانە بەکاردەهێنم. لە لێکۆڵینەوەکانمدا بەتایبەتیی واتای پارامێتری سەرکۆتاییمان بۆ دەردەکەوێت. یاسا هەڵگوێزراوەکانی دروستەی فرێزەکان (١) ئەو دروستەقووڵانەمان بەدەستدەخەن، کە چاوەڕێیاندەکەین. ئەم جۆرە یاسایانە گەلێك پێویستیی جێبەجێدەکەن: دەریدەخەن، کام کەرەستەسەرەتاییانە بەزۆرو خورتەکیین و کامانەیان بەزۆرنیین و دەتوانن بە سەرپشکیی هەبن؛ دەریدەخەن، کام ڕیزبوونانەی کەرەستەسەرەتاییەکان بەرامبەر سەرەڕێزمانییەکانیان بەزۆر نابن و سەرپشکیی دەبن. تیۆری $X'$ [٤٠٧] ڕوونیدەکاتەوە، کە (VP) $V'$ لەگەڵ کردارێکدا بەزۆرەو لەگەڵ کەرەستەی سەرپشکیی تردا بۆ فراوانکردن لەبارە. وەهایشی دادەنێم، کە (I) N, V, A, Comp, INFL گشتیان سەر بەم یاسایەن. بەپێی ئەم ڕوونکردنەوەیە، گشت ئەو کەرەستانەی بەزۆرن و هەموو ئەو کەرەستانەی سەرپشکیین لە یاساکانی بنەڕتدا -لەیاسابنەڕەتییەکانی دروستەی فرێزەکاندا لە ئاستی قووڵدا[٤٠٨]- هەن. لە سایەو سێبەری ئەم گریمانەیەدایە، کە من بۆ هەموو یاساکانی دروستەی فرێزەهەڵگوێزراوەکان شابلۆنێکی (قاڵبێکی) بنەڕەتیی دەهێنمەئاراوە. هەر وەك ڕوونکراییەوە، هەندێك چشت وابەستەی ڕێسای لێکدانەوەی تەواون. لە ڕێی ئەوەوە، کە ئێمە فەرهەنگمان لە بنەڕەتدا هەیە، دەتوانیین ئەو زانیارییانەی تریش هەڵبگوێزیین، کە بۆ یاساکانی دروستەی فرێزەکان گرنگن. فەرهەنگەکە دەریدەخات، کام کەرەستانە وەچەدیارییکراون[٤٠٩]، بەواتاو بەتایبەتیی لە ڕووی واتاو سیمانتیکەوە هەڵبژێرراون و جیاکراونەتەوە[٤١٠]. هەندێك ڕەگەز، تەواوکەر هەڵدەبژێرن و جیایدەکەنەوە، بەبێ ئەوەی پابەند بەوەبدەن، چۆن شوێنی ئەو تەواوکەرانە بەکەرستەفەرهەنگییەکان پڕدەکرێتەوە. بۆ نموونە، Comp ، INFL هەڵدەبژێرێت و جیایدەکاتەوە وە INFL یش VP هەڵدەبژێرێت و

---

[٤٠٦] Kasusdomäne

[٤٠٧] Chomsky (1970), Jackendoff (1977)

[٤٠٨] Basis-PS-Regeln

[٤٠٩] subkategorisiert

[٤١٠] selektiert

جیایدەکاتەوە. ڕەگەزی دیکە وابەستە بە ئایتمە فەرهەنگییەکانەوە دروستەی تەواوکەری دیکە هەڵدەبژێرن وجیایاندەکەنەوە. ئەمە لە (VP) ′V ڕەچاودەکرێت. کرداری <قەناعەتپێکردن> داوای فرێزێکی پێشناوی زگماك[411] و (S) ′V یێك دەکات. بەرامبەر بەمە کرداری <زانین> یەك (′S) ′V ی دەوێت. <دانان> یەك ″N و یەك PP ی دەوێت. کرداری <نوستن> بەڵام تەواوکەرێکی نییە. ئەمە ئەوە دەبەخشێت، کە زاری سلێمانیی ئەم شێوە ئەندازیارییەی هەیە.

١٤١- قەناعەتی بە ئارام کرد، کە (pro) بڕوات.
V V″ N′

١٤٢- باوەڕدەکات، کە (pro) هاتوون.
V V″

١٤٣- گوڵدانەکەی لەسەر مێزەکە دانا.
V PP N″

١٤٤- ئارامی گرت.
V N″

١٤٥- نوست 0 .
V

تێبینیی:

پێشناوە ناڕسەنەکانی، بەشێکی زگماکی کردارن، لە فەرهەنگدا گۆکردنی واتاییان هەیە. بەڵام لە ڕستەسازییدا سەری ڕێزمانیین و حوکمی دۆخی ڕێزمانیی دەکەن. ئەو تەواوکەرانەی کردار (تەواوکەری ناوەکیی ڕاستەوخۆ یان بەرکاری ڕاستەوخۆی کردار یان یەککەم بەرکاری ناوەکیی کردار)، کە بەزۆرن، لە کردارەکە خۆیەوە دۆخی ڕێزمانیی بەرکاریی وەردەگرن. تەواوکەرە ناوەکییە ناڕاستەوخۆکان (یان بەرکاری ناڕاستەوخۆی کردار یان دووهەم بەرکاری ناوەکیی کردار) هەمیشە لەلایەن پێشناوێکەوە حوکمی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاریی ناڕاستەوخۆ دەکرێن. ئەو زانیاریانە ئەمانە دەبەخشن:

---

[411] inhärente PP

(ا) هەر کردارێکی تێپەڕی زاری سلێمانیی بەتەنها یەك ئارگومێنت هەڵدەبژێرێت و جیایدەکاتەوەو بەتەنها حوکمی ڕێزمانیی ئەم ئارگومێنتە دەکات. ئەم ئارگومێنتە یەککەم بەرکاری ناوەکیی کردارە[٤١٢].

١٤٦- من تۆ دەگرم.

(ب) ئەگەر کردارەکە دوو ئارگومێنتی داواکرد، ئەوا تەواوکەرە ناوەکییە ناڕاستەوخۆکە، فرێزێکی پێشناوییەو بەرکاری ناوەکیی دووهەمی کردارە[٤١٣] هەمیشە لە شێوەی فرێزێکی پێشناوییدا دەردەکەوێت.

١٤٧- نەسرین گوڵدانەکەی لەسەر مێزەکە دانا.

(پ) فرێزەپێشناوییەکانی (ب) دوو جۆرن: ئەگەر پێشناوی فرێزەپێشناوییەکە، بەشێکی زگماکی کردارەکە بوو، ئەوا ئەم فرێزە پێشناوییە لە ڕاستیدا دۆخی ڕێزمانیی فرێزی پێشناویی (داتیڤی)، بۆ نموونە ڕێزمانی ئەڵمانییە، و فرێزی پێشناویی ڕاستەقینە نییە. کرداری /پێدان/ داوای بەرکارێکی ڕاستەوخۆ بەرکارێکی ناڕاستەوخۆ دەکات. لە زمانەکانی تردا بەرکاری ناڕاستەوخۆ دۆخە ڕێزمانییەکەی هەمیشە پێشناوە یان خستنەپاڵە؛ لە زاری سلێمانیدا کردارەکە پێشناوە ناڕەسەنەکەی خۆی دەنێرێت بۆ تەواوکەرە ناڕاستەوخۆکەو لەوێ دەبێت بە پێشناوی ڕەسەن و بەرکارە ناڕاستەوخۆکە دەکات بە فرێزی پێشناویی. زمانەوانی کورد پێویستە ئەم فرێزەپێشناوییە لە فرێزەپێشناوییەکانی تر جیابکەتەوە.

١٤٨- (ا) من نامەکەم بە ئازیز دا.
(ب) Ich gab ihm den Brief.

پێدەچێت، ئەو کردارانەی پێشناوی ناڕەسەنیان هەیە، وەك کرداری زمانی ئەڵمانیی بووبێتن و ئەمڕۆ وەك کرداری پێشناویی دەیانناسین. با ڕستەی کردارە تێپەڕو کردارە تێنەپەڕەکانیش تێکەڵاو نەکەین، چونکە ئەمانیش دروستەی هاو تەریب و لەیەکچوویان هەیە. هەردووکیان فرێزی پێشناوییان هەیە؛ ئەمەیش لەبەرئەوەیە، کە کردارەتێنەپەڕەکان

---

[٤١٢] direktes NP-Objekt (Akkusativ)

[٤١٣] indirektes NP-Objekt (Dativ)

لەرووی واتاوە تەواوکـەرێکی ناوەکییـان هەڵنـەبژاردووەو جیایاننەکردووەتـەوە[٤١٤]. (١٤٩) و (١٥٠) باشترین نموونەن بۆ ئەمانە.

١٤٩- (ا) ئازیز نوست.
(ب) ئازیز بەپەلە نوست.

١٥٠- (ا) ئازیز نان دەخوات.
(ب) ئازیز بەدەست نان دەخوات.
(پ) ئازیز لە سلێمانییە.
(ب) ئازیز بەمنی گوت. (پێگوتن)

هەڵبژاردن و جیاکردنەوەی واتایی کردار دەریدەخات، کە زمانەکەمان چەند شوێنێکی لـە ڕستەدا هەیـە. دیارییکردن و دەستنیشـانکردنی ئـەو شـوێنانەو لـەو ڕێیـەوە پێدانـی مـاف دەستووریی بە بوونیان هـەر لـەو ڕێیەوە جێبەجێدەکرێن و دێنـەدیتن، کە پڕدەکرێنـەوە. بەڵام لە ڕاستیدا بەتەنها ئەو شوێنانە بەزۆر پڕدەکرێنـەوە، کە حوکمی دۆخی ڕێزمانیی دەکرێـن. ئێمە لە زمانی کوردییدا، بۆ نموونە، هیچ ڕستەی چاوگییمـان[٤١٥] نییـە. کـرداری تێپـەڕیش بەتەنها یەك جار دۆخی ڕێزمـانیی دەدات. کەواتە دەبێت ئەم شوێنە هەڵگوێزراوانە (شـوێنی بکەرو شوێنی بەرکار) بەکەرەستەی فەرهـەنگیی پڕبکرێنـەوە. شوێنی بـەرکاری ناڕاستەوخۆی کردارە تێپەڕەکان و کردارە تێنەپەڕەکان، هەمییشە شوێنی حوکمێکی دۆخی ڕێزمانیی نییە.
شـوێنی تەواوکـەری سەرپشـکیی حوکمـی دۆخـی ڕێزمـانیی نـاکرێت (بڕوانـە (١٤٩) ب)، (١٥٠(ب). ئەم ڕاستییە ڕوونیدەکاتەوە، بۆچی ئـەو ئارگومێنتانـەی لەم شوێنەدا دەردەکەون، دەتوانن بەتەنـها لـە شـێوەی فرێـزی پێشـناوییدا بـن. پارامێـتری ئاڕاسـتەو ڕووی دۆخـی ڕێزمـانیی دەڵێت، کە تەواوکـەرەکان لـەلای ڕاسـتی سـەرە حوکمکەرەکانیانـەوە دەردەکـەون ؛ ئەمە بەتەنها بۆ پێشناوەکان ناخۆن. وەك لە داهـاتوودا پێیدەزانـین و بۆماندەردەکـەوێت، بـە تەنها فرێزەپێشناوییە زگماگییەکان دەتوانن جێگۆڕکێیان پێبکرێت یان بلکێنرێن بە ڕستەوە. کەواتـە ئـەم چەشـنە فرێزەپێشـناوییانە ئـازادن. بـە پێچەوانـەوە، چەشـنی پێشـناوە نازگماگییەکان ناتوانرێن هەمیشە جێگۆڕکێیان پێبکرێت. لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە ئەو کردارانەی پێشـناوی زگماگیـان هەیـە، لـە ڕووی واتـاوە بـۆ دوو ئـارگومێنت هـەڵبژێردراون و جیاکراونەتەوە؛ کەواتە لە ناو (VP) ´V دا ئەو دوو شوێنەیان بۆ دوو ئارگومێنتەکە هەیە، کە

[٤١٤] semantische Selektion

[٤١٥] Infinitivsätze (Ich möchte fliegen.)

دەبێت بەکەرەستەی فەرهەنگیی پڕبکرێنەوە. کرداره لێکدراوەکەی (١٤١)، وەك ئەم چەشنە کردارانە دەناسرێنەوەو دیارییدەکرێن.
چۆن دروستەی تەواوکەرەکانی یاساکانی دروستەی فرێزە هەڵگوێزراوەکان بە کەرەستەی سەرەتایی پڕدەکرێنەوە؟
ئەمە بەئاسانی لەو ڕێیەوە دەکرێت، کە نیشانەتایبەتییەکانی وەچەدیارییکردن لە فەرهەنگەوە بۆ یاساکانی X´ دەگوێزینەوە. بەپێی نیشانەتایبەتییەکانی وەچەدیارییکردنی ئایتمەکان دروستەی هەر تەواوکەرێکی هەر ئایتمێکی فەرهەنگیی لە فەرهەنگدا دیاریی و دەستنیشانکراوە. تیۆریی X´ داوای ئەوەدەکات، کە دەبێت هەر پرۆژەیەك، کە هی کەرەستەی فەرهەنگیی نییە، سەرێکی هەبێت. بۆیە دەبێت ئەو کەرەستەسەرەتاییانەی بەشێکی یاسادووپاتبووەکانن و نەسەرن و نە تەواوکەرن، لە لایەن ڕێسای لێکدانەوەی تەواوەوە ڕێی دەستووریی بە بوونیان بدرێت.

١٥١- (ا) * پرشنگ سێو دەخوات کاڵ
(ب) * پڕشنگ سێو دەخوات کاڵ

١٥٢- (ا) * پەخشان هەویر دەکات پان
(ب) * پەخشان هەویر پان دەکات

ڕستەکانی (١٥١) و (١٥٢) ڕێپێنەدراون، چونکە ڕێی دەستووریی بە بوونی کەرەستەسەرەتاییەکانی <کاڵ>، <کاڵیی>، <پان> و <پانیی> نەدراوە. بەڵام نیشانیشیدەدەن، کە ڕێپێدانی دەستووریی بەبوونیان لەڕێی کاربەندێتییەوە، گومانی لێدەکرێت. ئەگەر ئێمە ئێستا لەم ڕستەڕێزماندروستانەو واتاشێوەڕاستانەی لای خوارەوە وردببینەوە، بۆمان دەردەکەوێت، کە هەر پرۆژەیەکی نا فەرهەنگیی، بەپێی مەرجەکانی ڕێکخستنی تیۆریی X´، یان لەو ڕێیەوە مافی دەستووریی بەبوونی دەدرێت، کە لە پەیوەندییەکی سەر - تەواوکەر دا یە، یان لەو ڕێیەوەیە ڕێپێدەدرێت کە بووەتە بەشێکی زگماکی کردارەکە.

١٥٣- پەروین سێو بەکاڵیی دەخوات.
١٥٤- نەسرین هەویر پاندەکاتەوە. (بەراوردیان بکە لەگەڵ (١٥١) وە (١٥٢))

سەرەنجامێکی ڕاستەوخۆی ئەم ڕاستییە، پەیدابوونی ژمارەیەکی زۆر لەو وشەلێکدراوانەیە، کە بوون بە وشەی سادەو لەناوفەرهەنگدا تۆمارکراون، وەك <پانکردنەوە>، <سوورکردنەوە> ... هتد؛ ئەم چەشنەوشانە نیشانەتایبەتییەکان و تایبەتمەندییەکیان بە

ڕستەسازیی زمانی کوردیی داوە. هەندێك زانیاریی دیکەمان لە پێکهاتەکانی دیکەی ڕێزمانی کوردییەوە، دەربارەی یاساکانی هەڵگواستنی دروستەی فرێزەکان، دەستدەکەون. ئەوانەیش ڕژێمناسا لەبەشەکانی تری ئەم پەرتووکەدا گفتوگۆیان لەسەردەکرێت.

تیۆریی X´ و تیۆریی فەرهەنگ دەستنییشانیدەکەن، کام کەرەستانە لەنێوان پرۆژەگەورەکاندا دەردەکەون و دەبییەنرێن. ئەم پرسیارانە بەم شێوەیەی لای خوارەوە بۆ لێدوان و گفتوگۆکردن دەخەمەڕوو:

پرۆژە گەورەکان لە چ ڕێکخستنێکدان لەگەڵ یەکتریدا و چۆن لەگەڵ یەکتریدا ڕێکخراون؟

کەرەستە سەرەتاییەکان چۆن لە نێوان پرۆژەگەورەکاندا لەگەڵ یەکتریدا ڕێکخراون؟ کەواتە، چۆن پرۆژەگەورەکان، پەیوەست بە سەری ڕێزمانییەوە، ڕیزبوون؟

## ٢/١-٣-٤) شوێنەکانی وشەو ڕییزبوونی وشە

دەمەوێت بە یاریدەی پەیوەندییەکانی پێدانی لایەنەبابەتییەکان و بەخشینی دۆخی ڕێزمانیی لە بابەتی شوێنەکانی وشە بدوێم و کێشەی ڕیزبوونی وشەکان لە ڕستەدا ڕوونبکەمەوە. بۆ ئەم مەبەستانەیش پەنادەبەمە بەر ستاوڵ و پێسەتسکی.

### ٢/١-٣-٤-١) ستاوڵ Stowell[٤١٦]

ستاوڵ ئەو پەیوەندییانەی بۆ ڕوونکردنەوەی پەیوەندییەکانی پرۆژەگەورەکان لەگەڵ یەکتریدا بەکارهێناوە. ستاوڵ پێشنیازی پارامێتری هاوسێیەتی دۆخی ڕێزمانیی[٤١٧] و ڕێسای بەرگریکردنی دۆخی ڕێزمانیی[٤١٨] کردووە. پارامێترەکە ئەوە دەچەسپێنێت. کە دۆخی ڕێزمانیی بە فرێزێکی ناویی نادرێت، ئەگەر ئەو فرێزەناوییە ڕاستەوخۆ هاوسێی ئەو سەرەڕێزمانییە نەبێت، کە دۆخەڕێزمانییەکەی پێدەدات. ئا لەمەوەیە، کە پاڵێوەری دۆخی ڕێزمانیی وەك مەرجێك بڕیندار دەبێت. زمانەکان جیاواز ئەم پارامێترە دەنرخێنن و بەکاردەهێنن: (ا) هەندێك زمان گوێ نادەن بە مەرجی هاوسێیەتیی بۆ دۆخی ڕێزمانیی. (ب) ئەو زمانانەی بایەخ بەم مەرجەی پێدانی دۆخی ڕێزمانیی دەدەن، یان مەرجی هاوسێیەتیی توند بەکاردەهێنن، وەك زمانی ئینگلیزیی، یان مەرجی هاوسێیەتیی ئارگومێنتەکانیان[٤١٩] هەیە. لەبەر ئەمەیە لە زمانی ئینگلیزیدا نابێت هیچ ئارگومێنتێك لە نێوان ئەو

---

[٤١٦] Stowell (1981)

[٤١٧] Parameter der Kasusnachbarschaft

[٤١٨] Prinzip des Kasuswiderstandes

[٤١٩] لەبارەت Argumentnachbarschaft ەوە سەیری (1981) Den Besten بکە.

سەرەڕێزمانییەی دۆخی ڕێزمانیی دەدات، لەگەڵ ئەو فرێزە ناوییەدا هەبێت، کە دۆخەڕێزمانییەکەی پێدەدرێت.

ڕێسای بەرگریکردنی دۆخی ڕێزمانیی ڕوونیدوکاتەوە بۆچیی ڕستەی ´S لە جەمسەرەوە دانراوە یان هاتووە. بەپێی ئەم داواکردنە، ناتوانرێت بە هیچ ڕەگەزێك یان ´S ێك، کە دۆخی ڕێزمانیی پێدراوە یان پێیدەدرێت، جارێکی تر دۆخی ڕێزمانیی بدرێت. لەبەرئەمە وادادەنرێت، کە ´S ێك ڕستەیەکە، لە شوێنی ئارگومێنتێکدا [420] نییە. ئەم ڕستانەی زمانی ئەڵمانیی ئاشکرا ترین نموونەن بۆ ئەمە.

155- Ich habe es gewußt.

156- Ich habe gewußt, daß sie gewinnen wird.

دەرکەوتنی ´S لەجێیەکی ´A دا لەلای ڕاستی کردارەکەوە، دەبێتەهۆی ئەوەی ئەم ڕێسایە برێندارنەکرێت. ئەمە لە (١٥٦) دا دیارو ئاشکرایە.

## ٢/١-٣-٤-٢) پێسەتسکی Pesetzky [421]

پێسەتسکیش وەك ستاوڵ پەیوەندییەکانی پێدانی دۆخی ڕێزمانیی بۆ دیاریکردنی شوێنی فرێزی ناویی بکەر، پەیوەست بە شوێنی سەرەڕێزمانیی I-ەوە، ڕووندەکاتەوە. بەم جۆرە پارامێتری هاوسێیەتیی دۆخی ڕێزمانیی وەرگیراوەو پەرەی پێسەندراوە، بۆ ئەوەی بتوانرێت شوێنی فرێزی ناویی بکەر دیارییبکرێت. بۆ ئەمەیش زمانی ئینگلیزیی نموونەیەکی چاکە. لە زمانی ئینگلیزیدا مەرجی هاوسێیەتیی دۆخی ڕێزمانیی بۆ پێدانی دۆخی ڕێزمانیی زۆر گرنگە. لەبەرئەوەی دەبێت فرێزی ناویی بکەر لەلاین IN FL ەوە دۆخی ڕێزمانی بکەریی وەربگرێت، پێویستە فرێزە ناوییەکەی بکەر ڕاستەوخۆ لەتەك IN FL ەوە بێت و لەلای چەپییەوە وەستابێت. بەم پێیە داننراوە بە ڕیزبوونی S-O-V داو ڕەزامەندێتیی دەربارەی دروستەی (١٥٧)، وەك ئەنجامێکی دەستنەوتوو، دەربڕراوە.

---

[420] Argumentstselle

[421] Pesetzky (1982)

157-




لەم بەشانەی خوارەوەدا بەڵگەکان بۆ ئەوە دەهێنمەوە، کە ئاڕاستەو ڕووی پێدانی دۆخی ڕێزمانیی و هاوسێیەتیی ئارگومێنتەکانن دانانی ئارگومێنتەکان لە ڕستەکانی زمانی کوردییدا دیارییدەکەن. وا دەردەکەوێت، ئەم شیکردنەوەیە بۆ زمانی کوردیی گونجاوبێت و بێ هەڵەبێت. چونکە (ا) دۆخی ڕێزمانی لە زمانی کوردییدا دروستەبەندەو بەپێی دروستەیەو (ا) چەند ئارگومێنتێك بۆیان هەیە لەنێوان سەرەڕێزمانییەکەو تەواوکەرەکەیدا هەبن (زاری سلێمانیی مەرجی هاوسێیەتیی نییە). ئەمە ئەوە دەبەخشێت، کە مەرجی هاوسێیەتیی، بە پێچەوانەی پارامێتری ئاڕاستەو ڕووی دۆخی ڕێزمانیی بەهێزەوە، زۆر لاوازە. ئەم ڕاستییە دەستکەوتووانە لە نێوان I INFL و فرێزی ناویی بکەریشدا هەن و بەدییدەکرێن. لە تیۆریی X′ و لە پەیوەندیی نێوان سەری ڕێزمانیی و تەواوکەرەکەیدا ئەو ئەنجامە لێکدەدەمەوە، کە جومجومەکانی وەچەدیارییکردنی فەرهەنگیی و مەرجی پێدانی دۆخی ڕێزمانیی زۆر بەوردیی و دروستیی پەسنکردنی شوێنەکانی وشەو ڕیزبوونی وشە لە ڕستەدا بەدەستەوەدەدەن. لەتەکیدا کەرەستە وەك بەڵگە بۆ سەلماندنی ئەوە دەهێنمەوە، کە پارامێتری ئاڕاستەو ڕووی پێدانی دۆخی ڕێزمانیی بۆ ڕیزبوونی وشە زۆر گرنگە. ئەم شیکردنەوەی زمانە، لە گەلێك شیکردنەوەی تری شوێنەکان و ڕیزبوونی وشە لە ڕستەی زمانەکانی دییکەدا دەچێت؛ لەوانە شیکردنەوەکانی کووپمان و هوانگ و ترافیسن[٤٢٢].

لەڕێی ڕوونکردنەوەی ڕیزبوون و سەرەی ئارگومێنتەکانەوە لە نێوان (VP) V′ دا، تێگەیشتنێکی کەم لە بارەی چۆنیەتیی ڕێکخستن و ڕێکوپێکیی دروستەی قوڵەوە بەدەستەوەدەدەم. لەگەڵ ئەمەیشدا هەوڵدەدەم، جۆرەئازادەکانی ڕیزبوونی وشە V - PP ~ V-PP لەو ڕێیەوە ڕوونبکەمەوە، کە دەڵێم یەککەمیان لە دووهەمیانەوە هەڵگوێزراوە. خستنەسەری ئەم وەچەپێکهاتەیە بۆ بابەت و کێشەی ڕیزبوون و شوێنی وشە لە ڕستەدا، پشتگیریی لەو بۆچوون و داواکردنە دەکات، کە زاری سلێمانیی وەك زمانێکی S-O-V شییدەکاتەوە. پاشان بە هۆی بوونی ئەم ڕاستییانەوە، وەچەپێکهاتەی (S (I′′) V′′) تاقیدەکەمەوەو هەڵیدەسەنگێنم. لە ڕێی زیادکردنی NFL I ەوە بۆ گرێی یان

---

٤٢٢ Koopman (1983), Huang (1982), Travis (1984)

وەچەپێکهاتەی S، ڕیزبوونی وشە لەسەر ئاستی V′ ڕووندەکەمەوە. بە مەرجە بنەماییەکانی "ئاسانکردنی ڕێزمان" و مەرجی هاوسێیەتیی ئارگومێنتەکان پاساوی ڕاستیی شییکردنەوەی S-O-V ی زمانی کوردیی دەدەمەوەو دەیسەلمێنم. ئەوەی من بۆی دەچم و داوای دەکەم ئەوەیە، کە هەمان پەیوەندیی پێدانی دۆخی ڕێزمانیی لە نێوان (VP) V′ داو لە نێوان (S) V′ دایشدا هەیەو کە لەم ڕێیەوە ڕێزمانی کوردیی ئاسان تر بووە.

## ٢/١-٣-٤-٣) وەچەپێکهاتەی فرێزی کردار (V′)

### شوێنی کردار:

فرێزی کردار (VP) V′ وەك وەچە پێکهاتەیەکی سەرکۆتایی شییدەکرێتەوە. کێشەی شوێنی کردار و سەلماندنی شوێنەکەی بۆ ڕیزبوونی وشەو یاساکانی هەڵگواستنی دروستەکانی فرێز گرنگن. ئەم کێشەیە دەتوانرێت وەك لای خوارەوە دابڕێژرێت:
دەبێت کردار لە دروستەی قووڵی ڕستەی کوردییدا لە کام شوێنەدا بێت؟
هەڵفەکانی (جومگەکانی) ڕستە دەریدەخەن، کە کرداری کردارەکاتدارەکان[٤٢٣] لە سێ شوێندا دەبینرێنەوە:

شوێنی کۆتایی (قرە)

ڕستەی دەربڕین[٤٢٤]:
١٥٨- (ا) ئازاد ئارامی گرت.
(ب) ئازاد ئارام دەگرێت.

ڕستەی پرسیار
١٥٩- (ا) ئازاد کێی گرت؟
(ب) ئازاد کێ دەگرێت؟

شوێنی دووهەم

ڕستەی دەربڕین
١٦٠- (ا) ئازاد چوو بۆ قوتابخانە.

---

[٤٢٣] finite Verbformen

[٤٢٤] Aussagesatz

(ب) ئازاد دەچێت بۆ قوتابخانە.

ڕستەی پرسیار
١٦١- (ا) کێ چوو بۆ قوتابخانە؟
(ب) کێ دەچێت بۆ قوتابخانە؟

شوێنی سەرەتا

ڕستەی فەرمان
١٦٢- بڕۆن !

ڕستەی پرسیار
١٦٣- (ئایا) بڕۆن ؟

## ڕستەی پرسیار وەك نوێنەری دروستەی قووڵ:

بۆ ئەوەی بتوانم شوێنی کردار لە ڕستەی کوردییدا دیاریبکەم، دەبێت لە دروستەی ڕستەیەکەوە دەستپێبکەم، کە لەگەڵ دروستەی قووڵی ڕستەی کوردییدا یەکدەگرێتەوەو لەیەکدەچن. هەڵبژاردەکانم (کاندیداتەکانم) بۆ ئەمە دروستەکانی ڕستەکانی سەرەوەن.

دروستەی قووڵ ئەو ئاستەیە، کە پاشان گواستنەوەکان بەسەریدا جێبەجێدەکرێن. لەم تێگەیشتن و بۆچوونەوە ڕستەی دەربڕین ناتوانێت نوێنەری دروستەی قووڵی ڕستەی کوردیی بێت و لە گەڵیدا یەکبگرێتەوە. چونکە دروستەی ڕستەی دەربڕین، جوڵاندن و جێگۆڕکێی فرێزەناوییەکان و ئەو کەرەستەسەرەتاییانەی تێدایە، کە نەبوون بە کەرەستەی فەرهەنگیی و ڕەنگە بەرهەمی پرۆسەی بە زۆر یان سەرپشکیی بن. دروستەی ڕستەی فەرمان، بۆیە بۆ ئەم مەبەستەم ناگونجێت، چونکە من بۆ ئەم چەشنە ڕستانە دروستەیەکی قووڵ دادەنێم، کە ئەو بکەرەی تێیدایە، لە دوایبدا داڕشتەیەکی فۆنۆلۆژیی نابێت، بەواتا دەرنابڕدرێت. کەواتە دروستەی ڕستەی فەرمان بۆ مەبەستەکەم هەمان دەرەنجامی ڕستەی دەربڕینی دەبێت. ڕستەی پرسیاری لە چەشنی (١٦٣) وەك ڕستەی پرسیار شییدەکرێتەوە. لەبەر ئەوەی نە دروستەی دەربڕین[٤٢٥] و نە دروستەی ڕستەی فەرمان و نە ڕستەی لە چەشنی (١٦٣) لەگەڵ دروستەی قووڵی ڕستەی کوردییدا یەکناگرنەوەو تەتابوق ناکەن، دەبێت ڕستەی پرسیار نوێنەری ئەم دروستەبنەڕەتییە بێت. وەك بەڵگە بۆ ئەم زانیین و تێگەیشتنە شوێنی سینتاکسیی وشەی پرسیار لە ڕستەی پرسیار خۆیدا گەورەترین یاریدەدەر دەبێت.

---

٤٢٥ Aussagestruktur, Aussagesatzstruktur

کردارەکــەو وشــەی پرســیارەکە لــە ڕســتەی بــەرایی[٤٢٦] و لــە ڕســتەی ئــاڵۆزدا[٤٢٧] شوێنەسینتاکسییەکانی خۆیان دەپارێزن؛ لەبەرئەمە لە ڕستەی شارستە[٤٢٨] و پاڕستەیشدا[٤٢٩] وشەی پرسیارەکە یارییدەدەرمانە. با ئێستایش لە وشەی پرسیاری ڕستەکەی (١٦٥) وردببینەوە، کە لە جێی بکەری پاڕستەکەی (١٦٤) دا دەرکەوتووەتەوە.

١٦٤- ئازاد دەیەوێت، ئارام بچێت بۆ قوتابخانە.
١٦٥- ئازاد دەیەوێت، کێ بچێت بۆ قوتابخانە؟

ئەگەر ئێستا من باوەڕ بە دروستەی ڕستەی پرسیار، وەك نموونەو نوێنەر بۆ دروستەی قووڵی ڕستەی کوردیی، بکەم و پێیڕازیی ببم، ئەوا بۆمدەردەکەوێت، کە کردارە تێپەڕەکان لە ڕستەی پرسیاردا لە دوو شوێندا دەردەکەون:

(ا) شوێنی ناوەڕاست
(ب) شوێنی کۆتایی (قرە)
١٦٦- کێ بۆ قوتابخانە چوو؟
١٦٧- کێ چوو بۆ قوتابخانە؟

ئەو بەڵگانەی بتوانرێن، لە بەرژەوەندیی شوێنی ناوەڕاست بهێنرێنەوە، زۆر کەمن. لەبەرئەمە خۆم بەو بەڵگەهێنانەوانەوە خەریکدەکەم، کە بوونی کردار لە شوێنی کۆتاییدا دەسەلمێنن. یەککەم بەڵگە لە کردارەکە خۆیدایەو پەیوەستە بە سەرەو ڕیزبوونی بەشەکانی ئەو کردارە ئاوێتانەی، پێشناوە نارەسەنەکانیان لە هەندێك شوێندا لەیەك جیادەبنەوە و لە کۆتایی ڕستەدا بەیەکەوە دەردەکەون. ئەم کردارانە لە دروستەی قووڵدا لەسەرهێڵێك لە تەکیەکەوەو بەیەکەوە لکاون. بۆ ئەمەیش شوێنی کۆتایی، لەبەر ئەو هۆیانە، باشترین جێگەیە:

(ا) ئەم کردارانە لە شوێنی کۆتایی ڕستەدا لە ڕیزبوونی سروشتی خۆیاندا دەردەکەون. بۆ ئەم مەبەستەیش لەم کردارانە <داگرتن>، <دامەزراندن>، <خۆپاراستن>، <لێدان>، <پێکوتن> وردببەرەوە.

---

[٤٢٦] elementare Sätze
[٤٢٧] komplexe Sätze
[٤٢٨] übergeordnete Sätze
[٤٢٩] untergeordnete Sätze

١٦٨- ئەوان نەخۆشەکەیان داگرت.
١٦٩- ئازاد ئارامی دامەزراند.

(ب) بەشەکانی ئەم کردارە ئاوێتانە لە هەندێك چەشنی ڕستەدا جووت-کۆماوەی ڕستە[420] دروستدەکەن. لەم بارانەدا کردارەکە خۆی لە کۆتایی ڕستەدایە؛ بڕوانە کردارەکانی <لێدان>، <تێگرتن>، <بۆنووسین> ...هتد.

١٧٠- جەندرمەکە لەنەوزادی دا.

بەڵگەهێنانەوەی دووهەم پەیوەندیی بەو فرێزە پێشناوییانەی ئاڕاستەکردنەوە هەیە، کە بۆیان هەیە پێش یان پاش کردارەکە دەربکەون (لە ئایندەیەکی نزدیکدا). بەپێی ئەو بەشانەی خرانەڕوو زمانی کوردیی وشەڕیزبووی S-O-V ی هەیە.

ئەم ڕاستییانە پشتگیریی لەم ئەنجاملێکدانەوەیەم دەکەن:
171- Akkusativ – N´´s (NPs)

گشت ئەو NP یانەی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ڕاستەوخۆیان هەیە، لە ڕستەدا لە پێش کردارەکەوەن. ئەم ڕستانەی لای خوارەوە بەتەنها ئەم ڕاستییە ناسەلمێنن، بەڵکو ئەوەیش دەردەخەن، کە پێدانی دۆخی ڕێزمانیی لە زمانی کوردییدا دروستەبەندە.

١٧٢- ئازاد ئازیزی گرت.
١٧٣- (ا) * ئازاد گرت ئازیزی
(ب) * ئازاد گرتیی ئازیز
(پ) * ئازیزی ئازاد گرت

## جۆرەئازادەکانی PP-V و V-PP

تا ئێستا زاری سلێمانیم وەك زمانێکی PP-V شیکردووەتەوە. پەیوەست بەمەوە، داوای ئەوەمکردووە، کە فرێزە پێشناوییەکان گشتیان لە پێش کردارەکەوە دێن. بەڵام ژمارەیەك لە PP کان دەتوانن پاش کردارەکە بەکاربهێنرێن. من وەهای دادەنێم، کە ئەم کۆمەڵە PP - V

[420] Satzklammer

دروستانە بە یاریدەی یاسایەکی جێگۆڕکێ[٤٣١] لە دروستەی بنەڕەتیی V-PP وە هەڵگوێزراون. پێشناوەکان واتای سەربەخۆی خۆیان هەڵگرتووە؛ بۆ نموونە لایەنی بابەتانەی جیاوازیان هەیە. تێبینیی ئەوە بکەن، کە ئەو پێشناوانەی، جێگۆڕکێیان پێکراوە، واتاکانیان نەگۆڕدراوە.

## چەشنەکانی پێشناوەکان

(ا) ئەو کەرەستەسەرەتاییانەی، نە سەرن و نە تەواوکەرن و لەناو فرێزەپێشناوییەکاندان، نە بەشە زگماگی کردارەکەن و نە لەلایەن کردارەکەوە ڕەگەزەکانیان دیارییکراوە: یەکەکانی ئەم کۆمەڵە P P یە بۆیان هەیە بەتەنها لە پێش کردارەوە بەکاربهێنرێن.

١٧٤- (ا) * پرشنگ سێو دەخوات بەکاڵیی
(ب) پرشنگ به کاڵیی سێو دەخوات.
(پ) پرشنگ سێو به کاڵیی دەخوات.

(ب) فرێزە پێشناوییەکانی، ئاوەڵکرداری شوێنیی[٤٣٢] دەردەبڕن و ئەو فرێزەپێشناوییانەی کردارێکی یاریدەدەریان[٤٣٣] تێدایە، بەتەنها لە پپش کردارەکەوە دەردەکەون.

١٧٥- (ا) سکاڵا لەباخەکەدا یاریدەکات.
(ب) ؟؟ سکاڵا یاریدەکات لە باخەکەدا

١٧٦- (ا) ئازاد و ئارام لە بازاڕبوون.
(ب) *ئازادو ئارام بوون لەبازاڕ

(پ) گشت فرێزەپێشناوییە ئامێرییەکان[٤٣٤] بەر لە کردارەکان بەکاردەهێنرێن.

١٧٧- (ا) پۆلیس دزەکەی بەدەست گرت.

---

[٤٣١] Permutationsregel

[٤٣٢] lokative PPs

[٤٣٣] Hilfsverb; Kopula

[٤٣٤] instrumentale PPs

(ب) * پۆلیس   دزەکەی گرت بەدەست

(ت) ئـــەو فرێـــزە پێشـــناوییانەی لـــەپێش و لـــەپاش کـــرداردا دەردەکـــەون، فرێزەپێشناوییەکانی ئاڕاستەکردنن[٤٣٥]، کە لەلایەن کردارەوە وەچەدیارییکراون.

١٧٨- (ا) بەدەست لەنەوزاد درا.
(ب) بەدەست درا لە نەوزاد.
(پ) لەنەوزاد بەدەست درا.
(ت) ؟؟؟ لەنەوزاد درا بەدەست

ڕوونکردنەوەکانی سەرەوە ئەوە دەبەخشن، کە بەتەنها ئەو فرێزە پێشناوییانە جێگۆڕکێی ئازادانەیان هەیـە، کـە لەلایـەن کـردارەوە لـە ڕووی واتـاوە هـەڵبژێردراون و جیاکراوەنەتـەوەو وەچـەدیارییکراون (ڕەگـەزەکانیان دیـارییکراوە).[٤٣٦] تەواوکـەرە سەرپشـکییەکان شـوێنی جێگـیرو نـەگۆڕیان لـەناو ڕسـتەدا هەیـە. بۆیـە نـاتوانرێن لـەو شـوێنانەیان دەربـهێنرێن و جێگۆڕکێیان پێبکرێت یان بگوێزرێنەوە.

بـەپێی بەڵگەهێنانـەوەکانی سـەرەوەو ئەوانـەی تـا ئێسـتا خراونەتـەڕوو، جیاوازییـە دروستەییەکان لە نێوان (١٢٥) و (١٣٦) دا بە هۆی چەشنی فرێزە ناوییەکەوەیە. بەپێی ئەم گریمانەیـــە دروستەرستەســـازییەکەی ، دروســـتەیەکە، کـــە لـــەڕێی جێگۆڕکێـــی وەچەپێکهاتەکەیەوە[٤٣٧] هـەڵگوێزراوە؛ بەگوێرەی هـەمان گریمانـە ڕسـتەکانی (١٢٥) و (١٣٦) دروستەی قووڵی لەیەکچوو یان وەکیەکیان هەیە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت، کە ڕستەی (١٢٥) یاسای گواستنەوەی جێگۆڕکێی (١٧٩) ی بەسەردا جێبەجێکراوە.

١٧٩- (ا) ئاستی قووڵ: V-PP

---

[٤٣٥] subkategorisierte direktionale PPs

[٤٣٦] ئەو ئاوەڵکردارانەی کردارەکە داوایکردوون و دیارییکردوون، لـە ئاسـتی قووڵـدا، لـە شـوێنی بنـەڕەتی ئاوەڵکردارەکـاندا نیـین، بـەڵکو لـەبن دەسـتی کردارەکـە خۆیـدان؛ ئـەم ئاوەڵکردارانـەیش نەتوانرێن جێگۆڕکێیـان پێبکرێت (بڕوانـە: نەسـرین گوڵدانەکـەی لەسـەر مێزەکـە دانـا ~ نەسـرین لەسەر مێزەکە گوڵدانەکەی دانا ...). بەم زووانـە لـە لێکۆڵینەوەیـەکمدا دەربـارەی "ئـاوەڵکردارو بەکارهێنانی ئاوەڵکرداریی" ئەم کێشەو بابەتـەو فرێزەپێشـناوییەکانی ڕێزمانەکەمان پەسـنکەرانە شییدەکەمەوە (وەرگێڕ).

[٤٣٧] Konstituentenpermutation

(ب) ئاستی ڕووکەش: PP-V

چۆن دەتوانرێت ڕاستیی (١٦٣) بسەلمێنرێت و داکۆکیی لێبکرێت؟

(ا) دروستەی ڕووکەشی V-PP، لە چەشنی دوا فرێزی پێشناویی، دروستەی ئازادی تری نییە. بۆیە ژێرییە، گەر بەڵگەکان وەها بهێنینەوە، کە ئەو دروستەیە، دروستەی قووڵە، کە هیچ دروستەی ئازادی دیکەی نییە (١٧٨) ب).

(ب) گشت کەرەستەسەرەتاییەکانی ´V بەر لەکردارەکەوە هاتوون. بۆیە ڕاست ترە، ئەگەر داوابکەم و بڵێم، کە فرێزەپێشناوییەکانیش لەبنەڕتدا لەپێش کردارەوە بەرهەمهێنراون.

(پ) دوا بەڵگەهێنانەوەم پەیوەندیی بە دابەشبوونی دروستەکانی ´V ی (١٧٩) وە، لە هەرێم و ناوچە جیاوازەکاندا، هەیە. لەبەرئەوەی زاری سلێمانی نە گواستنەوەی فرێزی ناویی و نە گواستنەوەی وشەی پرسیاری هەیە (بڕوانە لێدوانەکانی خوارەوە)، چاوەڕێی بوونی جێگۆڕکێی ئازادی وەچەپێکهاتەکان، وەك فرێزەپێشتاوییەکان دەکرێت، نەك گواستنەوەیان. کەواتە (١٦١) بە سوودترین نموونەیە بۆ یاساکەی (١٧٩).

دروستە ڕووکەشەکەی (١٧٩) ب)) بەزۆریی لە ناوەندی شاری سلێمانییدا دەبیسترێت. بەپێچەوانەوە (١٧٩) (ا)) زۆرتر لەدەرەوەی شاردا، لە گوندەکاندا دەگوترێت و دەردەبڕدرێت. ئەم جۆرەئازادانەی تریش، کە تایبەتمەندن بەچەند ناوچەیەکەوە، پشتگیریی ئەم داواکردن و بانگەشەی گریمانەیەم دەکەن.

١٨٠- (ا) ئازیز بۆکوێ چوو؟
(ب) ئازیز چوو بۆکوێ؟

١٨١- (ا) ئازیز کوێوە چوو؟
(ب) ئازیز کوێوە چووە؟
(پ) *ئازیز چوو کوێوە
(ت) *ئازیز چووە کوێوە

کەواتە داوای ئەوە دەکرێت، کە (١٧٩ (ا)) لە (١٧٩ (ب)) وە هەڵگوێزراوەو کە یاسای (١٨٢) لێپرسراوی ئەم یاسای جێگۆڕکێیەیە.

## ١٨٢- یاسای جێگۆڕکێی فرێزەپێشناوییەکان

جێگۆڕکێ بە شوێنی فرێزی پێشناویی و کرداری هەر ڕستەیەك بە سەرپشکیی بکە، ئەگەر فرێزەپێشناوییەکە لەلایەن کردارەکەوە هەڵبژێردرابوو و جیاکرابووەوەو وەچەدیارییکراوبوو.

لە هەموو ئەم ڕاستییە بەدەستخراوانە، دوو ئەنجاملێکدانەوەم دەبێت:
(ا) گشت کەرەستەسەرەتاییەکان لەبەردەم ´Vەکەوە لەبنەڕەتدا بەرهەمهێنراون.
(ب) ئاڕاستەکردن و لاوڕووی پێدانی دۆخی ڕێزمانیی لە زاری سلێمانیدا مەیلی ئەوەی هەیە، لەلای چەپەوە بۆلای ڕاست بێت؛ فرێزەپێشناوییەکان لەم یاسایە بەدەرن، چونکە پێشناو لە گشت زمانەکانی جیهاندا لە لای ڕاستەوە بۆ لای چەپ حوکمی دۆخی ڕێزمانیی دەکەن.

هاوسێیەتیی ئارگومێنتەکان:
هەر وەك چۆن هاوسێیەتیی ئارگومێنتەکان بۆ زمانی فەرەنسیی گرنگ نییە، ئاوەهایش بۆ زاری سلێمانی بەبایەخ نییە. چونکە چەند ئارگومێنتێك بۆیان هەیە لە نێوان ئەوەی حوکمی دۆخی ڕێزمانیی دەکات لەگەڵ ئەو فرێزە ناوییەی بەرکارەو دۆخەڕێزمانییەکەی پێدەدرێت، بوەستن یان هەبن. بەڵام لەبەرئەوەی دۆخی ڕێزمانیی بەو چەند شوێنە چەسپاوو نەگۆڕە دەدرێت، کە ئارگومێنت و گۆکردنی ڕێزمانیی گونجاویان تێدایە، پێویستە ئارگومێنتەکان لە شوێنە ڕاستەکانی خۆیاندا بن.

١٨٣- شیرین منداڵەکانی زۆر خۆشدەوێت.
١٨٤- ئازاد ئازیزی لەباخەکەدا بەدەست گرت.

تێبینیی:
پێدەچێت، ئەو ڕەگەزەی لەپێش کردارەکەوە هاتووەو ڕاستەوخۆ لەبەردەم کردارەکەدا وەستاوە، قورسایی سەرەکیی[٤٣٨] (هێزی سەرەکیی) ڕستەکەی بخرێتەسەر. ئارگومێنتەکانی بەشی کرداریش دەتوانرێن یاسائاسا بە ڕستەکەوە بلکێنرێن. ئارگومێنتە لکێنراوەکە دەتوانرێت لەم ڕێیەوە لە ئارگومێنتەکانی تر جیابکرێتەوە. چونکە ئارگومێنتە لکێنراوەکان، وەك کەرەستەسەرەتاییە هێنراوەپێشەکان[٤٣٩] قورساییەکی زۆر تایبەتییان لەسەرەو لە جێگەبنەڕەتییەکانی خۆیاندا نین و جێگۆڕکێیان پێکراوە. ئەم جۆرە دروستانەی ڕستە

---

[٤٣٨] Hauptbetonung

[٤٣٩] fokussiert

نابێت لە گەڵ دروستەی ئەو ڕستانەدا تێکەڵ بکرێن، کە ئارگومێنتەکانیان هێشتا هەر لە شوێنە بنەڕەتییەکانی دروستەی قووڵدان.

١٨٥- شیرین   منداڵەکانی زۆر´ خۆشدەوێت.
١٨٦- شیرین   زۆر´ منداڵەکانی` خۆشدەوێت.
V′2   V′2   V′1

بزانە، کە: V′1=S ،V′2=VP

ئێستا دەزانین، کە گشت کەرەستەسەرەتاییەکان لە بنەڕەتدا لەپیش (لەبەردەم) کردارەکەوە بەرهەمهێنراون. بەڵام من دەمەوێت، کە فرێزەپێشناوییەکان و کردارەکە لەسەر یەك ئاست بەرهەمبهێنرێن؛ ئەمەیش بەشێوەیەك کە یەکتریی وەچە ئاراستەبکەن. لەبەرئەمەیە، من بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم ڕستانە، کار بە (دووپەلکییە)دووفلیقانە جیابووەوەکانی[٤٤٠] چۆمسکی و ڕاینهارت دەکەم.

١٨٧- ئازاد و ئارام   لەبارەت خۆیانەوە قسەیان لەگەڵ ئازیزدا کرد.
١٨٨- ئازاد و ئارام   لەبارەت خۆیەوە قسەیان لەگەڵ ئازیزدا کرد.

لەوەدەچێت چەشنی دووفلیقانە جیابووەوەکەی چۆمسکی بۆ زاری سلێمانیی گونجاوتر بێت وەك لەوەی ڕاینهارت؛ چونکە ئەو فرێزەپێشناوییەی جێگۆڕکێی پێکراوەو خراوەتە پشت کردارەکەوە، وەچەپێکهاتەی لکێنراوو هەڵواسراوە.

١٨٩- چۆمسکی




binäre Verzweigungen[٤٤٠]

**١٩٠- نەخشەو شێوەی ئەندازیاریی دروستەی ڕووکەشی (١٨٧)**




**١٩١- نەخشەو شێوەی ئەندازیاریی دروستەی ڕوکەشی (١٨٨)**




له (١٩٠) دا، بۆیە فریزەپێشناوییەکەی {لەبارەت خۆیانەوە} لە شوێنە بنەڕەتییەکەی خۆی دەرهێنراوەو بەرزکراوەتەوەو بە V´ ەکەوە لکێنراوە، بۆ ئەوەی لەگەڵ فریزەناوییەکەی {ئازادو ئارام} دا یەکتریی وەچەئاڕاستەبکەن و لە واتادا یەک بگرنەوە. لە (١٩١) دا فریزەپێشناوییەکەی {لەبارەت خۆیەوە} و فریزەپێشناوییەکەی {لەگەڵ ئازیز} دا لەناو یەک V´ دا یەکتریی وەچەئاڕاستەدەکەن و لەواتادا یەکدەگرنەوە، بۆیە فریزەپێشناوییەکەی {لەبارەت خۆیەوە} جێگۆڕکێی پێنەکراوە.

ئەم دروستەو دووفلییقانە جیابووەوانە دەتوانن، وەك نیشانمدان، دروستەی ناوەوەی N´´ ە ئاڵۆزەکانیش ڕوونبکەنەوە.

با وای دابنێم، کە لەبەر ئەو هۆیانەی لای خوارەوە بەرکارەکانی ناو (VP) V′ لەبنەڕەتدا ڕیزبوونی S-O-PP-V یان هەیە: بەپێی ئەم بۆچوونە بەرکارەراستەوخۆکەی، دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ڕاستەوخۆ وەردەگرێت، ڕاستەوخۆ لەپێش کرارەکەدا نییە، بەواتا لە بندەستیدا نییە؛ کاتێك ئەم بەرکارە جولێنرا، شوێنەبنەڕتییەکەی لەلایەن کردارەکەوە توند حوکمدەکرێت.

١٩٢- پەخشان نان بەدەست دەخوات. (DS)

١٩٣- پەخشان t بەدەست نان دەخوات.

بەڵگەهێنانەوەکانی سەرەوە پێچەوانەی ئەم گریمانەیە و شیکردنەوەکەیان نە سەلماندووە. شوێنی بەردەم یان پیش کردار هەمیشە قورسایی سەرەکیی لەسەرە (بڕوانە {نان} لە (١٩٤) دا). لەبەر ئەوەی هەرچ وەچەپێکهاتەیەك، فرێزەناوییەکە {نان} یان فرێزەپێشناوییەکە {بەدەست}، بهێنرێتە ئەم شوێنە (بەراوردی (١٩٤) و (١٩٥) بکە)، قورساییەسەرەکییەکە وەردەگرێت؛ کەرەستەکەی ئەم شوێنە بەبێ ئەو قورسایی خستنەسەرەی، وەریدەگرێت، دەجوولێنرێت. کەواتە جێگۆرکێکان بەبێ قورساییخستنەسەرە بنەڕتییەکەیان جێبەجێدەکرێن. لەبەرئەوەی هەردوو فرێزەکە، {نان} یان {بەدەست}، لەو شوێنەدا هەمان قورسایی وەردەگرن، ئەو فرێزەی پێشەوەیان جێگۆرکێی کردووەو لە جێبەجێکردنی ئەو جێگۆرکێیەدا فرێزی {نان} شوێنپێیەکی بە جێهێشتووە. کەواتە خشتەکەی (١٩٣) دروستە.

١٩٤- پەخشان `بەدەست نان´ دەخوات.
١٩٥- پەخشان `نان بەدەست´ دەخوات.

هەروەك سەلمێنرا S- (O)-(PP)-V لەبنەرەتدا بەرهەمهێنراوە. ئەم دروستەیە ڕێی ئەوە دەدات، دووا V′ دووپاتببێتەوە، نەك V′ ی بەشی بەرکاری ڕاستەوخۆ.
لەبەر ئەمانەیە، بۆم هەیە ئەم سەرەو ڕیزبوونانە بۆ وەچەپێکهاتەی V′ دابنێم و بیچەسپێنم.

196-a) (N′′) – V
b) (N′′) – (Adv) – V
c) (N′′) – (Adv) – (PP) – V
d) (N′′) – (Adj) – V
e) (N′′) – (Adj) – (Adv) – (PP) – (PP) – V

کورتەو پوختەی لێدوانەکان:

زاری سلێمانی، گشت کەرەستەسەرەتاییەکانی لەپێش -لەبەردەم- کردارەوە ڕیزدەکات. ´

´N ە بەرکارە ڕاستەوخۆکەی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ڕاستەوخۆ وەردەگرێت، دۆخەڕێزمانییەکەی لە کردارەوە وەردەگرێت. ئەگەر بە ئەلفوبێی عارەبیی بنوسین، ئەوا ئاڕاستەو ڕووی پێدانی دۆخی ڕێزمانیی لەلای چەپەوە بۆ لای ڕاستە. ڕیزبوونەبنەڕەتییەکەی وشەکان لە دروستەی قوڵدا لەگەڵ جێگۆڕکێ ئازادەکەی کەرەستەسەرەتاییەکان لە سەر دروستەی ڕووکەش، کە سنووریان بۆ دانراوەو جوڵاندنەکانیان دیاریکراوە، ئاماژەو نیشانەی ئاشکران بۆ گرنگیی پارامێتری ئاڕاستەو ڕووی پێدانی لایەنەبابەتییەکان و بەخشیینی دۆخی ڕێزمانیی. لەبەرئەوەی ئاڕاستەو ڕووی لایەنی بابەتانەیش بۆ دانانی شوێنی وشەکان لە ڕستەدا دەتوانێت پارامێترێك بێت و لەبەرئەوەی ´V ەکانی زاری سلێمانی وەچەپێکهاتەی سەرکۆتایین، دەتوانرێت داواو بانگەشەی ئەو گریمانەیە بکرێت، کە ئاڕاستەو ڕووی پێدانی لایەنی بابەتانە لە دروستەی قووڵداو بەخشینی دۆخی ڕێزمانیی لە دروستەی ڕووکەشدا لەلای چەپەوە بۆ لای ڕاست جێبەدێدەکرێن و دەهێنرێنەدیتن.

کە کەرەستەسەرەتاییەکان ڕۆڵە بابەتییەکانیان لە دروستەی قوڵدا وەردەگرن، ئەوە دەبەخشێت، کە ئەم کەرەستەسەرەتاییانە لە دروستەی ڕووکەشدا ڕۆڵی بابەتانەی خۆیان هەیەو زووتر پێیاندراوە. لەبەرئەمەیە کەرەستەسەرەتاییەکان بۆیان هەیە لە سەر دروستەی یان ئاستی ڕووکەش شوێنە بنەڕەتییەکانی خۆیان بەجێبهێڵن و بەخۆیان و ڕۆڵەبابەتییەکانیانەوە لە شوێنی تازەدا بنیشنەوە. بەڵام ئەو کەرەستەسەرەتاییانە لەسەر ئاستی ڕووکەش دەبن بە بابەتی مەرج و سنوورەدانراوەکان و دیاریکردنی پێکهاتەکانی تر. بۆیە ناتوانن تەواو بە ئازادیی و بێ مەرج جێگۆڕکێیان پێبکرێت یان لابرێن یان بگوێزرێنەوە. بەرکاری ڕاستەوخۆی کردارەکە، کە ´´N ێکەو دۆخی ڕێزمانیی بەرکاریی ڕاستەوخۆی هەیە، لەبەر پارێمەتری ئاڕاستەو ڕوو و بەهۆی پاڵێوەری دۆخی ڕێزمانییەوە ناتوانرێت لە شێوە فەرهەنگییە تەواو پڕەکەیدا جێگۆڕکێی بۆ پشت کردارەکە پێبکرێت و بخرێتە پشت کردارەکەوە.

## ٢/١-٣-٥) وەچەپێکهاتەی (S) ´V:

ڕاستییەدەستکەوتووەکان دەریانخست، کە ´V و ئەو ´´N انەی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ڕاستەوخۆیان هەیە، وەچەپێکهاتەی سەرکۆتایین، کە پێدانی دۆخی ڕێزمانیی دروستەبەندەو کە ئەمە بابەتی مەرجی هاوسێیەتیی ئارگومێنتەکان نییە. بە پێی ئەم چەمکانەو بەیاریدەی پێدانی ڕۆڵی بابەتانەو دۆخی ڕێزمانیی کێشەو پرسیاری شوێن و

ڕیزبوونی وشەکانی لە ناو (VP) ´V دا بەوردیی ڕوونکراونەتەوە. بەیاریدەی هەمان چەمك و زاراوەو بە هەمان شێوە لەم چەند هەنگاوەی داهاتوومدا ڕیزبوون و سەرەهاتن لە وەچەپێکهاتەی (´´I)´V د ا و پەیوەندییەکانیان لەگەڵ یەکتیریدا ڕووندەکەمەوە. کە دۆخی ڕێزمانیی لەزاری سلێمانیدا بە شوێنی دیاریکراوو چەسپاوەوە بەستراوە -بەشوێنی دیاریکراوو چەسپاو دەدرێت-، دەریدەخات، کە پەیوەندییەکانی دۆخی ڕێزمانیی زۆر بەباشیی و بە یاریدەی پەیوەندییەکانی حوکمکردن و بە کۆمەکی پەیوەندییەکانی وەچەئاڕاستەکردن پەسندەکرێن.

بۆ وەچەپێکهاتەکانی (VP) ´V ڕژێمێکی دوفلیقانەی جیابووەوەی ئاسایی هەڵبژێردراوە، کە بەتەنها ئەو داڕشتانەی وەچەپێکهاتەکان دەخاتەڕوو، کە بۆ بەکارهێنانی دروستەی فرێزەکان پێویستن. بۆ ئەمەیش ئاستێکی یەك سەرباریی بەکارهێنراوە. هەر وەك بینییمان وەچەپێکهاتەکانی (XP) ´X وەك یەکەی جیا بەدەردەکەون. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو کەرەستەسەرەتاییانەی، سەری ڕێزمانیی نین، دەبینین، کە هەر ڕەگەزێك ئاستێکی یەك سەرباریی تێدایەو ئەویش ڕەگەزی ´X ە، کە لە X (= سەرەڕێزمانییەکە) و ئارگومێنتە (سەرپشکییەکانی) پێکهاتووە. ئەم تیۆرییە ڕاستییەکانی پێدانی ڕۆڵەبابەتییەکان و بەخشینی دۆخی ڕێزمانیی و پارامێتری ئاڕاستەکردنەکانیان ڕووندەکاتەوە.

## مۆرفێمی کات و کەس INFL

ئێستایش دەمەوێت ئاستێك ببشکنم، کە بەرزترە لە ئاستی (VP) ´V؛ ئەمەیش وەچەپێکهاتەی (S) ´V ە. چەشنی ڕیزبوونی S-O-V دەریدەخات، کە فرێزی ناویی بکەر N´´ - Subjekt و بەشی کردار وەچەپێکهاتەسەرەکییەکانن. لەبەر ئەمەیە پێویستە ئەو پەیوەندییەی لە نێوان مۆرفێمی کات و کەس لەگەڵ فرێزی ناویی بکەردا هەیە، بە وردیی و باش تر ڕوونبکرێتەوە. نیشانەو خەسڵەتی بەڵگەهێنانەوەکانم هانەدەدەن، زاری سلێمانیی وەك زمانێکی S-O-V شیبکەمەوە. ئەگەر ئەوەم بەلاوە پەسەند بێت، کە کەرەستەسەرەتاییەکەی INFL لە وەچەپێکهاتەی کات TENSE و کەسی لکاو AGR پێکهاتووە[44]، ئەوا کەرەستەسەرەتاییەکەی INFL یش دەخەمە سەر ڕژێمی S-O- V ەکە. ئێستا وەچەپێکهاتە گرنگەکان، وەچەپێکهاتەی S-O-V-I ن؛ ئەو I یە کورتە INFL ەو لەجێی ئەو دانراوە.

## کات و کەس INFL لەگەڵ (VP) ´V دا

---

[44] Chomsky (1981)

وەچەپێکهاتەی کات و کەس سەری ڕێزمانیی پڕۆژەی $I''$ ن، ئەگەر کات و کەس گرێیەکی جیا بن. بەڵام لەبەرئەوەی کات و کەس لە زاری سلێمانیدا کەرەستەی فەرهەنگین، کرداری زمانەکەمان بەتەنها $V''$ ی وەك گەورەترین پڕۆژە هەیە. وەك هێپۆتێزەی کارێکی داکۆکی لە ڕاستیی و ئەنجامدروستیی کراوە، وەهای دادەنێم، کە پارێمەتری سەرکۆتایی بۆ گشت ڕەگەزەکان دەخوات -هەموو ڕەگەزەکان سەرکۆتایین-. ئێمە دەزانیین، کە کردارەشکاوە[٤٤٢] کە یاسائاسا لە شوێنی کۆتاییدایە. پرسیارو کێشەیەکی لێردا و لەم پەیوەندییانەدا هەن، دەتوانرێن بەم شێوەیە دابڕێژرێن: دبێت کات و کەس لە ئاستی بنەڕەتدا لە کوێی ڕستەدا هێنرابێتنە بەرهەم؟ ڕستەکانی لای خوارەوە، نییشانیدەدەن، کە کات و کەس و کردارەسەرەکییەکە لە ڕستەی ڕەگییداو[٤٤٣] لە ڕستەی شکاوەدا[٤٤٤] پێکەوەن و بەیەکەوە دەردەکەون.

١٩٧- ئازاد ئازیز دەگرێت.
١٩٨- ئازاد و ئارام ئازیز دەگرن.
١٩٩- ئازاد ئازیزی گرت.
٢٠٠- ئازاد و ئارام ئازیزیان گرت.
٢٠١- ساکار بڕوات بۆ قوتابخانە؟

ڕەگی کردارەکە /گر/ە. ئەو لاگرانەی لەملاو ئەولای ڕەگی کردارەکەدان، مۆرفێمی کات /دە/ و /ت/ و مۆرفێمی کەسی لکاو /ێت/ و /ت/ و /ن/ و /یان/ نن. ئەمانە نموونەن بۆ INFL ی زمانی کوردیی. لە کاتێکدا /دە/ پێشگری کاتی ڕانەبوردووەو /ت/ نێوانگری کاتی ڕابوردووە، /ب/ لە (٢٠١) دا پێشگری ویست و ئارەزووی کاتی ڕانەبوردووە[٤٤٥]؛ ئەمانە وەچەپێکاتەی کات[٤٤٦] دەخەنەڕوو. جێناوەلکاوەکانی وەك /ێت/ و /ت/ و /ن/ و /یان/ جێناوی لکاوی

---

[٤٤٢] flektiertes Verb

[٤٤٣] Wurzelsatz

[٤٤٤] eingebeteter Satz

[٤٤٥] Subjunktivpräfix

[٤٤٦] TENSE-Konstituente

بکەریین[٤٤٧] و بە کەرەستەی AGR[٤٤٨] ی سەرەتایی ناسراون و ڕێکەوتنی بکەرو بەشی کردار لە کەسدا[٤٤٩] دەرەخسێنن.

لە کرداری ڕانەبوردوودا، ئەو وەچەپێکهاتەیەی کەرەستەسەرەتاییەکەی کاتی تێدایە، لەپێش ڕەگی کردارەوەیە[٤٥٠]. ئەم ڕاستییە هانمدەدات، وەهای دابنێم، کە کات لە ئاستی بنەڕەتدا لە پێش ڕەگی کردارەکەدا بەرهەمهێنراوە؛ بەشێوەیەك، کە کاتەکە وەك کەرەستەی فەرهەنگیی ڕاستەوخۆ لە پێش ڕەگی کردارەکەدا بێت. بە پێی ئەم ڕوونکردنەوەیە، کاتێك ڕێی دەستووریی بەبوونی کات و کەس دەدرێت، کە کات و کەس لە دروستەی قووڵدا لە شوێنی پێش ڕەگی کردارەکەدا وەك کەرەستەی فەرهەنگیی هەبن. لەبەرئەوەی INFL لە کەرەستەسەرەتاییەکانی TENSE و AGR پێکهاتووە، دەبێت یان کەرەستەی یەککەم، بەواتا "کات"، یان کەرەستەی دووهەم، مەبەستم "کەسی لکاو"ە، شوێنی پێش ڕەگی کردار بگرێت؛ ئەمە بۆ ئەوەیە ڕێی دەستووریی بە بوونی INFL بدرێت. ئەم ڕاستییە لە فۆرمەکانی کرداری ڕبوردوودا بەوە جێبەجێدەکرێت و دێتەدیتن، کە جێناوەلکاوەکەی بکەر دەهێنرێتە ئەو شوێنەی پێش ڕەگی کردارەکەوە (لە (١٩٩) دا /ی/ و لە (٢٠٠) دا /یان/).

ئەنجاملێکدانەوە:

٢٠٢- (ا) کات و کەس INFL لە ئاستی بنەڕەتدا ڕاستەوخۆ لەشوێنی پێش ڕەگی کرداردا بەرهەمهێنراون.

(ب) بەتەنها کاتێك ڕێی دەستووریی بەبوونی INFL دەدرێت، کە ئەو شوێنەی لە ئاستی بنەڕەتدا بۆی تەرخانکراوە، بە کەرەستەیەکی فەرهەنگیی، کات یان کەسی لکاو، پڕبوو بێتەوە.

لەڕێی ئەو داتایانەی سەرەوە دەتوانم دوو چەشنی INFL لەیەك جیابکەمەوە:

٢٠٣- (ا) وەچەپێکهاتەی INFL ی بەهێز، کە کات و کەسی لکاوی زەنگینی (کەس و ژمارە) تێدایە.

(ب) وەچەپێکهاتەی INFL ی لاواز، کە بەتەنها کەسی لکاوی هەیە.

---

[٤٤٧] Subjektklitik

[٤٤٨] جێناوی لکاوی بکەریی

[٤٤٩] Subjekt-Prädikatkongruenz

[٤٥٠] präverbal

تێڕوانین و لێوردبوونەوەی تری داتاکانی زاری سلێمانیی ئەم ئەنجاملێکدانەوەیەو شیکردنەوەکانی تا ئێستام بە درۆدەخەنەوەو پووچەڵیدەکەنەوە. چونکە بە پێی ئەم شیکردنەوەیەم وەچەپێکهاتەی INFL کاتی تێدا نییە.

با ئێستایش لەم ڕستانەی لای خوارەوە وردبیینەوە، کە فرێزی ناویی بەرکاری ڕاستەوخۆیان[451] تێدا ترێنجدراوەتە ناو بەشی کردارەوە[452]. ئەو ڕستانەی لە (١٧٣) دا ڕێپانپێنادرێت و پەسەندنەکراون، دەریانخست، کە فرێزەناوییەکان لە ڕستەدا شوێنی دیارییکراوو چەسپاویان هەیە. لەبەرئەمەیە، کە کاتێك فرێزی ناویی بەرکارە ڕاستەوخۆکەی فەرهەنگیی پڕو تەواوەو[453] دەترنجێنرێتە ناو بەشی کردارەوە، فۆڕمی جێناوی لکاوی بەرکار[454] وەردەگرێت و بە فەرهەنگیی پڕو تەواو نامێنێتەوە. لەم جۆرە ڕستانەدا شوێنی پێش ڕەگی کردارەکە بۆشە. کەواتە ئەم جۆرە کردارەئاڵۆزانە (= ڕستە) بەرپەرچی ئەو ڕێپێدانە دەستوورییەی سەرەوە دەدەنەوە.

٢٠٤- ئازاد$_i$ t$_j$ گرتیی$_i$ 0$_j$ .

٢٠٥- ئازیز$_i$ t$_j$ گرتنی$_{ij}$ .

بزانە: /یی/ جێناوی لکاوی بکەرییە؛
/ 0/ و /ن/ جێناوی لکاوی بەرکارن.

شوێنی ڕاستەوخۆی پێش ڕەگی کردار، نەك شوێنی ڕاستەوخۆی پشت ڕەگی کردار[455]، دەشێت چۆڵ بێت و بە کەرەستەیەکی فەرهەنگیی INFL نەگیرابێت. بۆیە گونجاوترو دروستترە، وەهای دابنێم، کە وەچەپێکهاتەی INFL لە ئاستی بنەڕەتدا لە پشت ڕەگی کردارەوە بەرهەمهێنراوە.

---

٤٥١ N´´-Objekt

٤٥٢ in das Prädikat inkorporiert

٤٥٣ volle lexikalische N´´-Objekt

٤٥٤ Objektklitik

٤٥٥ postverbal

با لەپێشدا لە هەڵگواستنی فۆڕمی کردارەکان[٤٥٦] وردببینەوە، کە لە ڕەگی کردارێك و لە وەچەپێکهاتەی شکاندنەوە[٤٥٧] (کات و کەسی لکاوی بکەریی) پێکهاتوون. نیشانەتایبەتییەکانی مۆرفێملکاندی زاری سلێمانیی هاندەدەن، وەهای دابنێم، کە کەرەستەسەرەتاییەکانی وەچەپێکهاتەی INFL وەك کەرەستەی سەرەتایی فۆرمسازدان[٤٥٨] لاگری ئازادن[٤٥٩]. ئەم ئەنجاملێکدانەوەیە پاڵپێوەدەنێت، وەهای دابنێم، کە کەرەستەی سەرەتایی کاتی فۆڕمەکانی ڕابوردوویش لاگرین. لێوردبوونەوەیەکی تەواوی ئەم کردارانەی لای خوارەوە بۆمدەردەخات، کە بۆچوون و گریمانەکەم ڕاستن و ئەنجامەکانیان گونجاون.

٢٠٦- فۆڕمەکانی کردار

| بەناو بوو | شێوەکانی ڕانەبوردوو / داهاتوو | |
|---|---|---|
| ڕابوردووی ئاسایی | | |
| <گرتن> | دە- گر + x | گر – ت + x |
| <کوشتن> | دە- کوژ + x | کوش - ت + x |
| <مردن> | دە - مر + x | مر - د + x |

بزانە:

دە = پێشگری ڕانەبوردوو

ت، د = پێشگری ڕابوردوو — INFL =

AGR = x

دابەشبوونی تەواوکەرانەی کەرەستەسەرەتاییەکانی کات لەنێوان فۆڕمەکانی ڕابوردوو و ڕانەبوردوو و داهاتووداو دابەشبوونی ڕژێمی کردارەکان بەسەر ئەم دوو تافە[٤٦٠] سەرەکییەدا دەریدەخەن و نییشانیدەدەن، کە شوێنی ڕاستەوخۆی پشت ڕەگی کردار، شوێنی بنەڕەتیی وەچەپێکهاتەی INFL ەو دەبێت یان بە کات یان بە کەسی لکاو پڕببێتەوە. ڕستەی جییەکان بەڵگەی کەرەستەیی[٤٦١] باوەڕپێکەرمان دەدەنێ. ئەم چەشنەی ڕستە یان بە کۆمەکی دروستەی ڕستەسازیی جیاوازیان بەیاریدەی پێشگری مەرجیی وخوازیاریی[٤٦٢] /ب/

[٤٥٦] Ableitung der Verbformen ؛ هەڵگواستنی ڕەگەزەکانی وەك ناو، ئاوەڵناو ... Derivation

[٤٥٧] Konstituente der Flexion

[٤٥٨] Formelelemente

[٤٥٩] freie Affixe

[٤٦٠] Tempud oder Tempusform

[٤٦١] Beweismaterialien

ڕستەسازیی جیاواز یان بەیاریدەی پێشگری مەرجیی وخوازیاریی[٤٦٢] /ب/ دروستدەکرێت. ئەم چەشنەی ڕستە بە یاریدەی واژەگۆکەری مەرجیی[٤٦٣] <ئەگەر> بەبەرهەم دروستدەکرێت.

٢٠٧- (pro) t بمگرتنایە ، ...
i j i j

٢٠٨- (pro) t بیان گرم ، ...
i j j i

ئەگەر کردارەکە وەچەپێکهاتەی کاتی تێدابێت، ئەوا کردارەکە خۆی کاتەکە دەردەبڕێت. ئەگەر کردارەکە خۆی وەچەپێکهاتەی کاتی تێدانەبێت، ئەوا کاتەکە بەیاریدەی کەرەستەیەکی سەرەتایی کرداردروستکەری دیکە دەردەبڕدرێت. ئەم کەرەستەسەرەتاییانە لە (٢٠٧) و (٢٠٨) دا بەدیدەکرێن.

٢٠٩- ئەگەر (pro) t دەمگرتن، ...
i j i j

٢١٠- ئەگەر (pro) t دەیان گرم، ...
i j j i

ئەگەر ڕستەیەکی سەرەتایی دوو وەچەپێکهاتەی کاتی تێدابێت، ئەوا کردارەکە یاسائاسا یەکێك لەو دوو وەچەپێکهاتەیەی تێدایە. وەچەپێکهاتەی کاتی کردارەکە خۆی تاق[٤٦٤] کردارەکە و ڕستەکە دەردەبڕێت (بڕوانە (٢٠٩) و (٢١٠))).

## کام ڕاستییانە دەتوانرێن لەو ڕستانە هەڵبهێنجرێن و بەدەستبخرێن؟

لە (٢٠٧) و (٢٠٨) دا پێشگرو کەرەستە سەرەتاییەکانی کەس لە پێش کردارەکەوەن. بۆیە شوێنی بنەڕەتیی یان قوڵی وەچەپێکهاتەی INFL بە /ت/ (کات) پڕبووەتەوە. بەپێچەوانەوە لە (٢٠٩) و (٢١٠) دا شوێنی دروستەیی قوڵی وەچەپێکهاتەی INFL بە

---

[٤٦٢] Konjunktivpräfix

[٤٦٣] Konjunktivpartikel

[٤٦٤] Tempus

کەرەستەسەرەتاییەکەی کەس (AGR) پڕبووەتەوە، چونکە لەو کردارانەدا کات لە پێش ڕەگی کردارەکەوەیە. ئەم ڕاستییانە دەیسەلمێنن، کە وەچەپێکهاتەی INFL لە بنەڕەت و ئاستی قوڵدا لە پشت ڕەگی کردارەوە هاتووەتەبەرهەم و کە ئەم شوێنە پێویستە بە یەکێك لەو دوو کەرەستە فەرهەنگییە پڕبکرێتەوە (نابێت هەرگیز چۆڵ بێت).

٢١١- ڕێپێدانی دەستووریی بە بوونی کات و کەس (INFL)
INFL، کاتێك ڕێی دەستووریی پێدەدرێت، کە شوێنە بنەڕەتییەکەی (پاش ڕەگی کردار) بە یەکێك لە دوکەرەستەفەرهەنگییەی کات یان کەس پڕبووبێتەوە.

ئەم شییکردنەوەیەیش هەندێك ڕاستیی و ڕووداوی وەها ڕووندەکاتەوە، کە تا ئێستایش ئاشکرانەبوون: ئێستا ئەو ڕاستییە بەسەرکەوتوویی سەلمێنراوە، کە کەرەستەسەرەتاییەکەی تاف فۆرمەکانی کرداری ڕابوردوویش پاشگرە. سەرەڕای ئەمەیش ڕوونبووەتەوە، بۆچی هەندێك کۆنسۆنانت یان کۆمەڵێك لە کۆنسۆنانت لە کردارە ڕانەبوردوو داهاتووەکاندا دەقرتێنرێن و لادەبرێن[٤٦٥]. لە کۆتایشدا وەها دەردەکەوێت، کە ئەو ئەنجاملێکدانەوەیەی (٢١٢) م ڕاست و ڕەوان بێت؛ ئەمەیش دەریدەبڕێت، کە (٢١٢) هەندێك لە یاسا بنەڕەتییەکانی (یاساکانی ئاستی قووڵی) زاری سلێمانی تێدایەو ئەو یاسایانەی خستووەتەڕوو.

212- a) V′ ⟶ N′′ - V′
b) V′ ⟶ (N′′) – V – I – AGR یان (N′′) – T – V - AGR

**کات و کەس INFL و فرێزی ناویی بکەر N′′-Subjekt :**

وەچەپێکهاتەی کات و کەس، دۆخی ڕێزمانیی بکەریی بە فرێزی ناویی بکەر دەدەن. ئەگەر پێدانی دۆخی ڕێزمانی بکەریی وەك هی بەرکاری ڕاستەوخۆ دروستەبەند بێت، ئەوا چاوەڕێی ئەوە دەکەم، کە پارامێتری ئاڕاستەو ڕووی پێدانی لایەن و ڕۆڵی بابەتانەو بەخشینی دۆخی ڕێزمانیی و مەرجەکانی جێگۆڕکێ ڕێساو سنووربۆدانانی گشتیی زاری سلێمانی بن.
ڕستەکانی (١٧٣) نیپشانیدەدەن، کە پارامێتری ئاڕاستەکردن و ڕووەولایەك لە ڕێزمانی کوردییدا ڕێسایەکی یەکگرتووە. هەر وەك چۆن لە نێوان فرێزی ناویی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ڕاستەوخۆو کردارەکەدا بۆیان هەیە چەند ئارگومێنتێك هەبن یان بووەستن، بەڵگەهێنانەوەکانیش دەریانخست، کە وەچەپێکهاتەی کردار V′ بۆی هەیە لە نێوان فرێزی ناویی بکەرو وەچەپێکهاتەی کات و کەس INFL دا هەبێت. دروستەی ڕستەی وەك (٢١٣) و

---
[٤٦٥] synkopiert

(٢١٤) دەریدەخەن، کە ئەم ڕاستیی و زانیارییانەی بەدەستمخستوون، پەسنکردنێکی دروست و ڕاستی زاری سلێمانیمان دەدەنێ.

٢١٣- ئازاد ئازیزی گرت.
i j i

٢١٤- * t ئازیزی گرت، ئازاد
i i j i

نابێت ڕستەی (٢١٤) لەگەڵ ئەو ڕستانە تێکەڵ بکەین، کە بکەرێکی تریان پێوەلکێنراوە.

٢١٥- (pro) ئازیزی گرت، ئازاد.




بزانە: I = حوکمی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ڕاستەوخۆ کراوە
II = حوکمی دۆخی ڕێزمانیی بکەریی کراوە
III = حوکمی دۆخی ڕێزمانیی بکەریی کراوە (لەڕێی هاونیشانەکردنەوە)

ئەم هاوئاهەنگیی و وێکچوونە[٤٦٦] لەنێوان سەرەڕێزمانیی و تەولوکەرەکانیاندا، نیشانەن بۆ ئەوەی کە کات و کەس INFL و ڕەگی کردار کەرەستەی سەرەتایی فەرهەنگن. ڕیزبوون و سەرەی کەرەستەسەرەتاییەکانیان زۆر بەباشیی بە یاریدەی تیۆریی حوکمکردن و زاراوەکانی ڕووندەکرێنەوە. ئەگەر من ئێستا پێناسەی پەیوەندییەکانی وەچەپێکهاتەو ئاڕاستەکردن بۆ ئاستی (S) ´V یش بخەمەکار، ئەوا دەبێت پەیوەندییەکانی لە نێوان INFL و بکەردا هەن، بەو شێوەیە بن، کە ئەمیان لەلایەن ئەویانەوە وەچە ئاڕاستەبکرێت، بەتایبەتیی حوکمی دۆخی ڕێزمانیی بکرێت. لەم بارەدا دەبێت وەچەپێکهاتەی I (کات) خوشکەگرێی (دەستەگرێ)[٤٦٧] V´(VP) بێت؛ لە بنەڕەتدا، بەواتا لە ئاستی قوڵدا، وەچەپێکهاتەی INFL لەدەرەوەی وەچەپێکهاتەی کردار (VP) ´V دا بەرهەمدێنرێت. بەڵام لەبەرئەوەی INFL لە زاری سلێمانیدا کەرەستەی فەرهەنگییە (مۆرفێمە)، INFL وەچەپێکهاتەیەکی جیاو سەربەخۆ نییە. ئەو وەچەپێکهاتەیەی لەلایەن INFL ی کەرەستە فەرهەنگییەکەوە وەچە ئاڕاستەدەکرێت و لەگەڵید لە کەس و ژمارەدا یەکدەگرێتەوە (وەك یەکن)، بۆی هەیە لێیەوە حوکمی دۆخی ڕێزمانیی بکەریی بکرێت.

ئەم داڕشتەو خستنەڕووە دروستەییە بۆیە پەسەندکراوە، چونکە ڕێزمانێکی ساکارو ئاسانی خستووەتەڕوو، کە پەیوەندی تەواوکەرو سەر تێیدا هاوئاهەنگ و وێکچووە.

ئەم شیکردنەوەیە نەبوونی چەند دروستەیەك لە زاری سلێمانیدا ڕووندەکاتەوە. بۆ نموونە دەریدەخات، کە فرێزی ناویی بکەر یان فرێزی ناویی بەرکاری ڕاستەوخۆ ناتوانرێن بخرێنە پشت کردارەکەوە.

## چۆن فرێزی ناویی بکەر دۆخی ڕێزمانیی بکەریی وەردەگرێت؟

ولیامس[٤٦٨] پێدانی ڕۆڵی بابەتانەی ناوەکیی لە پێدانی ڕۆڵی بابەتانەی دەرەکیی جیادەکاتەوە. ئارگومێنتە دەرەکییەکە لەدەرەوەی پرۆژەی (VP) ´V دا دێتەدیتن. لە کاتێکدا ئارگومێنتە ناوەکییەکان لەناو (VP) ´V دا لەلایەن ئەو سەرەڕێزمانییانەوە ڕۆڵی بابەتانەیان پێدەدرێت، کە پرۆژەکەی خۆیان بەرهەمهێناوە؛ فرێزی ناویی بکەر لەلایەن (VP) ´V ەوە ڕۆڵی بابەتانە وەردەگرێت، زۆرجاریش بە لێکدراویی[٤٦٩] و بەتایبەتیی لەلایەن پرۆژەکەی `V (VP) ەو، کە پرۆژەگەورەکەی (S) ´V ە.

بەپێی ئەم ڕوونکردنەوەیە، فرێزی ناویی بکەر نە لەلایەن V´(VP) ەوە وەچەدیارییکراوەو نە تەواوکەرێکی V´(VP) ەکە یە. چونکە وەچەدیارییکردن و تەواوکەرێتیی

---

[٤٦٦] Homogenität

[٤٦٧] Schwesterknote

[٤٦٨] Williams (1981)

[٤٦٩] Maranz (1981)

نیشـــانەتایبەتییەکانی ســـەرەڕێزمانییەکانن، نـــەك هـــی ڕەگـــەزی فرێزەکـــان. کەواتـــە نیشـانەتایبەتییەکانی پێدانـی ڕۆڵـی بابەتانـەی (V´(VP لـە هـەمان نیشـانەتایبەتییەکانی سـەرەڕێزمانییەکان نیـین و نیشانەتایبەتییەکانیشـیان وەکـو ئـەو نیشـانەتایبەتییانە نیـین. لەبەرئەمەیە ڕەنگە فرێزی ناویی بکەر لە (V´ (VP ەوە ڕۆڵی بابەتانە وەربگرێت، بەڵام دۆخی ڕێزمانیی لێوە وەرنەگرێت. ئەمانە ئەوە دەبەخشن، کە بکەر ڕۆڵی بابەتانەو دۆخی ڕێزمانیی لە کردارشکاندنەوە[٤٧٠]ی زەنگینەوە، لە کات TENSE و کەسەوە AGR، وەردەگرێت.

پەیوەندییـەکان لـە LGB[٤٧١] دا دروسـتەیی، بـە واتـا بـە پێـی دروسـتەکان، پێناسـەو دیاریکراون. لەم ڕێیەوە جۆری پەیوەندیی تەواوکەرێك بەرامبەر بە ڕەگەزە فەرهەنگییەکەی (سـەری ڕێزمـانیی) و پـەیوەندی ئـەم ڕەگـەزە فەرهەنگییـە بەرامبـەر بـە ڕەگـەزێکی دییکـە ڕوونکراوەتەوەو چەسپێنراوە.

پڕاوپڕ بە پێی ئەم پێناسەیە دەتوانرێت ئەم ڕاستییانە بۆ زاری سلێمانیی دیارییبکرێن و بچەسپێنرێن:

٢١٦- (ا) کەرەستەســـەرەتاییەکان لـــە ڕێـــی پەیوەندییـــەکانی تەواوکەرێتییـــەوە ڕێـــی دەستووریيان پێدراوەو ناسراونەتەوەو دەستنیشانکراون و جیاکراونەتەوە.

(ب) ڕۆڵەبابەتییـەکان لـە ئاسـتی قووڵـداو دۆخـی ڕێزمـانیی لـە ئاسـتی ڕووکەشـدا لـە لای چەپەوە بۆ لای ڕاست دەبەخشرێن.

(پ)دۆخی ڕێزمانیی بەستراوە بە شوێنی چەسپاوو نەگۆڕەوە، بە واتا بەتەنها بەو شوێنانە دەدرێت؛ کەواتە پێدانی دۆخی ڕێزمانیی پابەندی دروستەیە -دروستەبەندە-.

(ت) پێدانـی دۆخـی ڕێزمـانیی نەبەسـتراوە بەمـەرجی هاوسـێیەتیی ئارگومێنتەکانـەوە؛ لـە نێوان سەرەڕێزمانییەکەداو ئارگومێنتەکەیدا (تەواوکەرەکەیدا) دەشێت چـەند ئـارگومێنتێکی تر هەبن.

شوێنی بکەر، لە ئاستی پێدانی دۆخی ڕێزمانییدا، لە پەیوەندییەکی تەواوکەرییدایە لەگەڵ I NFL دا. چونکە ئەو ئارگومێنتانەی لەنێوان فرێزی ناویی بکەرو IN FL دا هەن، گشتیان لە ڕەگەزی V ن. وەچەپێکهاتـەی کـەس AGR ی هەیـەو کەسـیش نیشـانەتایبەتییەکانی[٤٧٢] "کەس و ژمارە و دیاریکراویی[٤٧٣] " وەردەگرێت. ئەو شـوێنی بکەرەی لەلایـەن وەچەپێکهاتـەی INFL ەوە بەتوندیی حوکمیکراوەو ئەو فرێزە ناوییەی بکەر، کە لـەو شوێنەدایەو لە نیشـانە

---

[٤٧٠] Flexion

[٤٧١] Chomsky "LGB" (1981)

[٤٧٢] Merkmalspezifikation

[٤٧٣] Definitheit گشتیی یان تایبەتیی

تابەتییەکانییدا لەگەڵ INFL دا هاونیشانەیە، لەو INFL ەوە دۆخی ڕێزمانیی دروستەیی وەردەگرن. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت، کە فرێزی ناویی بکەر لە INFL ەوە دۆخی ڕێزمانیی بکەریی وەردەگرێت؛ ئیتر گرنگ نییە، ئەگەر چەند ڕەگەزێکی ´V ی تریش لەنێوانیاندا هەبن یان نا.

شوێنی بکەر، شوێنی لایەنی بابەتانەیە، کە لە ئاستی بنەڕەتدا بەرهەمهێنراوە. ئەم شوێنە هەندێك جار ڕەگەزێکی بۆش وەردەگرێت -ڕەگەزێکی بۆشی دەبێت-، کە نیشانەتایبەتییەکانی لە ڕەگەزی INFL ەوە بۆ دەگوێزرێتەوەو پێیدەدرێت. ئەم شوێنە شوێنێکی حوکمکراوە. ئەو ڕەگەزە بۆشەی لێرەدا بەدەردەکەوێت، ناوی pro ی لێنراوە. ئەو زمانانەی ئەم ڕەگەزەبۆشەیان هەیە، بەناوی زمانە جێناوە خراوەکان [٤٧٤] ناسراون. نیشانەتایبەتییەکانی، بەهۆی یان لەڕێی کردارشکاندنەوەی زەنگینەوە [٤٧٥] دەدۆزرێنەوەو دەناسرێنەوە. ئەو فرێزە ناوییەی بکەر، کە لەسەر ئاستی ڕووکەش SS وەك فرێزێکی ناویی بکەری فەرهەنگیی بەرجەستەنەبووە [٤٧٦]، دەتوانرێت لەڕێی ڕەگەزی INFL ەوە بناسرێتەوەو دەستنیشانبکرێت و جیابکرێتەوە. لەبەرئەوەی شوێنی فرێزی بکەر لە زاری سلێمانیدا بەتوندیی لەلایەن INFL ەوە حوکمی دۆخی ڕێزمانیی دەکرێت و لەبەرئەوەی کەس AGR ی هەیە، دەتوانێت دیاردەی خستنی جێناو لە شوێنی بکەردا نیشانبدات.

٢١٧- (ا) (سکاڵا) نوست 0.
(ب) (ئەو) نوست 0.
(پ) (pro) نوست 0.

o o

لە ڕاستیدا نابێت V وەك I سەیربکرێت؛ هەردووکیان یەك چەشت نین. چونکە کردارەکە بەشێوەیەکی تر دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ڕاستەوخۆ بە ئارگومێنتە ناوەکییەکە دەدات وەك لەوەی چۆن INFL دۆخی ڕێزمانیی بکەریی بە ئارگومێنتەدەرەکییەکە دەدات (سەیری خوارەوە بکە).

## کات و کەس INFL و ڕەگەزەبۆشەکان:

---

[٤٧٤] pro-drop-Sprachen بڕوانە: Jaeggli (1980), Rizzi (1982)

[٤٧٥] reiche Flexion

[٤٧٦] nicht lexikalisierte NP-Subjekt

پێناسەی تیۆرییەکەی چۆمسکی، کە تیۆری حوکمکردنە[٤٧٧]، جارێکی تر لەلایەن ترافیس[٤٧٨]ەوە، لەسەربناغەی بۆچوونەکانی پێشووی ستاول[٤٧٩] و لاسنیك/سایتۆ[٤٨٠]، لەسەربناغەی گۆکردنیی پێناسەیکراوەتەوە. زاراوەکانی "حوکمکردن" و "حوکمکردنی توند/تەواو" لەیەك جیاکراونەتەوە. کە لە زمانی ئینگلیزیدا بۆ نموونە، فرێزەناوییەکەی بکەر ناتوانرێت دەربهێنرێتەدەرەوە[٤٨١]، هۆی ئەوەیە کە لەلایەن سەرێکی نافەرهەنگییەوە، کە INFL ە، حوکمدەکرێت. بەپێی ئەم تیۆرییە بەتەنها سەرەفەرهەنگییەکان دەتوانن حوکمی توند بکەن. بۆ ترافیس شوێنەکانی هەردوو ئارگومێنتە ناوەکیی و دەرەکییەکان دەتوانرێن توند حوکمبکرێن. کە فرێزی بەرکاری ڕاستەوخۆ[٤٨٢] دەتوانرێت دەربهێنرێتەدەرەوە، فرێزی ناویی بەلام ناتوانرێت، بۆ ترافیس هۆی ئەوەیە، کە یەککەمیان لەلایەن سەرێکی فەرهەنگییەوەو دووهەمەکەیان لەلایەن سەرێکی نا فەرهەنگییەوە حوکمیدەکرێت. ڕەگەزی INFL ی زاری سلێمانی ناوەرۆکێکی فۆنۆلۆژیی هەیە. گشت ئارگومێنتەکان لەلایەن سەری فەرهەنگییەوە توند حوکمدەکرێن. کە لە زاری سلێمانیدا فرێزی بکەر ناتوانرێت دەربهێنرێتەدەرەوە، دەبێت هۆی دییکەی هەبێت؛ هۆکەیش پارامێتری ئاڕاستەو ڕووی پێدانی دۆخی ڕێزمانییە.

لەوە دەچێت، زاراوەکانی حوکمکراوو حوکمی توندکراو بۆ زاری سلێمانی گرنگ نەبن. چونکە زاری سلێمانیی دیاردەی کەلێن[٤٨٣] نیشاننادات و نییەتی.

218-Here are the books$_i$ which they bought $e_i$ without knowing whether they had to read $e_i$.[484]

---

[٤٧٧] Chomsky (1981)

[٤٧٨] Travis (1984)

[٤٧٩] Stowell (1981)

[٤٨٠] Lasnik/Saito (1984)

[٤٨١] extraponieren

[٤٨٢] NP-Objekt

[٤٨٣] Lückenphänomene (Gaps)

[٤٨٤] Travis (1984)

٢١٩- ئەمانە ئەو قوتابیانەن، کە  تۆ   t   دەیان ناسیت.
i      j      j   i          j          j

ئـەم زاراوەیـە هێنـدەی بـۆ زمانــە جێناوەخراوەکـان گرنگــە، هێندەیــش بــۆ ئێمــە گرنگــە؛ گرنگییەکەیشی لەوەدایە، کە شوێنی بکەرەکەی حوکمی تەواو توند دەکرێت.
ئــەو نیشـانەتایبەتییانەی لــە INFL دان، یارمـــەتیماندەدەن و ئــەو هەلومەرجــەمان بـــۆ دەڕەخسێنێنن، چەند چەشنێکی ڕەگەزی INFL لەیەك جیابکەینەوە.

(ا) کات و کەس ی INFL ی زەنگین، چەشنی یەککەم:
ئـەم چەشـنەی کـات و کـەس هێنـدە زەنگینـە، کـە دەتوانرێـت لـە ڕێیـەوە ئـەو ´´N انـەی ئامازەدارن[٤٨٥] و ئەو ´´N انەی نیشانەی تایبەتیی [- تایبەتیی ] [٤٨٦] یان هەیە، بناسرێنەوەو جیابکرێنەوە.

٢٢٠- (pro)  لەوەدەچێت، (نەوزاد)  نەخۆشبێت.
i              i     j              j

(ب) کات و کەسی زەنگین، چەشنی دووهەم:
ئەم چەشنەی کات و کەسەیش هێندە زەنگینـە، کە دەتوانرێت لە ڕێیەوە ئەو ´´N انـەی ئامازەدارن و نیشانەی  تایبەتیی [+تایبەتیی] یان هەڵگرتووە، بناسرێنەوەو جیابکرێنەوە.

٢٢١- (pro)  دوێنێ هاتن.

(پ) چەشنی سێ هەم، کات و کەسی لاواز یان هەژار:
لــەڕێی ئــەم چەشــنەی کــات و کەســەوە دەتوانرێـت بەتەنـها ئـەو ´´N انــە بناســرێنەوەو جیابکرێنەوە، کە ئامازەدار نین و هیچ نیشانەیەکی تایبەتییان نییە.

٢٢٢- .Expl  ئاشکرایە، کە ...

---

٤٨٥ referentiell

٤٨٦ [definit-]، بەواتا [+گشتیی]

٢٢٣- .Expl وادیاره، ...

ڕەگەزی کات و کەس ڕێ بە کۆمەڵێکی تایبەتیی لە کردارەکانی وەك کردارەکانی ئاووبا[٤٨٧] دەدات، کە هاونیشانەکردن لە نێوان کرداری لاوازو ئەو کەرەستەیەی لە ناو ´V کەدا هەیە، ببێت.

٢٢٤- سەرما یە.
٢٢٥- گرانیی یە.
٢٢٦- درەنگ گە.
٢٢٧- باران ە.

گرنگترین نیشانەتایبەتییەکانی کات و کەس لە زاری سلێمانیدا، کەس و ژمارەو تایبەتیی (دیاریکراویی) ن. کاتێك کات و کەس لەگەڵ جێناوی سفری شوێنی بکەر هاونیشانەن، دەبێت لەم نیشانەتایبەتیانەدا وەکیەك بن و یەکبگرنەوە (ڕێکەوتن). نیشانەی تایبەتیی [+ تایبەتیی] بۆ ئەوەیە، ئەو ´´N انەی ئامازەدارن لەو ´´N انە جیابکرێنەوە، کە ئامازەدار نین. هەندێك کەرەستەی expletive هەن، نیشانەی تایبەتیی زگماکیی (کات و کەس لەچەشنی یەککەم) یان هەیە. ئەم چەشنەیان لە پێکهاتەی بکەرنادیارەکاندا دەبینرێنەوە، کە بێ کەسن.

٢٢٨- ئەگەر pro توانرا، قەڵاکە بگیدرێت، ...
i i j j

کەرەستەسەرەتاییەکەی کەس یاسائاسا لەگەڵ "NP,, ´V ,´´N دا هاونیشانەیە. دەبێت بۆ هەر کردارێك، کە ئارگومێنتێکی دەرەکیی هەیە، فرێزێکی ناویی بۆش (٢٢٢) و (٢٢٣) یان فرێزێکی ناویی فەرهەنگیی(٢٢٤) تا (٢٢٥) هەبێت. کەرەستەسەرەتاییەکانی، ئامازەدارنیین[٤٨٨] (٢٢٢) و (٢٢٣)، بەرجەستەبووی[٤٨٩] پێدانی دۆخی ڕێزمانیین. کەرەستەسەرەتاییەکانی، ئامازەدار نین، هیچ ڕۆڵێکی بابەتانەیان پێنادرێت، چونکە نیشانەی تایبەتیی [+کەس][٤٩٠] یان نییە. کەواتە شوێنی ئەو کەرەستانەی، کە ئامازەدەر

---

[٤٨٧] Wetter-Verben

[٤٨٨] pleonastische Elemente

[٤٨٩] Manifestation

[٤٩٠] [person+]

نیین، شوێنی لایەنی بابەتانە نییە، بەڵکو شوێنی دۆخێکی ڕێزمانییە. شوێنی بکەری کردارەکانی پەیپێبردن[٩١]، کە نیشانەی تایبەتیی [+کەس] ی زگماکییان هەڵگرتووە، شوێنێکی لایەنی بابەتانەیە. نموونەکانی (٢٢٩) و (٢٣٠) بەڵگەی بەهێزن بۆ ئەوەی، کە کردارەکە نیشانەی تایبەتیی زگماکیی هەڵگرتووە.

٢٢٩- (pro) لەوە دەچێت، کێ نەخۆشبێت؟
j j i i

٢٣٠- کێ لەوەدەچێت، (pro) نەخۆشبێت؟
j j i i

٢٣١- ئەگەر قەڵاکە توانرا، (pro) بگیرێت، ...
٢٣٢- ئەگەر (pro) توانرا، چیی بگیرێت، ...
٢٣٣- ئەگەر چیی توانرا، (pro) بگیرێت، ...

ئەگەر ئێمە ئەم ڕستانە لەگەڵ ڕستەی (٢٢٠) دا بەراورد بکەین، دەبینین، کە دروستەی ڕستەی وەك (٢٢٠) ناتوانێت جۆری ئازادی (ئەڵتەرناسیۆنی) وەك ئەم دروستانەی هەبێت. ئەمەیش بەڵگەیەکی تری گرنگە بۆ ئەوەی، کە نیشانە تایبەتییەکەی [ + تایبەتیی] لە زاری سلێمانیدا شوێن و گرنگیی خۆی هەیە.

٢٣٤- * ئەوزاد لەوەدەچێت، (pro) نەخۆشبێت.
i i i i

کورتەیەکی لێدوانەکە: دەبێت بکەری لۆژیکیی یان بەشێوەیەکی فەرهەنگیی یان بۆش هەبێت و ئامادەبێت. توانای پێدانی لایەنی بابەتانەو دۆخی ڕێزمانیی کردار بۆ دەرکەوتنی فرێزی بکەری فەرهەنگیی و بۆشی ئاماژەدار یان بۆشی نائاماژەیی گرنگە. ئەو کەرەستەیەی لەلایەن کات و کەسەوە حوکمدەکرێت، دۆخی ڕێزمانیی بکەریی وەردەگرێت. لەبەرئەمەیە، ئەو کەرەستەسەرەتاییەی کەس لەگەڵ کەرەستەیەکی تردا هاونیشانەیە، کە خەسڵەتی [ + دۆخی ڕێزمانیی بکەریی] هەڵگرتووە.

---

[٩١] Erkenntnisverben

له دیارییکردن و چەسپاندنی ڕیزبوونی وشە لە ڕستەدا، کات و کەس INFL ڕۆڵێکی گرنگ دەبینن. لە ڕێی ئەم ڕەگەزەوە توانیم دروستەی S-O-V بۆ زاری سلێمانی بچەسپێنم. ـە ڕێی زیادکردی ئەم ڕەگەزەوە بۆ کۆکەرەستە[٤٩٢]ی ڕەگەزەکان توانرا پارامێتری ئاڕاستە باش تر بچەسپێنرێت.

## جێناوەلکاوەکان[٤٩٣]:

لە کاتێکدا کەرەستەسەرەتاییەکەی کەس (جێناوی لکاوی بکەر[٤٩٤]) ی شێوەکانی کرداری ڕانەبوردوو/داهاتوو لە ناو کردارەکەدا دەبینرێتەوە، لە شێوەکانی کرداری ڕابوردوودا لە شوێنی تریشدا دەدۆزرێتەوە. دروستە چەسپاوەکەی"جێناوی لکاو+ قەدی کردار" یان "قەدی کردار+ جێناوی لکاو" ی فۆڕمەکانی کرداری ڕانەبوردوو/داهاتوو لەگەڵ دروستە جێگیربووەکەی "قەدی کردار + جێناوی لکاو" یان "جێناوی لکاو + قەدی کردار" ی فۆڕمەکانی کرداری ڕابوردوو، کە بەرامبەر بەیەکن، نیيشانەیەکە بۆ ئەوەی، کە دەرکەوتنی جێناوی لکاوی بکەر لە شوێنی تردا، دیاردەیەکی یاسابەندەو هەندێك مەرج و سنووری دیارییکراوی هەیە.

ڕێپێدانی دەستووریی بە بوونی کات و کەس دەریدەخات، کە شوێنی کات و کەس کاتێك ڕێی دەستووریی پێدەدرێت، کە بە کەرەستەی فەرهەنگیی کات یان کەس پڕبووبێتەوە. شوێنی بنەڕەتیی کات و کەس لە فۆڕمەکانی کرداری ڕابوردوودا هەمیشە بە کات پڕبووەتەوە. هەمان شوێن لە فۆڕمەکانی کرداری ڕانەبوردوو داهاتوودا بە کەس گیراوە.

با وەهای دابنێین، کە شوێنی کات و کەس لە گشت تافەکاندا و لە ئاستی ڕووکەشدا هەڵگرێکی لەناو (VP) ´ V دا هەیەو دەبێت بەو هەڵگرەوە ببەسترێت.

ئێستا ئێمە دەزانیین، کە شوێنی کات و کەسی کردارەڕانەبوردوو/داهاتووەکان بە کەرەستەی سەرەتایی کەس گیراوە. ڕێپێدانی دەستووریی بە کات و کەس، کە ڕێنادات هەرگیز شوێنی کات و کەس چۆڵ بێت، ڕێش نادات کە جێناوی لکاوی بکەر لە شوێنێکی تردا دەربکەوێت. بەڵام شوێنی بنەڕەتیی کات و کەسی فۆڕمەکانی کرداری ڕابوردوو بە کات پڕبووەتەوە. بۆیە کەسی کردارە ڕابوردووەکان ئازادەو ئەم ئازادییەی کەس کارناکاتەسەر ڕێپێدانی دەستووریی بە کات و کەس.

٢٣٥- دە گر م (پێشگری ڕانەبوردوو "کات" + ڕەگی کردار + جێناوی لکاوی بکەر)

---

٤٩٢ Inventar

٤٩٣ Klitika

٤٩٤ Subjektklitik

٢٣٦- * دە گر
٢٣٧- * دە م گر

(٢٣٦) هەرگیز ڕێپێنادرێت. (٢٣٧) کاتێك ڕێپێدەدرێت، کە شوێنی بنەڕەتیی کات و کەسی کردارەکەی بە کەرەستەی کات پڕبێتەوە. ئەم بارە لە فۆرمە مەرجییەکانی کردارەکەدا بەدیدەکرێت. چونکە کەرەستەی کات لەم شێوە ڕستانەدا بە ئاسانیی دەبینرێتەوە.

٢٣٨- ئەگەر دەمگرت، ... (پێشگری ڕانەبوردوو + جێناوی لکاو + ڕەگی کردار + پاشگری کاتی ڕابوردوو)

با وەهایشی دابنێم، کە کردار شوێنی تایبەتیی بۆ جێناوەلکاوەکان هەیە. هەر وەك لە داهاتوودا بۆماندەردەکەوێت، جێناوەلکاوەکان، کە بە کۆمەڵ پێکەوە دەردەکەون، بە پێی تاقی کردارەکان بەتەنها یان بەکۆمەڵ ڕیزبوونی جیاوازیان دەبێت.

ئەو کەرەستانەی دەشێن هەڵگری جێناوەلکاوەکان بن:
ئەگەر جارێکی تر بە ڕستەکانی (٢٠٢) و (٢٠٣) لەگەڵ (٢٠٥) تا (٢٠٨) دا بچینەوەو بە وردیی تێیانبڕوانین، ئەوا بۆماندەردەکەوێت، کە ئەو کەرەستەسەرەتاییانەی لای خوارەوە دەتوانن ببن بە هەڵگری جێناوی لکاوی بکەر.

٢٣٩- (ا) کردارەکە، وەك لە (٢٠٢) دا، کەواتە: قەدی کردار + جێناوی لکاوی بکەر؛
(ب) کرداری ئاڵۆز، وەك لە (٢٠٣) دا، کەواتە: قەدی کردار + جێناوی لکاوی بەرکار + جێناوی لکاوی بکەر؛
(پ)پێشگری مەرجیی و پێشگری ویست و ئارەزوو، وەك لە (٢٠٥) دا، کەواتە: پێشگری مەرجیی و پێشگری ویست و ئارەزوو + جێناوی لکاوی بکەر + قەدی کردار + جێناوی لکاوی بەرکار؛
(ت) کرداری ئاڵۆز، وەك لە (٢٠٦) دا، کەواتە: پێشگری مەرجیی و پێشگری ویست و ئارەزوو + جێناوی لکاوی بەرکار + ڕەگی کردار + جێناوی لکاوی بکەر؛
(ج)پێشگری ڕانەبوردوو، وەك لە (٢٠٧) دا، کەواتە: پێشگری ڕانەبوردوو + جێناوی لکاوی بکەر + قەدی کردار + جێناوی لکاوی بەرکار؛
(چ) کرداری ئاڵۆز، وەك لە (٢٠٨) دا، کەواتە: پێشگری ڕانەبوردوو + جێناوی لکاوی بەرکار + ڕەگی کردار + جێناوی لکاوی بکەر؛
(ح) فرێزی ناویی بەرکاری ڕاستەوخۆ، وەك لە (٢١٠) دا، کەواتە: فرێزی ناویی بەرکاری ڕاستەوخۆ + جێناوی لکاویی بکەر + قەدی کردار؛

(خ) پێشناوی نارەسەن، وەك لە (٢٤١) دا، کەواتە: پێشناوی نارەسەن + جێناوی لکاوی بکەر + قەدی کردار + جێناوی لکاوی بەرکار.

٢٤٠- نەوزاد لە منی دا.

٢٤١- نەوزاد t لێیدام.

ئەو کەرەستانەی دەتوانن ببن بە هەڵگری جێناوی لکاوی بکەر، یان بەشی دروستکەری کردارەکەن یان فریزی ناویی بەرکاری ڕاستەوخۆی کردارن. هەر وەك چۆن تاق کردار نیشانیدەدات (بڕوانە: (٢٠٢ - ٢٠٨)، ئەم دیاردەیە یان هۆکاری ڕستەسازیی یان هۆکاری فۆنۆلۆژیی هەیە یان هەردوو هۆکارەکەی هەیە. لەبەر بێ شوێنیی لێرەدا لەم کێشەو بابەتە نادوێم.

## شوێنەکانی جێناوەلکاوەکان لەناو کرداردا:

کردار چەند شوێنێکی تایبەتیی بۆ جێناوەلکاوەکان هەیە؛ لەو شوێنانەدا جێناوی لکاوی بکەر و بەرکار دەردەکەون. جێناوی لکاوی بەرکار کاتێك دەتوانێت لەناو کرداردا دەربکەوێت، کە فریزی ناویی بەرکارە ڕاستەوخۆیەکە ئاخنرابێتەناو کردارەکەوە[٤٩٥]. بەڵام جێناوی لکاوی بکەر، کاتێك لەناو کردارەکەدا دەبینرێت، کە فریزی ناویی بەرکاری ڕاستەخۆیەکە شوێنەبنەڕەتییەکەی خۆی بۆ بەجێهێشتبێت. ڕیزبوون و جۆری دەرکەوتنی جێناوەلکاوەکان بەکۆمەڵ یان بەتەنها، وابەستەی تاق کردارو چەشنی کردارەکەن[٤٩٦]. هەندێك لە جۆرە ئازادەکانی ڕیزبوونی کەرەستەسەرەتاییەکان لەلایەن ڕێپێدانی دەستووریی کات و کەسەوە I NFL دیاریی و دەستنیشانکراون. ئەم زانیارییە سینتاکسییانە جڵەوی ئەوەیان گرتووە، چۆن و بەکام جێناوەلکاوانە دەبێت شوێنەکانی جێناوەلکاوەکان پڕبکرێنەوە.

(ا) قەدی کرداری ڕابوردوو + جێناوی لکاوی بکەر + جێناوی لکاوی بەرکاری ڕاستەوخۆ

٢٤٢- من t گرتمن.

---

[٤٩٥] in das Verb inkorporiert

[٤٩٦] Tempus und Modus des Verbs

٢٤٣- من t دەیان گرم.

ئەگەر کردارەلێکدراوەکە کەرەستەیەکی سەرەتایی کرداردروستکەری زگماکی خۆی هەبوو، ئەوا کردارەکە ئەم دروستەیەی دەبێت، کە دیسان وابەستەی تاق کردارەکەیە.

٢٤٤- ئازیز t خلیکردنەوە.

ئەم جۆرەکردارانە لەگەڵ ئەو کردارانەی وەك <داگرتن> و <هەڵواسین> بەراورد بکە!

(ب) ئاوەڵناو + جێناوی لکاوی بکەر + قەدی کرداری ڕابوردوو + جێناوی لکاوی بەرکاری ڕاستەوخۆ:

٢٤٥- نەسرین t پاکیکردنەوە.

ئەو کردارە لەگەڵ کرداری وەك <جوانکردن> و <سوورکردنەوە> بەراورد بکە!

(پ) پێشناو + جێناوی لکاوی بکەر + قەدی کرداری ڕانەبوردوو + جێناوی لکاوی بەرکار بڕوانە (٢٤١) و لەگەڵ کرداری وەك <هەڵگرتن> و <داگرتن> دا بەراوردی بکە! کردارەئاڵۆزەکەی ڕانەبوردوو داهاتوو هەمان دروستەی کردارەکانی (٢٤٤) و (٢٤٥) یان هەیە. جیاوازیی گرنگ لە نێوان ئەو دوو تافەدا ئەوەدایە، کە شوێنی جێناوەلکاوەکانیان دەگۆڕنەوە؛ بەواتا جێگۆڕکێ بە شوێنی جێناوەلکاوەکان دەکەن.

٢٤٦- ئازیز t خلیان دەکاتەوە.

٢٤٧- نەسرین t پاکیان دەکاتەوە.

٢٤٨- ئەوزاد    لێم    t دەدات.

بەم پێیە شێوەی تاڤ کردارەکە دروستەی کرداری ئاڵۆزو لەگەڵ ئەمیشدا دروستەی ڕستە دیاریدەکات. ئەو کردارانەی لەگەڵ پێشگری مەرجیی و ویست و ئارەزوو /ب/ دا دەردەکەون، هەڵسوکەوتیان وەك هەڵسوکەوتی کرداره لێکدراوەکانە. لەمەوە ئەوە هەڵدەهێنجین، کە ئەم زمانە مەیلی ئەوەی هەیە، ئەم دوو تافە (ی کردار) لەیەك جیابکاتەوەو لەیەکیان بترازێنێت. لەئەنجامی ئەمەیشدایە، کە دەتوانرێت چەشنی کردارو لە ڕێیەوە دارشتنی چەشنەجیاوازەکانی ڕستە بەتەنها بە یاریدەی ئەو جێناوەلکاوانەو گواستنەوەی شوێنەکانیان بهێنرێنەدیتن. پاشانیش بۆمان دەردەکەوێت، کە کردارەئاڵۆزەمەرجییەکان دوو کاتیان هەیەو ئەو کاتەی لە شوێنی بنەڕەتیی کاتی کردارەکەدایە، کاتی (تاڤ) سەرەکیی کردارەکە دەردەبڕێت (بڕوانە: ئەگەر دەمگرتیت، ...).

ئەگەر ئێمە شوێنی جێناوەلکاوەکانی ڕستەکانی (٢٤٤) تا (٢٤٨) لەگەڵ یەکدا بگۆڕینەوە، ئەوا ئێمە ڕستە مەرجییەکانی[٤٩٧] بەرامبەریانمان چنگدەکەوێت. هەندێك لەو دروستانەی ڕستە، کە لەسەر ئاستی ڕووکەش ڕێیانپێنادرێت، لەبەرئەوە ڕێیانپێنادرێت، چونکە ئەو ڕستانە هەندێك مەرجی پێکهاتەکانی تری ڕێزمانی کوردیی بریندارەدەکەن. لەبەرئەوەی کردارەمەرجییەکان[٤٩٨] بەتەنها بەیاریدەی پێشگری ڕانەبوردوو و بە کۆمەکی پێشگری مەرجیی[٤٩٩] دروستدەکرێن و لەبەرئەوەی زمانەکە ئەم دوو تافە لەیەك جیادەکاتەوە، چاوەڕێدەکرێت کە ئەو پێشگری مەرجییە /ب/ بۆ فۆرمەکانی ڕابوردوو (ئەگەر بمگرتنایە) و پێشگری ڕانەبوردوو /دە/ بۆ فۆرمەکانی ڕانەبوردوو (ئەگەر دەمگرتن) تەرخانکرابێتن؛ بەڵام بڕوانە (٢٤٩) و (٢٥٠).

٢٤٩- (ئەگەر) (من) t بیانگرم.

٢٥٠- ئەگەر (من) t دەیانگرم.

---

[٤٩٧] Konditionalsätze

[٤٩٨] Konjunktivverben

[٤٩٩] Subjunktivpräfix

ئەگەر شوێنی بنەڕەتیی وەچەپێکهاتەی کات و کەس INFL بە کەرەستەسەرەتاییەکەی کات TENSE گیرابێت، ئەوا بەرامبەر بەم تافانەی کردارە ڕانەبوردووەکان، تافەکانی کردارەڕابوردووەکان دەوەستنەوە. لەو ڕێیەوە ئەم جۆرەی ڕستە مەرجییەکانمان دەستدەکەوێت.

٢٥١- ئەگەر (من) t دەم گرتن.

لەو ڕوونکردنەوانەی سەرەوە ئەوەمان بۆدەرکەوت، کە جێناوی لکاوی بکەر شوێنێکی خۆی لە ناو کرداردا هەیە؛ بەڵام ئەگەر جێناوەلکاوەکە لەپێش کردارەکەوە هەڵگرێکی هەبێت، ئەوا لەشوێنێکدا لەپێش کردارەکەوە بەدەردەکەوێت. بۆ ئەم مەبەستەیش ئەم پاڵێوەری هەڵگرە دادەڕێژم:

٢٥٢- پاڵێوەری هەڵگری جێناوی لکاو
جێناوی لکاوی بکەر بە X ەوە ببەستەوە!
بزانە: X = هەڵگرێکی ڕێپێدراوە.

لە کاتێکدا ڕێپێدانی دەستووریی کات و کەس، ڕێ بە (٢٥٣) نادات، (٢٥٢) ڕێ بەم چەشنە ڕستانەیش نادات.

٢٥٣- * ئازاد ئازیزێت دەگر
٢٥٤- * ئازاد دوێنێی ئازیز گرت

ڕستەی (٢٥٣) بۆیە ڕێپێنادرێت، چونکە شوێنی بنەڕەتیی کات و کەس INFL لەم کردارەئاڵۆزەدا یان لەم ڕستەیەدا چۆڵە. ڕستەی (٢٥٤) بۆیە نەبوونەکراوە، چونکە ئاوەڵکردارەکەی ئەم ڕستەیە، کە جێناوی لکاوی بکەری پێوەبەستراوە، هەڵگرێکی دەستووریی جێناوی لکاوی بکەر[٥٠٠] نییە.

٥٠٠ legitimer Klitikträger

# بەشی سێ هەم

## دۆخی ڕێزمانیی[٥٠١]

لە ڕاڤەکردن و لێدوانەکانی لەمەودوامدا دروستەی .S.O.V.I پەسەنددەکەم و دەیکەم بە بناغەی لێکۆڵینەوەکانم، بۆ ئەوەی ڕوونیبکەمەوە چۆن پێدان و بەخشینی دۆخی ڕێزمانیی لە زمانی کوردییدا گۆدەکات. هەوڵدەدەم نیشانەتایبەتییەکانی تایبەت بە زمانەکەمان، لە چێوەی تیۆریی دۆخی ڕێزمانییدا پەسنبکەم: نیشانەتایبەتییەکانی وەك نەبوونی بەرزکردنەوەی بکەر[٥٠٢] سەرەنجامی ئەو ڕاستییەیە، کە زاری سلێمانیی ڕستەی تەواوکەری چاوگیی[٥٠٣] نییە؛ زاری سلێمانیی لەناو ڕێساجیهانییەکاندا[٥٠٤] ژمارەیك ڕێسای بۆخۆی هەڵبژاردووەو ئەمەیش هەندێك تایبەتمەندێتیی بە زارەکە بەخشییوە. ئەم لێکۆڵینەوەو پشکنینانە بۆیە چەقیی و ناوەندیین، چونکە تیۆریی دۆخی ڕێزمانیی چەق و ناوەندی ڕاستەقیینەی ڕژێمی ڕێزمانە.

### ١/٣) ڕوونکردنەوەی گشتیی و پێویست

فۆڕمە جیاوازەکانی دۆخی ڕێزمانیی بەگشتیی نیشانەتایبەتییەکانی فرێزەناوییەکانن. لەبەرئەوەی جێناوەسەربەخۆکانیش دەتوانن فرێزی ناویی بن، دەیشتوانن فۆڕمە جیاوازەکانی دۆخی ڕێزمانیی بن. ڕژێمی جێناوەسەربەخۆکانی زمانی ئینگلیزیی و ئەڵمانیی ڕوون ترین نموونەمان بۆ ئەم مەبەستە دەخەنە بەردەست:

1- /I/, /you/, /he/, /she/, /it/ nominative or subjective

---

٥٠١ Case (theory)

٥٠٢ Subjektanhebung, Subject Raising

٥٠٣ Infinitiv-Komplementsatz, infinitive complement sentence

٥٠٤ Universal Principles

دۆخی ڕێزمانیی بکەریی

/Ich/, /du/, /er/, /sie/, /es/

/me/, /you/, /him/, /her/, /it/ acusative or objective

دۆخی ڕێزمانیی بەرکاریی (ڕاستەوخۆ)

/mich/, /dich/, /ihn/, /sie/, /es/

/my/, /mine/, /him/, /her/, /it/ genetive or dative

دۆخی ڕێزمانیی خستنەپاڵ و (پێشناویی) خستنەژێر

/mir/, ihm/, /ihr/, /sein/

## زاری سلێمانیی مۆرفۆلۆژیی دۆخی ڕێزمانیی نییە!

ئەو لایەنەمان بۆ ڕوونبووەوە، کە فرێزەناوییەکانی ئەم زارە بەپێی شوێنە چەسپاوەکانیان لە ڕستەدا دۆخی ڕێزمانییان پێدەدرێت. بەڵام ئەم ڕاستییە سەرەنجامێکی فۆنەیتیکیی نابێت. بەواتا ئەو دۆخە ڕێزمانیانەی بە شوێنەکانی فرێزەناوییەکانی ڕستە دەدرێن و لەو شوێنانەیشدا فرێزەناوییەکان دۆخەڕێزمانییەکان وەردەگرن، دۆخەڕێزمانییەکان نە دەبن بە مۆرفیم و نە لە شێوەی گۆڕینی ناوەکیی فرێزەکاندا بەرجەستە دەبن (بڕوانە (١))؛ بە هیچ شێوەیەك بە فۆنەیتیکیی نابیسترێن. ئەگەر بە فۆنەیتیکیی ببیسترانایە، ئەوا فۆڕمە جیاوازەکانی دۆخی ڕێزمانیی وەك نیشانە تایبەتییە جۆراوجۆرەکانی شوێنی فرێزەناوییەکان لێکدەدرایەوە.

بەڵام دەبێت ڕێزمانی زمانی کوردیی زنجیرەیەك لە یاسای هەبێت، کە گۆکردنە سینتاکسییەکان و نیشانەتایبەتییە ڕێزمانییەکانی فرێزەناوییەکان و وەچەپێکهاتەکانی[٥٠٥] دیاریی و دەستنیشانبکەن. لەبەرئەمەیە ناتوانرێت بۆ پەسنکردنی فرێزەناوییەکان واز لە تیۆریی دۆخی ڕێزمانیی بهێنرێت. چونکە پەسنکردنی سینتاکسیی هەر زمانێکی، گۆکردنە سینتاکسییەکانی بە مۆرفۆلۆژیی دەرنابڕدرێن و لەڕێی مۆرفۆلۆژییەوە ناناسرێنەوە، بەبێ تیۆریی دۆخی ڕێزمانیی و بەبێ دەربڕینە فۆڕمالیستییەکانی (زاراوەو دەربڕاوی ماتماتیکیی)[٥٠٦] و بەبێ چەمکە بەکارهێنراوەکانی، نەك هەر کەموکووڕیی دەبێت، بەڵکو نەبوونەکراویش دەبێت.

---

٥٠٥ Konstituente

٥٠٦ formale Ausdrücke

با لەپێشدا پرسیار لە بکەرو بەرکاری بەشی کردار[507] بکەین و بە دوایاندا بچیین. بکەر چۆن لەبەرکار جیادەکرێتەوە؟ بەگشتیی مۆرفێمەکانی ناسیاریی و نەناسیاریی[508] و پاشگرە کۆتاییەکان[509] ئامارژەن بۆ رەگەزە رێزمانییەکان[510] و بەتایبەتیی بۆ نیشانەکانی دۆخی رێزمانیی. بکەرەکە دۆخی رێزمانیی بکەریی و بەرکارەکە دۆخی رێزمانیی بەرکاریی هەیەلام لە زاری سلێمانییدا بکەر چۆن دەتوانرێت لەبەرکار جیابکرێتەوە، ئەگەر پاشگرە کۆتاییەکان و مۆرفێمەکانی ناسیاریی و نەناسیاریی بەشدارییەك لەم جیاکردنەوەیەدا نەکەن و نەبن بە یارییدەدەرێك؟ با وەهای دابنێم، کە دۆخەرێزمانییەکان بەنادیاریی نەخشێنراوو دارێژراون[511] و هەن. ئەم گریمانەیە رێماندەدات، ئەمەی لای خوارەوە بچەسپێنین:

بکەر دۆخی رێزمانیی بکەریی هەڵگرتووە.

بکەر لەگەڵ بەشی کرداردا هاونیشانەیە (رێکەوتووە لە کەس و ژمارەدا)[512].

ڕاستە، کە دۆخی رێزمانی زمانەکمان بە مۆرفۆلۆژیی بەرجەستە نابێت، بەلام بە دروستەیی هەیەو ئامادەیە[513]. بۆ ئەمەیش دوو مەرج یان سەنگی محەك هەن:

(ا) فرێزەناوییەکان شوێنی چەسپاویان لەناو رستەدا هەیە.

٢- (ا) من تۆم گرت.
(ب) * تۆ منم گرت
(پ) * من گرت تۆم
(ت) * گرت من تۆم

(ب) لە رستەی بکەرنادیاردا، دۆخی رێزمانیی بکەریی بە فرێزەپێشناوییەکان دەدرێت.

٣- لە من درا.
٤- لە من دەدرێت.

---

[507] Prädikat
[508] Artikel
[509] Endungen
[510] grammatische Kategorien
[511] abstrakt repräsentiert
[512] kongruent
[513] strukturell vorhanden

لەو ڕاستییەوە، کە پێدانی دۆخی ڕێزمانیی وابەستەی دروستەیەو دروستەییە، دەتوانرێت ڕەگەزە ڕێزمانییەکانی وەك بکەرو بەرکار لەڕێی پەیوەندییەکانی نێوان گرێکانەوە[514] بناسرێنەوەو دەستنیشانبکرێن و پێناسە بکرێن:

[NP, S] ئەوە دەبەخشێت، کە ئەو فرێزە ناوییە بکەری ڕستەکەیە، کە ڕاستەوخۆ لەژێر گرێی ڕستەکەوە[515] S هەڵگوێزراوە.

[NP, VP] ئەوە دەبەخشێت، کە ئەو فرێزە ناوییە بەرکاری ڕاستەوخۆی کردارەکەیە، کە ڕاستەخۆ لە فرێزی کردارییەوە هەڵگوێزراوە.

[PP, VP] ئەوە دەبەخشێت، کە بەرکاری ناڕاستەوخۆ بیچمی PP یەکی هەیەو لە ژێر ڕکێفی فرێزێکی کرداریيدایە.

[S, VP] ئەوە دەبەخشێت، کە فرێزی کردار ئەو وەچەپێکهاتەی ڕستەیە[516] یە، کە لە گرێیەکی S ەوە (ئەگەر کرداری یاریدەدەر هەبوو، بەواتا Aux) هاتووە، کە ڕاستەوخۆ لەژێر ڕکێفی S ێك دایە، یان لە فرێزێکی کردارییەوە فراوانکراوەتەوە، کە ڕاستەوخۆ لە ژێر ڕکێفی فرێزێکی کرداریی دیکە دایە. ئەمەی دواییان بۆ زمانی کوردیی دەخوات، چونکە لە زمانی کوردییدا Aux نییە.

با ئەوە لەچاو گومنەکەین و لەیادمان نەچێت، کە مەرجەکانی (ا) پەیوەندیی نێوان گرێکان و (ب) ڕێکەوتن و هاونیيشانەیی بکەرو بەشی کردار[517] بۆ ناسینەوەو دیارییکردنی بکەری ڕستە گرنگ ترین ڕۆڵدەگێڕن. ئێستایش دێمەوە سەر بکەری ڕستەو بەرکاری کردار. دەزانین، کە شوێنی هەر دوو ڕەگەزە ڕێزمانییەکە وابەستەی ڕۆڵە سینتاکسییەکانیانن و کە وشەی پرسیار بەبێ جوڵاندن لە شوێنی بنەڕەتیی خۆیدا لە ڕستەدا دەمێنێتەوە. مانەوەی وشەی پرسیار لە ڕستەدا نیيشانیدەدات، ئەگەر لە ڕستەیەکدا پرسیار لە وەچەپێکهاتەی بکەر یان لە وەچەپێکهاتەی بەرکار دەکرێت یان نا.

ئەگەر وشەی پرسیارەکە ڕاستەوخۆ لەژێر ڕکێفی گرێی ڕستەکەدا بوو، ئەوا پرسیار لە بکەری ڕستەکە دەکرێت.

٥- کێ تۆی گرت؟

---

[514] Knotenrelationen

[515] Satzknote

[516] Konstituentensatz

[517] Subjekt-Prädikat-Kongruenz

ئەگەر وشەی پرسیارەکە ڕاستەوخۆ لەژێر ڕکێفی فرێزی کرداریدا بوو، ئەوا بە جێناوەپرسیارییەکە[518] پرسیار لە بەرکارەکە دەکرێت.

٦- تۆ کێت گرت؟

بکەری ڕستەو بەرکاری کردار دەتوانرێن تەنها دروستەیی لەیەك جیابکرێنەوە. هاونیشانەیی بکەرو بەشی کرداریش بۆ جیاکردنەوەی بکەرو بەرکاری هەر ڕستەیەك لەیەکتری زۆر گرنگە.

## ٢/٣) تیۆریی دۆخی ڕێزمانیی[519] و وەچەرژێمەکانی[520]

گۆکردنە سینتاکسییەکان ڕێنادەن بە مۆرفۆلۆژیی و ناتوانرێن لە ڕووی مۆرفۆلۆژییەوە بناسرێنەوە. لەبەر ئەمەیە بۆ پەسنکردنی ئەم بەڵگەهێنانەوانە پشت بەو تیۆرییەی دۆخی ڕێزمانیی چۆمسکیی[521] دەبەستم، کە تێیدا سێ زاراوە گرنگ ترین وەچەرژێمەکانی تیۆرییەکەین:

(ا) حوکمکردن[522]:
بەپێی ئەو تیۆرییە ئەمە دەخوات: X حوکمی Y دەکات، ئەگەر X گچکە ترین گری[523] بێت، کە وەچەئاراستەی[524] Y دەکات و ئەگەر لە نێوان X و Y دا هیچ سنوورێکی گەورەترین پرۆژە[525] نەبێت.
ڕەگەزە ڕێزمانییەکانی بۆ پێدانی دۆخی ڕێزمانیی وەك سنووری گەورەترین پرۆژەیەك گۆدەکەن، گەورەترین پرۆژەکانی زمانن، بۆ نموونە:

---

[518] Wh-Pronomen

[519] Kasustheorie, case theory

[520] Subsystem, subsysteme

[521] Chomsky (1981:160 ff)

[522] Rektion بروانە: Chomsky (1980:12), „Markedness and Core Grammer"

[523] minimale Knoten

[524] c-commandieren

[525] maximale Projektion

رستە S گەورەترین پرۆژەی INFL ەو INFL یش سەری رستەیە.
فرێزی کرداریی VP گەورەترین پرۆژەی کردارە V.
فرێزی پێشناویی PP گەورەترین پرۆژەی پێشناوە P و ... هتد.

ئەمانەیش بۆ زمانی کوردیی بەم شێوانە دەنەخشرێنرێن و دەخرێنەڕوو.

٧- (ا) حوکمکردنی N´´1 لەلایەن کردارەوە.




٧- (ب) حوکمکردنی N´´ لەلایەن پێشناوەوە.




لە (٧ ب) دا N´´1 لەلایەن پێشناوێکەوە P حوکمی کراوە؛ لەبەرئەوەی گەورەترین پرۆژەیەك، فرێزەپێشناوییەکەیە PP، کەوتووەتە نێوان N´´1 و کردارەکەوە V، کردارەکە ناتوانێت حوکمی N´´1 بکات. لە (٧ پ) دا کردارەکە ناتوانێت حوکمی N´´1 بکات، چونکە گەورەترین پرۆژەیەکی کردار لەنێوان کردارەکەو ئەو N´´1 ەدایە. لەڕاستییدا N´´1 لە (٧ پ) دا لەلایەن INFL ەوە حوکمکراوە.

٧- (پ)



(ب) ڕەگەزە حوکمکەرەکان[٥٢٦]

کەرەستەسەرەتاییە حوکمکەرەکان[٥٢٧]، وەك ڕوونکرایەوە، ڕەگەزە فەرهەنگییەکانی[٥٢٨] لە چەشنی X ن.

(پ) ڕۆڵی بابەتانەو سەنگی محەك و مەرجەکانی بابەتانە

کە ڕستە بکەری هەیەو دەبێت بکەری هەبێت، دەگەڕێتەوە بۆ ڕێسای پڕۆژەسازدان[٥٢٩] و حاڵەتێکی تایبەتیی ئەم ڕێسایەیە. بەڵام هەڵبژاردن و دیارییکردنی دروستەیەکی پڕاوپڕو تەواو گونجاو لەلایەن کردارەکەوە دەکرێت. کردار لە ڕستەدا شوێنەکان دەکاتەوە، کە دەبێت پڕبکرێنەوە. ئەو ڕستەیەی هیچ بکەرێکی نییە، لە ڕێی ڕێسای پڕۆژەسازدانەوە ڕێی پێنادرێت. کردارەکە پەیوەندییە سیمانتیکییەکانی وەك بوون بە ئاگێنت[٥٣٠] یان ئامێر[٥٣١] یان تێمای[٥٣٢] (بابەت[٥٣٣]) ی چالاکیی (جموجۆڵ و کردەیەك)[٥٣٤] دەچەسپێنێت. بەخشینی ئەم زانیارییە خراوەڕووانە، پێدانی ڕۆڵە بابەتییەکانی وەك ئاگێنت و بابەت و مەبەست/ئامانج[٥٣٥] و ... هتد، لە سەر ئەو ئاستە، لەلایەن کردارەوە جێبەجێدەکرێت، کە دانانی کەرەستەفەرهەنگییەکان[٥٣٦] تیایدا ڕوودەدات. لەم ڕێیەوە بە هەر شوێنی ئارگومێنتێك[٥٣٧] ڕۆڵێکی بابەتانەی گونجاو دەدرێت.

پێدانی ڕۆڵی بابەتانە بابەت و کەرەستەی چەند مەرج و سنووردیارییکردنێکە؛ لەو مەرج و سنوورەدانراوانەوە سەنگی محەك و مەرجەبنەماییەکانی ڕۆڵەبابەتییەکان[٥٣٨] هەلقولاون و

---

[٥٢٦] regierende Kategorien

[٥٢٧] regierende Elemente

[٥٢٨] lexikalische Kategorien, lexical categories

[٥٢٩] Projektionsprinzip

[٥٣٠] Agent

[٥٣١] Instrument

[٥٣٢] Thema

[٥٣٣] Objekt

[٥٣٤] Tätigkeit

[٥٣٥] Ziel

[٥٣٦] lexikalische Einsetzung, lexical insertion

[٥٣٧] Argumentstelle, argument position

[٥٣٨] Theta-Kriterium

هەڵهێنجراون. ئەم زاراوەی ڕۆڵەبابەتیانە[539] بە وەچەرژێمێکی ڕێزمانی جیهانییە[540] و ئەوەی چەسپاندووە، کەفرێزێکی ناویی لە هەر شوێنی ئارگومێنتێکدا دەبێت و کە هەر شوێنێکی ئارگومێنتێك تەنها بە یەك فرێزی ناویی پڕدەکرێتەوە.

## ٣/٢) یاساکانی پێدان و بەخشیینی دۆخی ڕێزمانیی لە زمانی کوردییدا

چۆمسکی[541] دوو جۆر لە ئەگەری پێدانی دۆخی ڕێزمانیی لەیەك جیاکردووەتەوە. یەکێکیان "پێدانی دۆخی ڕێزمانیی بۆماوە"[542] و دووهەمیان "پێدانی دۆخی ڕێزمانیی دروستەیی"[543]ە. تا ئێستا ویستوومە پاساوی ئەوە بدەمەوە، کە دۆخی ڕێزمانیی لەزمانی کوردییدا وابەستەی دروستەیەو دروستەییە. بۆ ئەوەی دەریبخەم، چۆن فرێزەناوییەکان شوێنە گونجاوەکانیان وەردەگرن و چۆن دۆخی ڕێزمانیی لە زمانەکەدا گۆدەکات، بابەتەکە لە دوو وەچەپاردا ڕووندەکەمەوە.

### ٣/٢-١) دۆخی ڕێزمانیی بکەر

لەو مەرجەوە دەردەچم ودەستپێدەکەم، کە زمانەکەمان خاوەنی دۆخی ڕێزمانیی دروستەییە؛ فرێزێکی ناویی بە ئۆتۆماتیکیی دۆخی ڕێزمانیی بکەریی پێدەدرێت، ئەگەر کردارێکی کات و کەسدار[544] هەبێت.

٨- ئەوان گەرمایانە.
٩- (pro) گەرمایانە.
١٠- گەرما یە.
١١- زوو وە.

---

[539] Theta-Rolle

[540] Longendoen (1970), Anderson (1971), Filmore (1986)

[541] Chomsky (1981)

[542] پێدانی دۆخی ڕێزمنیی بۆماوە (ویراسیی) ererbte Kasuszuweisung

[543] strukturelle Kasuszuweisung, structural case

[544] finites Verb, tensed Verb کردارێك، کە کات و کەسێکی (جێناوی لکاو بکەری) هەبێت یان لە تەکییدا بێت.

١٢- (pro) لەوەدەچێت، ... هتد.
١٣-.Expl ئاشکرایە، کە ... هتد.

شوێنی بکەر لە (٨) دا بە جێناوێکی سەربەخۆ لە (٩) دا بە جێناوێکی سفر "pro" و لە (١٠) دا بە بە ناوێك و لە (١١) دا بە ئاوەڵکردارێك پڕبووەتەوە. لە (١٢) بە کەرەستەیەکی سەرەتایی جێناویی[٥٤٥] گیراوە. لەمانەوە ئەم ئەنجامە هەڵدەهێنجم.

١٣- هەر کردارێك بە لایەنی کەمەوە ئارگومێنتێکی هەیە.

بکەر، ئەگەر فرێزێکی ناویی فەرهەنگیی بەرجەستە[٥٤٦] بێت (وەك لە (٨) دا) یان نا (وەك لە (١١) دا)، دۆخی ڕێزمانی پێدەدرێت. بەڵام چۆن دۆخی ڕێزمانیی بەیاریدەی زاراوەکانی "حوکمکردن" و "وەچەئاڕاستەکردن" بە بکەر دەدرێت؟ زاراوەی "بکەر" لەڕێی زاراوەی "ڕستەی کات و کەسدار[٥٤٧]"وەو بەپێی پێناسەی دۆخی ڕێزمانیی دروستەیی[٥٤٨] و"حوکمکردن" بەم شێوەیە پێیدەزانرێت و ڕووندەکرێتەوە.

١٤- NP دۆخی ڕێزمانیی بکەریی هەڵدەگرێت، ئەگەر لەلایەن "کات و کەسەوە[٥٤٩]"وە حوکمبکرێت.

ڕێکەوتنی (هاونیشانەیی) بکەرو کردار:
ئەو گواستنەوەیەی لەڕێەوە نیشانە تایبەتییەکانی بکەر بۆ کردارەکەی دەگوێزێتەوە، ناوی هاونیشانەی لێنراوە. کاتێك ئەم گواستنەوەیە بەکردەوە جێبەجێدەکرێت، ئەگەر NP یەك هەبێت و بکەری بەشێکی کرداری دوای خۆی بێت. لەبەرئەوەی گواستنەوەکە لەسەر دروستەی ڕووکەش[٥٥٠] ڕوودەدات، گواستنەوەکە لە ڕستەی ئاڵۆزدا دوو جار جێبەجێدەکرێت؛ لە ڕستەی سەرەکیی (شاڕستە)[٥٥١] و لە ڕستەی وەچەپێکهاتە[٥٥٢]دا.

---

Pronominales Element [٥٤٥]

lexikalisch manifeste NP [٥٤٦]

finiter Satz [٥٤٧]

strukturelle Kasus [٥٤٨]

TENSE [٥٤٩]

Obrflächenstruktur, surface Structure [٥٥٠]

Matrixsatz [٥٥١]

ڕوونکردنەوەکانی تا ئێستام نیشانەی پرسیار دەخەنەسەر بوونی ئەم یاسای گواستنەوەیە لە زمانی کوردییدا.

ڕستەی سەرەکیی و ڕستەی وەچەپێکهاتە:

چۆمسکی[٥٥٣] ڕستەی وەچەپێکهاتەی کات و کەسدار لە ڕستەی وەچەپێکهاتەی بێ کات و کەس جیادەکاتەوە. ڕستەکەسدارەکان وەچەپێکهاتەی کاتیان تێدایە. ڕستە شکاوەکانی[٥٥٤] زمانی ئینگلیزیی، بۆ نمونە، دەتوانن ڕستەی بێکەس (بێ کات) بن، بەڵام ڕستە تەواوکەرەکانی[٥٥٥] زمانی کوردیی گشتیان کات و کەسدارن.

کردارەکاتدارەکەی ڕستەی وەچەپێکهاتەی (١٥) <بخات> یان کردارە کاتدارەکەی (١٦) <دابنێت> داوای دەرکەوتنی دۆخی ڕێزمانیی بکەریی و بەم شێوەیە داوای بکەرێك دەکات.

١٥- ئازاد دەیەوێت، pro شووتییەکە بخاتە ناو کانییەکەوە.

١٦- نەسرین دەیەوێت، pro گوڵدانەکە لەسەر مێزەکە دابنێت.

کردارەکەی ڕستەی وەچەپێکاتەی ڕستەکان کردارێکی کاتدارە؛ ویست و ئارەزوویەك دەردەبڕێت و بەستراوە بە کەسێکی دیارییکراوەوە یان بۆ ئەوکەسە دەگەڕێتەوە. شوێنە بابەتانە چۆڵکەی بکەر (شوێنی بکەری بێ بابەت)[٥٥٦]ی ڕستەی وەچەپێکهاتەی (١٥) و (١٦)، هەر وەك ڕوونکرایەوە، بە ئارگومێنتێك گیراوەو پڕکراوەتەوە. بەمەیش مەرجەکانی سەنگی محەکی ڕۆڵی بابەتانە (تێتا) و مەرج و پێوستییەکانی دۆخی ڕێزمانی جێبەجێدەکرێن.

جێناوە سفرە بکەرەکە کەرەستەیەکی سەرەتایی ئازادە. ئەم بکەرە لەم ڕستانەدا لە دەقێکی سینتاکسیی دایە، کە وای دەردەخات، وەك کەرەستەیەکی سەرەتایی کۆنترۆڵکراو لەلایەن کەرەستەیەکی سەرەتایی دییکەوە کۆنترۆڵکرابێت، کە کەوتووەتە دەرەوەی ڕەگەزەحوکمکەرەکەیەوە. پێشوەخت، دەتوانم وەهای دابنێم، کە ئەو pro بکەرە لە زاری سلێمانییدا کەرەستەیەکی سەرەتایی دوولایەنەیە (جووت ڕووە)[٥٥٧] و من ئەم جێناوە بەکراوەیی دەهێڵمەوە، چونکە لە شوێنی خۆیدا دێمەوە سەری و لێیدەدوێم.

---

٥٥٢ Konstituentensatz

٥٥٣ Chomsky (1980:170), „Rules and Representation"

٥٥٤ eingebetee Sätze

٥٥٥ Komplementsätze

٥٥٦ themen-freie Subjektstelle

٥٥٧ zweiseitiges Element

**دۆخی ڕێزمانیی بکەریی لە ڕستەبکەرنادیارەکاندا:**

ئەو هیپۆتێزەیەی من لێوەی دەستپێدەکەم، دەڵێت: زمانی کوردیی جوڵاندن و گواستنەوەی فرێزیی ناویی جێبەجێناکات و ئەو کردارە بکەرنادیارە فەرهەنگییەی[٥٥٨] ناو فەرهەنگ لە توانایدایە، بەبێ گوێدان بە ڕۆڵە بابەتانەکەی ئارگومێنتەکە، ئارگومێنتەکە بە دروستەیی حوکم بکات[٥٥٩]. بۆ کردارە بابەتییەکەی "کردارەبکەرنادیار" ەکە، کە ئارگومێنتێك دەردەبڕێت، یاسای (١٧) بەسەو بەشییدەکات.

$$17\text{-}\ V' \longrightarrow (N'') - V'$$
$$V' \longrightarrow (N'') - V$$

شوێنی ئەو فرێزەناوییەی لە سەر دروستەی ڕووکەش لەلایەن کەرەستەی سەرتایی کردار شکاندنەوەوە[٥٦٠] حوکمدەکرێت [NP,S ] دۆخی ڕێزمانیی بکەریی هەیە. ئەو فرێزە ناوییەی لە [ NP, VP ] حوکمی دروستەیی دەکرێت، دۆخی ڕێزمانیی بەرکاریی هەیە. لەم هەڵسەنگاندنەوەوەم ئاشکرادەبێت، کە وەچەپێکهاتەی تەواوکەرەکان[٥٦١]، بەدەر لە ڕستە S و تەواوکەرە ئاوەڵکردارییەکان[٥٦٢]، وەك فرێزی پێشناویی PP دەردەکەون.

لەمەوە ئەوە هەڵدەهێنجێنم، کە ڕستەی بکەرنادیار[٥٦٣] و ڕستەی بکەردیار[٥٦٤] لە زۆر ڕووەوەو لە بناغەو بنەڕەتدا ڕێکخراوو ڕێکخستنێکی سینتاکسیی[٥٦٥] لەیەکچوویان هەیە.

لەم کورتەوپوختەیەدا دەڵێم، کە پارامێتری (١٨)، ئاکارێکی تایبەتیی زمانە بکەرخراوەکانەو پێدانی دۆخی ڕێزمانیی پێکهاتەکانی بکەرنادیاریش ڕووندەکاتەوە.

١٨- دۆخی ڕێزمانیی بکەریی بەپێی حوکمکردن لەلایەن کەرەستەیەکی سەرەتایی کات و کەسی I NFL کاتدارەوە بە شوێنی فرێزێکی ناویی هاونیشانە دەدرێت.

---

[٥٥٨] lexikalisches Verb

[٥٥٩] stukturell regieren

[٥٦٠] Flexionselement

[٥٦١] Komplementkonstituenten

[٥٦٢] adverbiale Ergänzungen

[٥٦٣] Pasivsatz

[٥٦٤] Aktivsatz

[٥٦٥] syntaktische Organisation

دۆخــی ڕێزمــانیی "کەرەستەســەرەتاییەکەی بکــەری ســفر" ی " پێکــهاتووی ڕســتەی بــێ کەسایەتیی[٥٦٦]:

گریڤنــدۆرف[٥٦٧] ڕێســاکانی پێدانــی دۆخــی ڕێزمــانیی بــەم شــێوانەی لای خــوارەوە خستووەتەڕوو:

١٩- ڕێساکانی پێدانی دۆخی ڕێزمانیی

(ا) لە دروستەی قووڵدا ئەو فرێزە ناوییەی لەلایەن INFL ێکی کاتدارەوە حوکمکراوە، لە گەڵ INFL ەکەدا هاونیشانەیە.

(ب) ئەوەی دێتە شوێنی فرێزە پێشناوییە هاونیشانەکراوەکەوە، بە بۆمانــەوە (وەرەســە) مارکەی نیشانەکەی[٥٦٨] بۆ دەمێنێتەوە؛ ئەوەی لەوەوە دەرچووە، بۆی دەمێنێتەوە.

(پ) ئــەو فرێــزە ناوییــەی، لەلایــەن INFL ێکــی کاتییــەوە حوکمکــراوەو لەگــەڵییدا هاونیشانەیە، لەسەر دروستەی ڕووکەش دۆخی ڕێزمانیی بکەریی وەردەگرێت/پێیدەدرێت.

شــوێنی بکــەر بەتەنــها لەلایــەن کردارشــکاندنەوەوە نەبەســتراوەتەوە، بــەڵکو لەلایــەن ئــەو حوکمکەرەیشــەوە[٥٦٩] بــەتوندیی حوکمکــراوە[٥٧٠]. ئــەم پەیوەندییــە لــە نێــوان شــوێنی بکــەرو حوکمکەرەکــەیدا ڕێــدەدات نیشــانە تایبەتییــەکان و ئاکارەکــانی کلیتیکــەکانی بکــەر[٥٧١] و مێکانیزمی پێدانی دۆخی ڕێزمانیی بکەریی دیاریی و دەستنیشانبکرێن.

کلیتیکەکانی بکەر AGR[٥٧٢]، کە لــە ڕێــی یاســایەکی گریڤندۆرفــەوە "یاســای جوڵاندنــی لاگر"[٥٧٣] (ی)[٥٧٤] بــۆ کردارەکــە دەگوێزرێنــەوەو کەرەستەســەرەتاییەکەی شــکاندنەوەی کــردارن[٥٧٥]، لەســەر دروســتەی ڕووکــەش زۆر زەق و دیــار بەرجەســتەبوون. دارشــتەو خستنەڕووی هاونیشانەکردن فۆرمێکی نوسینەوەی ئاشکرای هەیە.

---

[٥٦٦] unpersönliche Satzkonstruktion

[٥٦٧] Grewendorf (1986:133)

[٥٦٨] Index

[٥٦٩] Regent

[٥٧٠] streng regiert

[٥٧١] Subjektklitika

[٥٧٢] Agreement

[٥٧٣] Affixbewegungsregel

[٥٧٤] کورتکراوەی یاساکەیە.

[٥٧٥] Flexionselement

داڕشتەی هاونیشانەکردن بە گوێرەی ئەم ناوەرۆکە بەرهەمی دەستکەوتووی پرۆسەی هاونیشانەکردنە. ئەوەی بۆ من گرنگە، بەکارهێنانی سەرپشکیی یاسای (ی) یە لە زمانە بکەرخراوەکاندا/بکەر دەرنەبڕدراوەکاندا[٥٧٦]. چونکە یاساکە دەتوانرێت هەم لە پێکهاتەی فۆنۆلۆژییداو هەم لە پێکهاتەی سینتاکسدا جێبەجێبکرێت. لەبەرئەوەی AGR (جێناوی لکاوی بکەر/کلیتیکی بکەر[٥٧٧]) کەرەستەیەکی سەرەتایی [+pronoun] یان [-pronoun] ە (لەتەکیدا شوێنی بکەر لە دروستەی قووڵدا دۆخی ڕێزمانیی وەردەگرێت و بەتایبەتیی لەئاستی لۆژیکدا حوکمی توند دەکرێت)، دوو ئاستی پێدانی دۆخی ڕێزمانیی هەن: ئاستی قووڵ و ئاستی ڕووکەش. ئەگەر جێناوی لکاوی بکەر لەبەر نیشانەتایبەتییەکەی [+pronoun] وەك کەرەستەیەکی سەرەتایی ئاماژەدەر[٥٧٨] لێکدرایەوە[٥٧٩] و ئەگەر INFL (T+AGR)[٥٨٠] وەك ئەمە خۆی دۆخی ڕێزمانیی هەبێت، ئەوا شکاندنەوەی کردار[٥٨١] لە زاری سلێمانییدا نە وەك کەرەستەیەکی جێناویی و نەوەك ئاماژەدەرێك هەیەو دەردەکەوێت.

ئەگەر شکاندنەوەی کردار (کات و کەسی لکاوی) نیشانەی تایبەتیی جێناویی هەبێت، ئەوا فرێزە ناوییە ئاماژەدەرەکەی بکەر لەڕێی زەنگینیی نیشانەتایبەتییە ڕێزمانییەکەوە لە دروستەی ڕووکەشداو و لەلایەن INFL ەوە دۆخی ڕێزمانیی بکەریی وەردەگرێت. کەرەستە سەرەتاییە فەرهەنگییەکان و بکەرە سفرە جێناوییەکە بەم شێوەیە حوکمی دۆخی ڕێزمانییان دەکرێت.

ئەگەر شکاندنەوەی کردار هیچ نیشانەیەکی تایبەتیی جێناویی نەبوو، ئەوا دۆخی ڕێزمانیی لە ئاستی قووڵدا جێبەجێدەکرێت. ئەو بکەرە بۆشانەی، بە دروستەیی ڕێی دەستووریانپێدراوە، ناتوانن لەبەر لاوازیی یان بێهێزیی نیشانەتایبەتییە ڕێزمانییەکان ئەگەری لێکدانەوەیان هەبێت. ئەمە بکەرە هێزدەربڕە بۆشەکان[٥٨٢] دەگرێتەوە.

هێزدەربڕەکان[٥٨٣] و لە ئارگومێت-چووەکانی[٥٨٤]، کە لەژێر سەرناوی "هێزدەربڕەبۆشەکان[٥٨٥]" دا کۆکراونەتەوە، بکەرە بێکەسایەتییەکانن[٥٨٦]. بکەرە

---

[٥٧٦] pro-drop-languages

[٥٧٧] لێرەداو بۆ لەمەودوا مەبەستمان لە "جێناوی لکاوی بکەر" subjectclitic ە، کە نە جێناوەو نە بکەرەو نە دەتوانێت ببێت بە بکەر.

[٥٧٨] Referentielles Element

[٥٧٩] Rizzi (1982)

[٥٨٠] T کورتکراوەی TENSE ە و "کات" یان پێکهاتەی کات دەبەخشێت.

[٥٨١] Verbflexion کەسی لکاو AGR ە و کات tense ە.

[٥٨٢] Leere expletive Satzsubjekte

[٥٨٣] Expletive

بێکەسایەتییەکانیش لە دەربڕینی/گوتەی بەنرخ[٥٨٧] و کردارە ئاووباییەکاندا[٥٨٨] و لە هەندێك وەچەپێکهاتەی تایبەتییداو لەکردارەکانی پەیپێبردندا[٥٨٩] وەك ئارگومێنت مامەڵەدەکەن[٥٩٠].

20- * What rains?

لەم پێکهاتووانەدا شوێنی بکەر لە زاری سلێمانییدا یان بە کەرەستەی فەرهەنگیی پڕبووەتەوە (٨ و ١٠ و ١١) یان بکەرە سفرە جێناوییەکەی تێدایە (٩)؛ لەبەر ئەمەیە ئەم ڕستانە ڕێزماندروستن:

٢١- کێ گەرمایەتیی؟
٢٢- چی یە؟
٢٣- (ا) کێ لەوە دەچێت، ... ؟
(ب) چیی لەوە دەچێت، ... ؟

جێناوی سفر:
کە زمانە بکەرخراوەکان بکەری سفری جێناوییان هەیە، لەو ڕێیەوە پاساویدەدرێتەوە، کە "ڕستەی سەرجێناویی[٥٩١]" بکەری سفریان هەیە. چونکە ڕێزماننادروستیی "ڕستەی کە[٥٩٢]" لە لایەن "چۆمسکیی و لاسنیك[٥٩٣]" کەوە لەڕێی "پاڵێوەری that t" ەوە ڕوونکراوەنەتەوە.

24- * Who do you think that saw Bill?

---

٥٨٤ quasi-Argumente

٥٨٥ Expletivum

٥٨٦ unpersönliche Subjekte

٥٨٧ Wendung جۆرێکە لە دەربڕینی ئیدیۆمیی Redewendung

٥٨٨ Wetterverben

٥٨٩ Erkenntnisverben

٥٩٠ Chomsky (1981)

٥٩١ Relativsatz

٥٩٢ daß Sätze, that sentense

٥٩٣ Chomsky/Lasnik (1977)

ئەو شوێنی بکەرەی توند لەلایەن کات و کەسی لکاوەوە حوکمکراوە، ئەو نیشانە تایبەتییە سینتاکسییە بەو زمانانە دەبەخشێت، کە بۆ زمانە بکەر دەرنەبڕاوەکان[٥٩٤] ئاکارو نیشانەیەکی تایبەتییە.
لەو نیشانەتایبەتییە سینتاکسییانە لە زمانی کوردییدا حازروبزریی (نەبوونی) بکەرە لە ڕستەی سەرەکیی و ڕستەی وەچەپێکهاتەدا (٩) و لە ڕستەی لکاو یان هەڵواسراودا (٢٥).

٢٥- (ا) لەبەرئەوەی نەوزاد نەخۆشە، ...
(ب) نەوزاد، لەبەرئەوەی (pro ) نەخۆشە، ...

گواستنەوەی بەپێچەوانەوەی[٥٩٥] بکەری ڕستە لە زاری سلێمانییدا لەڕێی پارامێتری ئاڕاستەکردنی[٥٩٦] پێدانی دۆخی ڕێزمانییەوە نەبوونەکراوە.

٢٦- * t هاتن، ئەوان.

لەکاتێکدا دەرکەوتنی بکەری سفری جێناویی بۆ چۆمسکیی[٥٩٧] لەڕێی دیاریکردنی ناوەڕۆکەکەیەوە یاسابەند ڕێپێدراوە، دەرکەوتنەکەی بۆ زمانەوانی ئیتالیی "ڕیتسی"[٥٩٨] بەشێوەیەك لە ڕێی ئەم ڕێسا-پارامێترییەوە جڵەوگیراوە، کە بەبێ ئەوەی بکەرە سفرەکە وابەستەی ناوەڕۆکەکەی بێت، دانانی جێبەجێدەکرێت.

٢٧- ڕێپێدانی دەسووریی یاسابەند بە pro
p ro ی بکەر لەڕێی سەرێکی نیشانەکراوی X ی Y یێکی دیاریکراوەوە حوکمی ڕێزمانیی دەکرێت[٥٩٩].

لەبەرئەوەی ئەو سەرەی ڕێی دەستووریی دەدات، وەچەپێکهاتەی IN FL ەو لەبەرئەوەی ناوەڕۆکی ئەم کەرەستەسەرەتاییە لەڕێی دەوروبەرێکی دروستەییەوە لێکدەدرێتەوە، ئەو

---

[٥٩٤] بۆ زانیاریی زۆر تر دەربارەی ئەم بابەتە بڕوانە Chomsky (1981).
[٥٩٥] Freie Inversion
[٥٩٦] Richtungsparameter
[٥٩٧] Chomsky (1982)
[٥٩٨] Rizzi (1986:153)
[٥٩٩] Grewendorf (1986:153)

جێناوه سفره لەڕێی نیشانەکانی جێناوێکی لکاوی بکەری زەنگینەوه دەدۆزرێتەوەو دەناسرێتەوه. لەمەوه ڕێسای (٢٨) سەریهەڵداوه.

٢٨- ڕێسای لێکدانەوەی pro

ئەگەر X ئەو سەره بێت، کە ڕێی دەستووریی بە ڕوودان و دەرکەوتنی pro دەدات، ئەوا ئەو جێناوه سفره تەواوو پڕبەپڕی نیشانەتایبەتییەکانی ئەو سەرەی لەگەڵییدا هاونیشانەکراوه (هاونیشانەیە)، بە ڕێزمانیی و ڕێزماندروست نیشانەکانی دیارییکراوه.

ئەم جۆرەی "بەستنەوەی توندی شوێنیی [٦٠٠]" فۆرمێک بەهۆی "بەستنەوه لەلایەن سەرێکەوه [٦٠١]"، ڕێ بەوەدەدات، کە ناوەرۆکی ئەم کەرەستە سەرەتاییە ببێت بە پارامێترێك. فۆرمە بە پارامێتربووەکەی ناوەرۆکی pro ڕێدەدات، بکەرە هێزدەربڕەکان [٦٠٢] هەبن، ئەگەر کردارەکەی لەو جۆرە بەستنەوەیەی لەلایەن سەرێکەوه هەبوو.

## جێناوه هێزدەربڕە بۆشەکان:

کەرەستەسەرەتاییە پڕهێزەکەی [٦٠٣] لە (٢٦) دا بیینرا، بەناچاریی و بە زۆر ڕوودەدات و دەردەکەوێت. بەڵام هەر وەك چۆن لە زمانی ئەڵمانیی و ئینگلیزییدا وەك نوێنەری ڕستەیەکی وەچەپێکهاتە ڕوونادات و دەرناکەوێت، لە زاری سلێمانییشدا هەروەهایە.

ئارگومێنتە فەرهەنگییەکان خاوەنی نیشانە تایبەتییەکانی "کەس و ژمارە [٦٠٤]"ن. ئەم نیشانە تایبەتییانە ئاکاری جێناوەکان دیارییدەکەن. بەرامبەر بەم ئارگومێنتە ئاماژەدەرانە [٦٠٥] ئەو کەرەستەسەرەتاییانە هەن، کە زۆروبۆرو کەمنرخن [٦٠٦] و خاوەنی لەم چەشنە نیشانانە نین. لە ئارگومێنت چووەکان [٦٠٧] ناتوانن لەم نیشانە ڕێزمانییانەیان هەبێت [٦٠٨].

---

[٦٠٠] streng lokal gebunden

[٦٠١] Kopf-Bindung

[٦٠٢] leere expletive Subjekte

[٦٠٣] expletives Element

[٦٠٤] Person and Number

[٦٠٥] referentielle Argumente

[٦٠٦] pleonastische Elemente

[٦٠٧] quasi-Argumente

[٦٠٨] Rizzi (1982) لەدوای Chomsky (1981).

بەگوێرەی ئەم ڕوونکردنەوەیە، ئەو کەرەستەسەرەتاییە بۆشەی (١٢ (ا)) و کردارەکانی پەیبێبردن یەکێکن لەو ئارگومێنت-چووانەی، نیشانەتایبەتییەکانی کەسی سێ هەمی تاکی دیارییکراو (تایبەتیی)[٦٠٩] یان هەڵگرتووە. ئەو کەرەستەسەرەتاییە لە ئاستی ڕووکەشدا دۆخی ڕێزمانیی وەردەگرێت. ئەو کەرەستەسەرەتاییە کەمنرخەی، لەلایەن کات و کەسەوە ڕێی دەستووری بەبوونی دەدرێت و لەگەڵیدا هاونیشانەی کەس و ژمارەی نییە (وەك لە (١٢ (ب)) دا)، دەتوانێت بەبێ ناوەڕۆك[٦١٠] دەربکەوێت و هەبێت. من وای بۆدەچم، کە لە ئاستی قووڵدا[٦١١] دۆخی ڕێزمانیی بەو کەرەستە سەرەتاییە دەدرێت. چونکە ئەو سەرەی ڕێی دەستووریی پێدەدات (کات و کەسەکە) هیچ نیشانەیەکی تایبەتیی نییە.

٢٩- (ا) .Expl ئاشکرایە، ...
(ب) * کێ ئاشکرایە، ...
(پ) * چی ئاشکرایە، ...

بەپێچەوانەوە، ئەو لە ئارگومێنت-چووەی، لەلایەن INFL ەوە (کات و کەسەوە) ڕێی دەستووریی پێدراوەو کەمەکیی[٦١٢] یان تەواو[٦١٣] لەگەڵییدا هاونیشانەی کەس و ژمارەیە، لەسەر ئاستی ڕووکەش حوکمی دۆخی ڕێزمانیی دەکرێت.

ئێستایش با لە ڕستەکانی (١٢ (ا)) و (٢٣ (ا)) وردبیینەوە. بکەر لەم ڕستانەدا لەلایەن وەچەپێکهاتەی کات و کەسەوە حوکمی دروستەیی دۆخی ڕێزمانیی دەکرێت (دۆخی ڕێزمانیی دروستەیی پێدەدرێت). وەچەپێکهاتەکە لەم چەشنانەی کردارەکانی پەیپێبردندا کەرەستەیەکی سەرەتایی ئامارژەدەرە. لە (١٢ (ا)) داو لە (٢٣) دا کەرەستەسەرەتاییەکەی بکەر بە ناوەڕۆکەوە دەردەکەوێت و بەکاردەبرێت. بە بەراوردکردن لەگەڵ (١٢ (ا)) و (٢٣) دا دەتوانم ئەو ئەنجامە هەڵبهێنجم، کە کردارەکە نیشانەتایبەتییە ڕێزمانییەکانی "کەسی سێ هەمی تاك و دیارییکراو" ی لەڕێی گواستنەوەوە[٦١٤] لە بکەرەوە وەرنەگرتووەو لەوەوە پێینەدراوە. چونکە ئەگەر وەها بوایە، دەبوو گشت "کردارەکانی وەهادەرکەوتن[٦١٥]" و کردارەکانی پەیپێبردن هەمان دروستەی (٢٣) یان نیشانبدایە یان هەبوایە. بۆیە دەبێت

---

[٦٠٩] definit

[٦١٠] Inhalt

[٦١١] D-Structure or Deep Structure

[٦١٢] partiell

[٦١٣] gänzlich بەتەواویی , ganz

[٦١٤] transformationell

[٦١٥] Schein-Verben

کلیتیکی بکەر AGR وەك هەڵگری ئەم نیشانەتایبەتییانە بەشەپێکهێنەرێکی زگماکیی[٦١٦] کردار بێت. سەرەنجامێکی ئەم پێزانین و زانیینەم ڕوونکردنەوە ئاشکراکەی ئەو کردارە بکەرنادیارە بێ کەسایەتییانەن[٦١٧]، کە کلیتیکی بکەریان وەك مۆرفێمێکی ئاماژەدەر[٦١٨] هەیە.

٣٠- ( pro) توانرا، قەڵاکە بگیرێت.
j j i i

بەم جۆرە دێینە سەر لێکۆڵینەوەی پێکهاتووەکانی بکەرنادیار، کە لێرەدا بەکورتیی دەیانخەمەڕوو.

## کردارە بکەرنادیارە بێ کەسەکان:

دروستەی قووڵ یان بنەڕەت دارشتەیەکی خراوەڕووە[٦١٩]، کە تێیدا ڕۆڵەبابەتییەکان بە گۆکردنە ڕێزمانییەکان[٦٢٠] بەخشراون. ئەمە ئەوە دەبەخشێت، کە شوێنە دروستەییە قووڵەکە بەگشتیی ڕەگەزێك نوێنەرێتیی، بەواتا ڕەگەزێك لەیەك شوێنی دروستەی قووڵدایە. بەیەکگرتنەوەو بە تەتابوق لەگەڵ ڕێسای پرۆژەسازداناو لە ئەنجامی ئەمەدا ڕستەی بکەرنادیارە بێ بکەرەکان شوێنێکیان بۆ بکەر هەیە. بۆیە کەرەستە سەرەتاییە بۆشەکەی بکەر لە شوێنی ئارگومێنتێکدایەو شوێنەکەیشی شوێنی ڕۆڵێکی بابەتیانەیە (تێمایەکە)[٦٢١]. کە پێکهاتەی بکەرنادیاری بێ کەس شوێنی بکەرێکی دروستەیی هەیەو کە ئەم شوێنە کەرەستەیەکی سەرەتایی expletivum تێدایە، دەتوانرێت وەك نیشانەیەکی تایبەتیی و مۆرکێکی کرداری بکەرنادیاری زمانی کوردیی وەها سەیربکرێت، کە خاوەنی لێکدانەوەیەکی گشتییە.

٣١- expl. دەگوترێت، ...

ڕستەکانی (٣٢) و (٣٣) ئاشکرایدەکەن و ڕوونیدەکەنەوە. کە لە بنەڕەتدا ئەگەری بوونی بکەرێك بە دۆخی ڕێزمانیی بکەرییەوە لە گشت چەشنەکانی پێکهاتەی بکەرنادیاردا هەیە.

---

[٦١٦] inhärenter Bestandtel

[٦١٧] impersonale passiv-Verben

[٦١٨] refrentielles Morphem

[٦١٩] Repräsentation, representation

[٦٢٠] grammatical function

[٦٢١] Themen-Position, ϑ-position

٣٢- ئەگەر (pro) توانرا، ئەو بگیردرێت، ...
i i j j

٣٣- بەوان گوترا، ...

## دەرهاوردنی بکەرو دۆخی ڕێزمانیی بکەریی[٦٢٢]

دۆخی ڕێزمانیی مەبەستی سەرەکیی ئەم بابەت و مەودایەمن. بەسە بۆ ئێمە، گەر ئامارەیەك بۆ ئەوە بکەین، کە بکەرە دەرهێنراوەکە[٦٢٣] لەرێی شوێنەدروستەییە قووڵکەیەوەو لەلایەن وەچەپێکهاتەی کات و کەسەوە دۆخی ڕێزمانیی وەردەگرێت. ئەمە کاتێك ڕوودەدات و جێبەجێدەکرێت، کە مێکانیزمەکانی کۆ-هاونیشانەکردن[٦٢٤] هەبن. ئەمەیش ئەوە دەبەخشێت، کە دۆخی ڕێزمانیی بکەریی بەپێی حوکمکردن لەلایەن INFL یکی کەس و کاتدارەوە بە فرێزێکی ناویی حوکمکراوی دۆخی ڕێزمانیی دەدرێت و کە ئەم فرێزەناوییە لەلایەن یان بە شکاندنەوەی کردارەوە بەستراوەتەوەو توندیش حوکمکراوە.

## دۆخی ڕێزمانیی زنجیرەیی - لە زنجیرەدا[٦٢٥]:

ئەو فرێزەناوییەی بکەر، کە لە شوێنە دروستەییە قووڵە ئەندازیارییەکەی خۆیدا نەماوەو گوێزراوەتەوە، دەتوانێت لە ڕێی شوێنە دروستەییە قووڵەکەیەوەو بە زنجیرەیی دۆخی ڕێزمانیی وەربگرێت. لە زنجیرەی (٣٤) دا

34- (NP, t)
i i

کاتێك دەتوانرێت دۆخی ڕێزمانیی بدرێت، کە شوێنپێکە[٦٢٦]ی فرێزەناوییەکەی بکەرە گوێزراوەکە ڤاریابڵێك[٦٢٧] بێت. بەم پێیە بکەرەکە لەرێی ئەو ڤاریابڵەی بە دۆخی ڕێزمانیی بکەریی حوکمکراوە، لە کات و کەسەوە دۆخی ڕێزمانیی بکەریی وەردەگرێت[٦٢٨].

---

[٦٢٢] Subjekt-Extraktion und der Nominativ

[٦٢٣] das extraponierte Subjekt

[٦٢٤] Ko-Superskription

[٦٢٥] Kasus an Ketten

[٦٢٦] Spur, trace

بەڵام ڕستەی کوردیی ڤاریابڵی تێدانییە. نەبوونی ڕیسا گشتییەکەی "چشتێك لە α بکە" لە زمانی کوردییداو ئەو ڕاستییەی کە "ڕستەی سەرجێناویی" بە کەرەستەیەکی سەرەتایی جێناوییەوە لە شوێنی بکەرو شوێنی بەرکاردا بەرهەمهێنراوە (بڕوانە بەشی حەوت هەم)، بەڵگەن بۆئەو زانیین و زانیارییە چەسپێنراوە دەربارەی نەبوونی ڤاریابڵ لە ڕستەی کوردییدا. لە (٣٤) دا فرێزەناوییەکە پێویستییەکانی تیۆریی ڕۆڵی بابەتانەو تیۆریی دۆخی ڕێزمانیی لەو ڕێیەوە جێبەجێدەکات، کە جێناوەکە لەناو ڕستەکەدا لەگەڵ جێناوێکدا هەمان مارکەو نیشانەی ئامارەدەر[٦٢٩] یان هەڵگرتووە. ئەمەیش لەڕێی خۆیەوە ئەو هەلە دەڕەخسێنێت، کە فرێزەناوییەکە لەڕێی ئەو جێناوەوە (وەك بەردەبازێك) لە کەس و ژمارەدا لەگەڵ بەشی کرداردا هاونیشانەبێت و یەکبگرنەوە. دۆخی ڕێزمانیی بکەریی، بەپێی ئەم تیۆرییەی پێدانی ڕاستەوخۆی دۆخی ڕێزمانیی بکەریی[٦٣٠]، لەلایەن کات و کەسەوە بە فرێزێکی ناویی بکەری هاونیشانە دەدرێت[٦٣١].

## ٣/٢-٢) دۆخی ڕێزمانیی ئەوانەی بکەر نیین

### ٣/٢-٢-١) دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ڕاستەوخۆ

بەرکاری ڕاستەوخۆ لەبەرکاری ناڕاستەوخۆ جیادەکرێتەوە. هەردووکیان لەلایەن X-N ەوە بە دروستەیی حوکمدەکرێن؛ دارشتەکانیان دەتوانرێن بە فۆرمالیستیی بەم جۆرە بخرێنەڕوو.

35-(a) PP [P-NP]
(b) VP [NP-V]

لەیەکدانی ڕێکوپێك و گونجاوی هەر دوو ئەگەری حوکمکردنەکە ڕێسای دۆخی ڕێزمانی بەرکاریی بەدەستەوەدەدەن.

---

[٦٢٧] Variable

[٦٢٨] Chomsky (1981)

[٦٢٩] Referenzindex

[٦٣٠] Theorie der direkten Nominativzuweisung

[٦٣١] Fanselow (1985), Reuland (1985) لەگەڵ ئەو سەرچاوانەی لە Grewendorf (1986) دان. دراون.

٣٦- NP تەنهاو بەتەنها کاتێك دۆخی ڕێزمانی بەرکاریی دەبێت، ئەگەر حوکمکردنەکەی لەلایەن N - X° ەوە بێت.

ئەو نیشانەتایبەتییەی دۆخی ڕێزمانیی، کە دارشتەیەکی نادیاری هەیە، دەتوانرێت بەتەنها وەك هێناندیتن و بەرجەستەبوونی حوکمکردنی دۆخێکی ڕێزمانیی هەبێت. بەم گوێرەیە دۆخی ڕێزمانیی بەرکاریی بە فرێزێکی ناویی دەدرێت، ئەگەر لە شوێنە ڕاست و ڕاستەقینەکەی خۆیدا بێت. بۆیە دەتوانم (٣٧) بۆ زمانی کوردیی دابڕێژم.

٣٧- پۆلی ئەو ڕەگەزانەی، بە نیشانەتایبەتییەکانی دۆخی ڕێزمانیی نیشانەکراون (مارکەیان لێدراوە)، لەلایەن کەرەستەسەرەتاییەکانی پێدەری دۆخی ڕێزمانییەوە حوکمی دۆخی ڕێزمانیی دروستەیی کراون.

لەبەرئەوەی وەچەپێکهاتە سینتاکسییەکان و ڕەگەزە فەرهەنگییەکان شوێنی چەسپاوو نەگۆڕیان لە ڕستەدا هەیەو ناتوانرێن جێگۆڕکێیان پێبکرێت، (٣٨) پێناسەیەکی گونجاوو لەباری حوکمکەری دۆخی ڕێزمانییە.

٣٨- حوکمکەری دۆخی ڕێزمانیی
حوکمکەری دۆخی ڕێزمانیی گۆکردنی کەرەستەیەکی سەرەتایی حوکمکەرە، کە بەپێی ڕێسای حوکمکردنی دۆخی ڕێزمانیی حوکمکردنی دۆخی ڕێزمانیی دەکات.
پێناسەی (٣٨) هەم INFL و هەم هەر ڕەگەزێکی فەرهەنگیی لە پۆلی X° دەگرێتەوە.

## ٢_٢_٢/٣) دۆخی ڕێزمانیی پێشناوەکان (دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری ناڕاستەوخۆ[٦٣٢])

با پێشوەخت و کاتیی وەهای بۆ بچم، کە کلیتیکەکان و پاشگرەکانی وەك بۆ نموونە زانیارییە ئاوەڵکردارییەکان دەردەبڕن، نیشانەی دۆخی ڕێزمانیین. من دەزانم، کە دۆخی ڕێزمانیی بەوابەستەگێتیی لەگەڵ پێشناوەکانەدا دەگۆڕێت و جۆیاوازە. بۆ باش تر تێگەیشتن لەم مەبەستەیش بڕوانە ئەم نموونانەی زمانی ئەڵمانیی.

---

[٦٣٢] Oblique-Kasus

39- Er steht zu dir. ئەو لەگەڵ تۆدا یە (حەزی لە تۆیە).
40- Er wartet auf dich. ئەو چاوەڕێی تۆ دەکات.
41- Er wartet auf dem Schiff. ئەو چاوەڕێی کەشتییەکە دەکات (ئەو لەسەر کەشتییەکە چاوەڕێدەکات).

ئەم جۆرە جیاوازییانەی دۆخی ڕێزمانیی زمانی ئەڵمانیی لە زمانی کوردییدا نیین، چونکە نە مۆرفێمەکانی ناسیاریی و نەناسیاریی و نە پاشگرەکان بەشداریی لە نواندن و دەربڕیینی ئەو دۆخەڕێزمانییەدا دەکەن. ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستییەی، کە ئەو دۆخەڕێزمانیانەی لە زمانەکەماندا بە ناوو فرێزەپێشناوییەکان دەدرێن، نابن بە مۆرفێم یان پاشگر[٦٣٣].

کلیتیکی بکەر دەتوانێت نیشاندەرێك بێت بۆ بەرکاری ڕاستەوخۆ، بەڵام مەرجیش نییە ئەو نیشانەیە بێت، چونکە (ا) وەك پاشگری کەسی کردار فۆرمی فۆنەیتیکیی جۆراوجۆری هەیەو چونکە (ب) کلیتیکی بکەر کەرەستەیەکی سەرەتایی گەڕۆکە[٦٣٤] و دەتوانرێت لە ڕستەدا بە هەر ڕەگەزێکەوە بلکێنرێت یان هەڵبواسرێت[٦٣٥].

لە بنەڕەتداو بەپێی دەستووری ڕێزمانییەکە، ئەو کەرەستە سەرەتاییەی زمان (سەرە ڕێزمانییەکان)، کە خۆی دۆخی ڕێزمانیی دروستەیی دەدات، هیچ پاشگرێکی دۆخەڕێزمانییە پێدراوەکە وەك نیشانەیەك یان مۆرفێمێك هەڵناگرێت. بۆ نموونە، کرداری تێپەڕ حوکمی بەرکارە ڕاستەوخۆکەی دەکات و دۆخی ڕێزمانیی بەرکاریی بە فرێزەناوییەکەی بەرکارەکە دەدات؛ لەو زمانانەدا، کە دۆخی ڕێزمانییان تێدا دەبێت بە مۆرفێم، مۆرفێمەکە (سەرو بۆرو ژێری عارەبیی) لە دوای فرێزەناوییەکەوە دەردەکەوێت، بەڵام لە زمانی ئینگلیزیی و ئەڵمانییدا فرێزەناوییەکە خۆی دەشکێتەوە him ← he.

ئێستایش، ئەگەر کلیتیکی بکەری زمانی کوردیی پاشگری بەرجەستەبووی دۆخی ڕێزمانیی بێت، کە وەك نیشانە بە کەرەستە سەرەتاییە حوکمکەرەکەوە (پێشناوەکەوە) لکابێت، ئەوا ئەم گریمانەیەم ئەو ڕێسایە بریینداردەکات و لە ڕێساکە لادەدات. بەڵام چونکە

---

[٦٣٣] بەراوردیانبکە لەگەڵ سەرو بۆرو ژێری زمانی عارەبییدا!

[٦٣٤] Ein bewegliches Element

[٦٣٥] لەبەر هەندێك هۆو هۆرکی ڕێزمانیی بە جێناوەلکاوەکان ناگوترێت "جێناو" بەڵکو ناوی کلیتیکیان لێنراوە؛ یەکێك لەو هۆیانە ئەوەیە کە جێناوی لکاو نە ڕۆڵی بابەتانەو نە دۆخی ڕێزمانیی وەردەگرێت(چونکە جێناوەلکاوەکان ئارگومێنت نیین و بەشێکی زگماکیی کردارن)؛ وەك ئەم کەرەستەسەرەتاییەی زمانی کوردیی هەڵگریشیان هەیەو هەڵگرەکانیشیان لەزۆر ڕووەوە جیاوازن (وەرگێڕ).

کلیتیکی بکەر پاشگرو مۆرفیمی دۆخی ڕێزمانیی نییە، دەتوانرێت لە ڕستەدا بە هەر ڕەگەزێك و کەرەستەیەکی سەرەتاییەوە بێت، بلکێنرێت.
تاوەکو ئێستا زانییم، کە گۆکردنە سینتاکسییەکانی ڕێزمانی کوردیی کاردانەوەیەکی مۆرفۆلۆژیی نیشاننادەن و کە کردار نیشانەی دۆخی ڕێزمانیی نادیارو شاراوە بە فرێزەناوییەکان دەبەخشێت. ئایا پێشناوەکانیش لەم ڕووەوە هەمان هەڵسوکەوت و ڕەفتاری کردارەکانیان هەیە؟ ئایا پاشگرەکانی /-ەوە/ و /-دا/ پاشگری دۆخەڕێزمانییە بەخشراوو پێدراوەکانن؟

## پاشگرەکانی /-ەوە/ و /-دا/:

لەبەرئەوەی پاشگرەکانی دۆخەڕێزمانییە پێدراوەکان بە وابەستەییان لەگەڵ پێشناوەکاندا، بۆ نموونە لە زمانی ئەڵمانییدا، جۆراوجۆرو جیاوازن، یەککەم تێڕوانیینی ئەم ڕستانە وەهای دەردەخەن، کە /-ەوە/ و /-دا/ پاشگری دۆخی ڕێزمانیی پێدراوبن و بە کۆتایی بەرکارەپێشناوییەکانی[٦٣٦] "سلێمانیی" و "باخەکە" ەوە لکابێتن.

٤٢- (pro) بەپێ لە سلێمانییەوە دەچین بۆ کەرکووك.
٤٣- نەسرین لە باخەکەدا یارییدەکات.

ئایا ئەم پاشگرانەی بە پارتیکڵ ناویانبراوە، پاشکری دۆخی ڕێزمانیی پێدراون؟ فرێزەناوییەکان بە دروستەیی حوکمی دۆخی ڕێزمانیی دەکرێن.

44- (a) V′ [N′′ - V]
(b) V′ [P - N′′ - V]
(c) PP [P - N′′]

پەیوەست بە دارشتەی فۆرمی دەستووریی[٦٣٧] (٤٤ (ب)) و (٤٤ (س)) ەوە پێشناوەکان هەڵسوکەوتی جیاوازیان هەیە. بۆیە چشتێکی ترو جیاوازە، ئەگەر کردارەکە لەڕێی پێشناوێکی ناوەکییەوە دۆخی ڕێزمانیی بە فرێزەناوییە ناوەکییەکە[٦٣٨] بدات یان نا. دروستەی ڕستە بەپێی "پەیوەندییە دوولایەنەییە هاتووەکایەکەی نێوان پێشناوو کردار"

---

[٦٣٦] Präpositionalobjekte

[٦٣٧] formelle Darstellung

[٦٣٨] interne NP

ەوە دەگۆڕدرێت. ئەگەر پێشناوەکە[639] لە فەرهەنگدا بەشێکی زگماکیی کرداربێت، ئەوا دەتوانرێت کلیتیکی بکەر بە بەرکارەپێشناوییەکەوە ببەسترێت. بۆ ئەم مەبەستەیش بڕوانە کردارەکانی <لێدان>، <پێگوتن>، <تێگرتن>، <پیاهەڵدان>، <خۆتێهەڵقورتان> و ... هتد.

٤٥- من پێم t گوتن، ...
i   j i   j

<لێدان> و <پێگوتن> دوو کردارن، کە لە گەشەکردنی مێژوویی زمانەکەدا بوون بە دوو لێکسیمی سەربەخۆی ناو فەرهەنگ[640]. هەر یەکێك لەو دوو کردارە لە پێشناوێکی درۆیینەو لە کردارێك دروستبووە. فرێزەناوییەکەی بەرکار لە (٤٥) دا وەك ئارگومێنتێکی ناوەکیی کردارەکە لەلایەن پێشناوە ڕاستەقینەو ڕەسەنەکەوە حوکمکراوەوەو دۆخی ڕێزمانیی پێدراوە؛ پێشناوە ڕاستەقینەکەی ئەم ڕستەیە /بە/ لە پێشناوە درۆیینەکەی /-پێ/ ی ناو فەرهەنگەوە هاتووە[641]. بەڵام ئەگەر پێشناوەکە لە فەرهەنگدا وەك بەشێکی دروستکەری کردارەکە تۆمارنەکرابوو، ئەوا پێشناوەکە سەربەخۆ لە فەرهەنگدا نووسراوەتەوەو پێشناوێکی ڕاستەقینەیەو لە ڕستەدا دۆخی ڕێزمانیی بە ئارگومێنتەکە دەدات. لەم حاڵەتەدایە، کە بەرکارە پێشناوییەکە ناتوانێت بە هیچ جۆرێك کلیتیکی بکەر وەربگرێت (بڕوانە (٤٢) و (٤٣) و لەگەڵ (٤٦) و (٤٧)).

٤٦- ئارام لە قوتابخانەیە.

٤٧- ئارام چوو بۆ قوتابخانە ~ ئارام بۆ قوتابخانە چوو.

بەم هەنگاوانەم بانگەشەی ڕاستیی ئەو گریمانەیە دەکەم، کە کردارە، ئەوەی دروستەی ڕستە دیاریی و دەستنیشاندەکات نەك پێشناو. کردارە ئەوە دیارییدەکات، کە دەبێت فرێزەناوییەکان و کەرەستەکانی دیکە لە ڕستەدا لەکوێدا بن، نەك پێشناو. کە ئەمە ڕاستەو

---

[639] پێشناوی درۆیینەی یان ناڕاستەقینەی وەك /پێ -/، /-تێ /، /-لێ / و ... هتد، کە ناتوانن دۆخی ڕێزمانیی بدەن (پێدان، تێکردن، لێدان ... هتد.)

[640] Lexikalisierungsprozeß

[641] دروستەی "پێم" ە کوردییەکە، بەرامبەر بە فۆرمە داتیڤییەکانی (فۆرمی دۆخی ڕێزمانیی پێشناویی) him ی ئینگلیزیی و ihm ی ئەڵمانیی دەوەستێتەوە (وەرگێڕ).

وەهایە، ئەی دەبێت پێشناوەکان چ گۆکردنێکیان هەبێت؟ لەتەك پێدان و بەخشینی دۆخی ڕێزمانییدا چونایەتیی (نەوعییەتیی) بابەتانەیش[٦٤٢] دەردەبڕێت.

که بەتەنها ئەو پێشناوانەی لە فەرهەنگدا تۆمارکراون، ئەم پاشگرانە دەهێننەئاراوە، ڕاستیی و ئەنجامپێکی هەردوو گریمانەکە دەسەلمێنرێت. ئەو پێشناوانەی سەربەخۆ لە فەرهەنگدا تۆمارکراون، ناسنامەو مۆرکی جیاوازییان لەو پێشناوانە هەیە، کە وەك بەشەدروستکەرێکی کردارەکان تۆمارکراون.

ئەو دوو پاشگرە کام چۆنایەتییە بابەتانانە دەردەبڕن؟

ڕوونکردنەوەکان دەریدەخەن، کە ئەو پاشگرانەی (/-ەوە/ و /-دا/) بە ئارگومێنتەکانەوە بەستراون، زانیاریی تافیی و شوێنیی و ئاڕاستەکردنی[٦٤٣] پێشناوەکان دەردەبڕن. پاشگرەکان دەبێت بەگوێرەی چۆنایەتییە بابەتییەکان جیاواز بن؛ بە هەمان شێوەیش سەرچاوەکانیان، کە پێشناوەکانن، جیاوازن و هەمان چشت نین. ئەم دوو پاشگرە ڕەگەزی سینتاکسین؛ ئەو ڕۆڵانەی پێشناوەکانی /لە١/ و /لە٢/ بە فرێزەناوییەکانی دەدەن، ڕۆڵی ئاوەڵکرداریین و یەکێکیان ئاڕاستە کردنە شوێنیی و کاتییەکەی کردەو ڕووداوەکە ئاشکرادەکات و ئەوی دییان شوێنی تەواوی کردەکە دەخاتەڕوو؛ لەکوێ و لەکەیەوە، لە ڕێی پاشگری /-ەوە/ وە دەردەبڕدرێت؛ لەکوێ و لەکەیدا، لەلایەن مۆڕفێمی /-دا/ وە دەستنیشاندەکرێت. لەگەڵ ئەمەیشدا تەواویی[٦٤٤] و ناتەواویی[٦٤٥] بەردەوامیی[٦٤٦] و نابەردەوامیی[٦٤٧] کردەو ڕووداوو جموجۆڵ و چالاکییەکان لەیەك جیادەکرێنەوە (بڕوانە (٤٨)). دیارییکردنە ئاوەڵکردارییەکان دەبن بەو دوو پاشگرەو لە شێوەی مۆڕفێمدا بەرجەستە دەبن. لە کاتێکدا دۆخی ڕێزمانیی پێدراو بە فرێزەناوییەکان لەفۆڕمی مۆڕفێمدا بەرجەستە نابێت، ڕۆڵە ئاوەڵکردارییەکان بە فۆنەیتیکیی دەبیسترێن. ئەم دوو دیاردە مۆڕفۆلۆژییە لە تایبەتمەندییەکانی ڕێزمانی کوردیین و لە سینتاکسدان و بەستراون بە ڕێساو مەرجەکانی ڕستەسازییەوە.

کردەو جموجۆڵ و چالاکیی درێژخایەن/بەردەوام و دووپاتبووەوە:

٤٨- بە ئاسمانەوە ئەستێرەی زۆر هەڵواسراون.

---

[٦٤٢] Thematische Qualität

[٦٤٣] lokale oder temporale Angaben

[٦٤٤] perfektive (Handlung)

[٦٤٥] imperfektive (Handlung)

[٦٤٦] durative (Handlung)

[٦٤٧] nicht durative (Handlung)

کردارەکانی وەك <هات> : <هاتنەوە>، <ڕۆشتن> : <ڕۆشتنەوە>، و ئەو کردارانەی بوونەتە لێکسێمی سەربەخۆی ناو فەرهەنگ <کردنەوە>، <خواردنەوە>، <خولاندانەوە> و <خوللانەوە> لەگەڵ کردارەکەی سەرەوەدا بەراورد بکە!

تەواویی کردارو دیارییکردنە شوێنیی و تافییە ڕووتەکە:
٤٩- لە ئاسماندا، ئەستێرەی زۆر هەن.

ناتەواویی کردەو جموجوڵ و چالاکییەکە لەگەڵ واژەگۆکەری (پارتیکلی) /-ەوە/ دایەو تەواوییەکەیشی لەگەڵ واژەگۆکەری /-دا/ دایە. ئەگەر لە نێوان واژەگۆکەرەکەو چۆنایەتیە بابەتییەکەی کەرەستە حوکمکەرەکەدا "هەڵنەکردنی سێمانتیکیی[٦٤٨]" هەبێت، ئەوا بەرهەمەکە ڕستەی ڕێزمان نادروست دەبێت؛ ئەم ڕستانە ئەو ڕێسایەیان بریندارکردووەو لەو ڕێسایە لایانداوە. بەراوردکردنێکی ڕستەی (٥٠) لەگەڵ (٥١) دا دەریدەخات، کە ڕستەکەی دواییان دەتوانرێت لەڕووی واتاوە لێکبدرێتەوە، بەڵام ڕستەکەی یەککەمیان بە هیچ جۆرێك لێکدانەوەیەکی واتایی نییە.

٥٠- *ئێوە ژیانتان لەدەستی خۆتانەوەیە
٥١- ئێوە ژیانتان لەدەستی خۆتاندایە.

لەبەر ئەوهۆیانەیە، من ئەم پاشگرانەی، لەلایەن پێشناوە ئاوەڵکردارییەکانەوە[٦٤٩] دیارییکراون، وەك مۆرفێمەکانی دۆخی ڕێزمانییان نابیینم و وەك ئەوانەیش ڕەچاویاننناکەم.

## ئەنجاملێکدانەوە:

پێشناوە ڕاستەقینەکان کەرەستەی حوکمکەرن. وەك کەرەستەی حوکمکەر دۆخی ڕێزمانیی بە فرێزەناوییەکان دەبەخشن. نیشانەی دۆخی ڕێزمانیی داڕشتەیەکی نادیاری هەیەو بە فۆنەیتیکیی نابیسترێت. ئەو پێشناوانەی سەربەخۆ لە فەرهەنگدا تۆمارکراون، زانیارییە تافیی و شوێنییەکانیش لە ڕستەدا دیارییدەکەن. ئەو پاشگرانەی ئەم زانیارییانە دەردەبڕن، مۆرفێمی دۆخی ڕێزمانیی نیین. کە دۆخی ڕێزمانیی لە زمانی کوردییدا بەپێی دروستەیە، لەو ڕێیەوە دەسەلمێنرێت، کە (ا) دۆخی ڕێزمانیی دابەشبوونێکی زۆر تەواوی هەیەو کە (ب) فرێزە پێشناوییەکان دەتوانن لە ڕستەی بکەرنادیاردا وەك بکەری ڕستە دەربکەون. کلیتیکی بکەر دەتوانێت بەتەنها بەو پێشناوانەوە بلکێنرێن، کە

---

[٦٤٨] semantische Unverträglichkeit

[٦٤٩] adverbiale Präposition

بەشەدروستکەرێکی کردارن. بەهەمان شێوەیش بە پێشگری کرداری ڕانەبوردووەوە /دە-/ دەبەسترێتەوە. ئەم تێبینییە داکۆکی لە داواکردنی ئەو گریمانەیە دەکات، کە دەڵێت: مۆرفێمی کرداری ڕانەبوردوو بەشەدروستکەرێکی زگماکیی کرداری زمانی کوردییە.

## ٣-٢/٣) مارکەی (نیشانەی) خاوەندارێتیی[٦٥٠] و پێدانی دۆخی ڕێزمانیی خستنەپاڵ[٦٥١]

کەرەستەی سەرەتایی حوکمکەر بۆ بەخشینی دۆخی ڕێزمانیی خستنەپاڵ: ڕەگەزێکی حوکمکەر دەتوانرێت بەم شێوەیە پێناسەبکرێت:

٥٢- X ڕەگەزی حوکمکەرە بۆ Y، ئەگەر X گەورەترین گرێی S یان NP بێت و ئەو کەرەستەسەرەتاییەی تێدابێت، کە حوکمی Y دەکات.

بەگوێرەی (٥٣) زمانی کوردیی بەتەنها کرداو پێشناوو کات و کەسی وەك کەرەستەی سەرەتایی حوکمکەر هەیە. ناوو ئاوەڵناو لەمە بەدەرن. زمانەکەمان بۆ ئەو جۆرە وەچەپێکهاتانەی، لەم فۆرمانەی خوارەوەیان هەیە، خاوەنی یاسایەکی بۆزیادکردنە[٦٥٢]، کە لەرێیەوە مارکە (نیشانە) یەکی[٦٥٣] /ی/ یان /ە/ دەخاتەسەر وەچەپێکهاتەکە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| 54- (a) | NP | [N A′] | چاو-ی-شین |
| (b) | AP | [A A′] | شین-ی-کاڵ |
| (c) | N | [N N′] | بەرد-ە-پێ |
| (d) | A | [A N′] | گرد-ە-پیاو |

## ٤-٢/٣) ڕەگەزە حوکمکەرەکان[٦٥٤] و بەربەستەکانی حوکمکردن[٦٥٥]

---

٦٥٠ Possesivmarker

٦٥١ Genetivzuweisung

٦٥٢ Zufügungsregel

٦٥٣ Marker

٦٥٤ regierende Kategorien

چەشــــنی کـــــردار[656] چەشـــــنی واژەگۆکـــەرە تەواوکەرانـــەکان[657] دیاریدەکـــات. پارتیکڵەتەواوکەرانەکـەی /کـە/ تەنـها لەگـەڵ کـرداره هەواڵییـەکاندا[658] دەبینرێتـەوە. بـە پێچەوانـەوە، واژەگۆکـەری /ئەگـەر/ لەگـە ڵ فۆرمەمەرجییەکاندایـە[659]. کەواتـە هـەر دوو پارتیکڵەکـە دابەشـبوونێکی تەواوکەرانـەیان هەیـە. لەسـەر بناغـەی ئـەم دابەشـبوونە تەواوکرانەیەیە، کە من ناوی واژەگۆکەری هەواڵیی[660] و پارتیکڵی مەرجییان[661] لێدەنێم.

٥٤- (pro) لەماڵ دەرناچم، ئەگەر باران بباریێت.

٥٥- ئەگەر باران بباریێت، p ro لەماڵ دەرناچم.

رستە تەواوکەرەکەی (٥٤،٥٥) رستەیەکی کات و کەسدارە[662]. بکەری هەر رستەیەك لەلایەن سەرە حوکمکەرەکەیـەوە حوکمـی دۆخـی ڕێزمـانیی دەکرێـت. "کـرداره سـەرەکییەکە"[663] ناتوانێت، لەبەر گرێی S´ ی نێوان خۆی و رستەتەواوکەرەکەی، حوکمی دۆخی ڕێزمانیی هیچ کەرەستەیەکی سەرەتایی ناو رستەتەواوکەرەکە بکات. ئەمە ئەوە دەبەخشێت، کـە ئـەو کەرەستانەی لەناو S´ دان، لەلایەن حوکمکەرێکی سەربەخۆی سەر بە خۆیان حوکمی دۆخی ڕێزمانیی دەکرێن و نیشانەی دۆخی ڕێزمانییان پێدەدرێت.

## بەربەستەکانی حوکمکردن:

ئـەو ڕەگەزانـەی، وەك بەربەسـت یـان سـنوور بـۆ پێدانـی دۆخـی ڕێزمـانیی گۆدەکـەن، گـەورەترین پرۆژەکـانن[664]؛ سـنوورەکە بـەو جۆرەیـە، کـە ڕەگـەزێکی حوکمکـەر نـاتوانێت بەسەر ڕەگەزێکی حوکمکەری دییکەدا بازبدات یان تێپەڕێت و ڕەگـەزێکی تر حوکمبکـات.

---

[655] Regierungsbarriere

[656] Der Modus des Verbs

[657] Komplementpartikel

[658] Indikativverbs

[659] Konjunktivforms

[660] Indikative-Partikel

[661] Konjunktive-Partikel

[662] finiter Satz

[663] Matrixverb

[664] maximale Projektionen

مگەزەکانی بۆ حوکمکردن بەربەست و سنوورێکن بە بەربەستەکانی حوکمکردنی زمان سراون. هەر زمانێکیش ژمارەیەکی لەو بەربەست و سنوورانە هەیە[٦٦٥]. ڕستەی (٥٤،٥٥) مریدەخەن، کە ڕەگەزی S′ لە زمانی کوردییدا بەربەستێکی حوکمکردنە.

بکەرە سفرە جێناوییەکەی[٦٦٦] (٥٦) بەتەنها لەلایەن سەرەحوکمکەرەکەی ستەتەواوکەرەکەوە حوکمی دۆخی ڕێزمانیی دەکرێت. چونکە گرێی S′ ەکە سەر بە ەورەترین پرۆژەکانەو لەبەرئەوەی گرێکە بۆ پێدانی دۆخی ڕێزمانیی وەك ڕەگەزێکی مریەست بۆ ڕەگەزە حوکمکەرەکان گۆدەکات، کردارە سەرەکییەکە (ئەوەی ڕستەی سەرەکیی) اتوانێت بەسەر ئەم بەربەست و سنوورەدا تێبپەڕێت و حوکمی دۆخی ڕێزمانیی بکەری ستە تەواوکەرەکە بکات؛ ئەگەر بهاتبایە و ئەو بکەرە لەلایەن کردارەسەرەکییەکەوە حوکمی ۆخی ڕێزمانیی بکرایە، ئەوا دوو جار حوکمی دەکرا. بکەرەکە وەك بکەری ڕستە تەواوکەرە کەس و کاتدارەکە دۆخی ڕێزمانیی بکەریی دەبوو وە وەك بەرکاری کردارەسەرەکییەکە دۆخی ڕێزمانیی بەرکاریی دەبوو. لەبەرئەوەی فرێزەناوییەکان لە زمانە سروشتییەکاندا دەتوانن تەنها یەك نیشانەی مۆرفۆلۆژیی دۆخی ڕێزمانییان هەبێت و لەبەرئەوەی (٥٦) ڕستەیەکی ەڕووی ڕێزمانەوە فۆڕمدروستە، (٥٦) ئەم ڕێسایەی بریندار نەکردووە.

٥٦- شیرین دەیەوێت، من نامەکە بنووسم.

## ٥-٢/٣) سینتاکسی ڕستە لەناویەکشکاوەکاندا

تەواوکەرەفراوانکراوەکان[٦٦٧] لە شێوەی گەورەترین پرۆژەی جۆراوجۆردا دەردەکەون، بۆ نموونە لە شێوەی NP, PP, S یان S′ یکدا. دەرکەوتنی هەر چەشنێك لە چەشنەکانی تەواوکەرەکان وابەستەی کردارەکەو نیشانەکانی وەچەدیارییکردنین[٦٦٨]. کردار هەن، یەك ئارگومێنتی ناوەکییان بەسە. کردار لە چەشنی دییکە هەن، چەند تەواوکەرێکیان دەوێت. بەڵام کرداریش هەن، تەنها داوای ڕستەی تەواوکەر دەکەن. لەتەکییدا، بەستراوە بە کردارەوە، ئەگەر تەواوکەرەکە ڕستەیەکی کات و کەسداربێت یان ڕستەیەکی بێ کات و کەس (ڕستەی چاوگیی) بێت. چاوەڕێدەکرێت ئەو کردارانەیش هەبن، کە ڕێ بە هەر دوو چەشنی تەواوکەرەکان بەیەکەوە دەدەن.

---

[٦٦٥] Chomsky (1986)

[٦٦٦] pronominales Null-Subjekt

[٦٦٧] Ergänzungen

[٦٦٨] Subkategorisierungseigenschaften

## ٢/٢-٥-١) ڕستەی تەواوکەرانە[٦٦٩]

### تەواوکەرەناوییەکان[٦٧٠] وەك تەواوکەری ڕستە:

ڕستە تەواوکەرە بیٚ کات و کەسەکان ئەو تەواوکەرە ناوییانەن، کە لەسەر شوێنی فرێزی ناویی بکەر "فرێزێکی جێناویی بۆشیان[٦٧١] هەیە. ئەم فرێزە پێشناوییە، کە لەلایەن چۆمسکییەوە ناوی PRO ی لێنراوە، نە دەتوانرێت حوکمبکرێت و نە دۆخی ڕێزمانیی هەڵدەگرێت.

57_John tried S′ PRO to be a good teacher.

ڕستە تەواوکەرانەکە (ڕستەی دوای S′ ەکە) تەواوکەرێکی ناوییە. بەهۆی ئەو گرێی S′ ەوە، کە کەوتووەتە نێوان کردارەسەرەکیی و بکەرە PRO بۆشەکەوە، کردارەسەرەکییەکە ناتوانێت حوکمی دۆخی ڕێزمانیی بکەرە PRO کە بکات. بۆیە ناتوانرێت لەناو ئەم پێکهاتووەدا هیچ دۆخێکی ڕێزمانیی بە PRO بدرێت.

### ڕستەی کات و کەسدار وەك تەواوکەری کردار:

پێناسەی "تەواوکەری کرداریی"[٦٧٢] لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی دیکە جیاوازە. زمانی ئینگلیزیی بۆنموونە هەم تەواوکەری ناویی[٦٧٣] و هەم تەواوکەری کرداریی هەیە. تەواوکەری کردارەکان خاوەنی دروستەی تەواون، بۆیە شوێنەکانی وەچەپێکهاتەکانیان بە کەرەستەی سەرەتایی فەرهەنگیی بەرجەستەبوو پڕکراونەتەوە. زمانی کوردیی و زمانی فارسیی بەتەنها تەواوکەری کرداریان هەیەو شوێنەکانی ئارگومێنتەکانیان دەتوانن بۆش بن (بەرجەستە نەبن).

٥٨- چەند نموومەیەك لە زمانی ئینگلیزییدا:

(a) We know S′ [that [we are good teachers.

(b) * We know S′ [that [ are good teacher

---

٦٦٩ Komplementsätze بڕوانە Chomsky (1980:170) "Rules and Representation"

٦٧٠ Nominalergänzungen •

٦٧١ eine leere Pronominale-NP

٦٧٢ Verbalergänzung

٦٧٣ Nominalergänzung

٥٩- چەند نموونەیەك لە زمانی فارسییدا:
(ا) من میدونم ´S [کە [ pro مورد‌نیی هستم.
(ب) من فیکرمیکنم ´S [کە [ pro فردا میان.

٦٠- چەند نموونەیەك لە زمانی کوردییدا:
(ا) ئەوان دەزانن ´V [کە [ئێمە هاتووین.
(ب) ئازاد دەیەوێت ´V [ pro بڕوات.

زمانی کوردیی و زمانی فارسیی لەو ڕێیەوە لە زمانی ئینگلیزیی جیاوازن، کە تەنها خاوەنی ڕستەی تەواوکەری کات و کەسدارن و بەتەنها pro یان وەك بکەر هەیە.
بەهۆی ڕێسای پرۆژەسازدانەوە کردار هەڵبژاردنی دروستەیەکی ڕستەی گونجاو لەسەر گشت دروستەکانی ڕستە دیارییدەکات. کردارێکی کات و کەسداری تێپەڕ X، کە داوای دەقی سینتاکسیی Y دەکات، هەمان دروستەی سینتاکسیی لە ڕستەی سەرەکیی و ڕستەی تەواوکەردا هەیە؛ ئیتر گرنگ نییە لە هەر شوێنێکدا بن (بڕوانە (٥٤) و (٥٥)). پەیوەندییە سینتاکسیی و سیمانتیکییەکانی ڕەگەزەکان و پەیوەندییە گۆکردنییەکانیان لەگەڵ یەکترییدا وەك خۆیان و بەبێ گۆڕان دەمێننەوە. کەواتە ڕستەی سەرەکیی و ڕستەی تەواوکەر خاوەنی دروستەی سینتاکسیی سەربەخۆن و هەر دروستەیەکیان لەژێر ڕکێفی سەرێکی حوکمکەری "کردارو کات و کەس" ی خۆیاندان. ڕستەکانی ڕستەی ئاڵۆز[٦٧٤] وەك دروستەی سینتاکسیی سەربەخۆ شییدەکرێنەوە. بەڵام پێویستە تێبینیی و ڕەچاوی ئەوە بکرێت، کە بەرجەستەنەکردنی کەرەستەی فەرهەنگیی بکەری ڕستەی وەچەپێکهاتە[٦٧٥] بە ڕەگەزێك (بکەر یان بەرکار) ی ڕستەسەرەکییەکەوە بەستراوە. دانانی کەرەستەی فەرهەنگیی بکەری ڕستەی تەواوکەر بەستراوە بە بکەر یان بە بەرکاری ڕستەسەرەکییەکەوە. ڕستەی سەرەکیی و ڕستەی تەواوکەر دەتوانرێن بناخرێنە ناو یەکەوەو دروستەیەکی لەناویەکشکاوەدا دروستبکەن. بەدیینەهێنان و بەرجەستەنەکردنی بکەری ڕستەی تەواوکەرو دروستە لەناویەکشکاوەکەی ڕستەکە هیچ کارتێکردنێکیان لەسەر یەکتریی نییە.

---

[٦٧٤] komplexe Sätze

[٦٧٥] Konstituentensatz oder Komplemntsatz

٦١- (pro) دەمەوێت pro t ب ت گرم.
i i i j i j i

بەم ڕوونکردنەوانەم دەرمبڕیی، کە پرۆسەکانی هاونیشانەکردن، لەسەر بناغەی سەربەخۆیی دروستە سینتاکسییەکەی ڕستە لە (٦١) دا لەسەر ئاستە جیاوازەکانی زمان جێبەجێدەکرێن.

## ٣/٢-٥-٢) کەرەستەسەرەتاییەکانی PRO و pro

چۆن دەتوانین ئەو کەرەستە سەرەتاییە بۆشەی PRO بناسینەوەو دیارییبکەین؟ فرێزە جێناویە بۆشەکەی PRO ڕستەچاوگییەکان کەرەستەیەکی سەرەتایی نادیارە، کە لە شوێنەکەیدا دانانی کەرەستەی فەرهەنگیی جێبەجێناکرێت[٦٧٦] و کە نیشانەتایبەتییەکانی "کەس و ژمارەو توخم" ی بۆماوەی تێدایە[٦٧٧]. بەڵام ئەم PRO ناتوانرێت حوکم بکرێت و هیچ دۆخێکی ڕێزمانیی نییە[٦٧٨].

62- * John consider S [PRO to be a Kurd.

63- Layla tried S′ [Comp e S [PRO to put her daughter to sleep.

PRO بکەری تەواوکەرە ناوییەکەی[٦٧٩] (٦٣) یەو لەبەر ڕەگەزی ′S ی نێواینیان ناتوانرێت لەلایەن کردارەسەرەکییەکەوە حوکمی دۆخی ڕێزمانیی بکرێت. بەڵام لەبەرئەوەی گرێی S لە زمانی ئینگلیزییدا بەربەستێکی حوکمکردن نییە، هەمان بکەرە سفرەکە PRO دەتوانرێت لەلایەن کردارە سەرەکییەکەوە حوکمی دۆخی ڕێزمانیی بکرێت. بۆیە (٦٣) ڕستەیەکی ڕێزماندروست و ڕاستە بەڵام (٦٢) ڕێزماندروست نییە.

---

٦٧٦ erfolgt keine lexikalische Einsetzung

٦٧٧ enthält ererbte Merkmale

٦٧٨ Chomsky (1981:122)

٦٧٩ Nominalergänzung

**بەکارهێنانی PRO:**

ئەو PRO یەی بکەری تەواوکەرە چاوگییەکانە[٦٨٠]، دەتوانێت لەگەڵ هەر فرێزێکی ناویی، بەواتا لەگەڵ بکەرو بەرکاری کردارەسەرەکییەکەدا هەمان مارکەی ئامارژەدەریی هاوبەش[٦٨١] هەڵگرن. کردار دیارییدەکات، ئەگەر PRO بۆی هەبێت لەگەڵ بکەر یان بەرکاری کردارە سەرەکییەکەدا هەمان مارکە یان نیشانەی هاوبەش هەڵبگرێت یان نا. بەڵام لێکدانەوەی تەواوی بەستراوە بە پراگماتیك و فۆنۆلۆژییەوەو لەرێی قورسایی خستنەسەرو ئاوازەوەیە. کەواتە سێمانتیك کۆنترۆڵی PRO دەکات. لەبەر ئەمەیە، کە بەکارهێنانەکەی لەلایەن رەگەزە کۆنترۆڵکەرەکەیەوە[٦٨٢] دیارییدەکرێت. بۆیە زمانەوان لە PR O یەکی کۆنترۆڵنەکراو دەدوێت، کە ئازادو بێ هیچ رەگەزێکی کۆنترۆڵکەر بەکاردەبرێت (بڕوانە (٦٤)) و لە PR O یەکی کۆنترۆڵکراویش لەلایەن بکەر یان بەرکاری کردارەسەرەکییەکەوە دەدوێت (٦٥).

64- (a) It is not clear where PRO to go.
(b)It is not clear what PRO to do.

65- (a) John promises Layla PRO to marry her.
i j i j

(b) Layla persuades John PRO to marry her.
i j j i

به هەمان جۆرو شێوە pro یش لە زمانی کوردیی و فارسییدا هەلسوکەوتدەکات.

٦٦- (ا) نەوزاد پەیمانی بە نەسرین دا، کە pro t بیهێنێت.
i j i j i i

(ب) نەسرین زۆری لە نەوزاد کرد، کە p ro t بیهێنێت.
j i i j j i i

---

[٦٨٠] Infinitivkomplemente

[٦٨١] Referenzindex

[٦٨٢] Kontroll-Kategorie

PRO و دۆخی ڕێزمانیی:

کەواتە هەر وەك جێناوەکان کۆنترۆڵکراوو کۆنترۆڵنەکراویان هەیە، کەرەستەسەرەتاییە سفرەکانیش کۆنترۆڵکراوو کۆنترۆڵنەکراویان هەیە، بۆیە وەك جێناو سەیردەکرێن و مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت. جێناوەکان بابەتی مەرجی (ب) ی تیۆریی بەستنەوەن. بەڵام چونکە PR O حوکم ناکرێت و هیچ دۆخێکی ڕێزمانیی هەڵناگرێت، پێویست ناکات PR O ئەم مەرجە جێبەجێبکات. ئەم ڕوونکردنەوەیە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە PR O و فرێزە ناوییە فەرهەنگییەکان دابەشبوونێکی تەواوکەرانەیان هەیە. دابەشبوونە تەواوکەرانەکەیان لە ئاکامی ئەم مەرجەو مەرجی پاڵێوەری دۆخی ڕێزمانییدا[٦٨٣] هاتووەتە کایەوە.

٦٦- مەرجی PRO:

هەر ڕستەیەك، کە PRO یەکی حوکمکراوی تێدا بێت، دروستەیەکی فۆڕمدروستی نییە.

لە چێوەی هەر دوو مەرجەکەداو پەیوەست بە تیۆریی تێتاوە دەتوانم ئەمانەی لای خوارەوە دەربارەی کەرەستەسەرەتاییەکانی PRO و pro بچەسپێنم.

(ا) هەر دوو کەرەستەسەرەتاییەکە هەمان چەشنی بەکارهێنانیان هەیە.

(ب) بەڵام هەردووکیان دابەشبوونێکی تەواوکەرانەیان هەیە؛ چونکە pr o بە پێچەوانەی PRO وە، دەبێت دۆخی ڕێزمانیی هەڵبگرێت.

PRO و pro و تیۆریی بەستنەوە:

جێناوەکان لە ڕستەدا پەیوەستن بە ناوەوە. پەیوەستەگیی ناوو جێناو بەپێی چەند یاسایەك گۆدەکات؛ لە ڕێی یاساکانەوەیە، کە هەندێك لەتەکیەك دانان و گونجاندنی پەیوەستەگییەکان بەناوەوە ڕێپانێپێنادرێت و پەسەند نیین. ئەو شوێنەی، کە جێناوەکان وەریدەگرن، لەڕێی ئەم یاسایانەوە دیاریکراون. یاساکان دەتوانرێن بەم شێوانە لەم یاسایانەی لێکدانەوەدا دابڕێژرێن.

٦٨- (ا) ئەگەر NP1 لەپێش NP2 ەوە هات و وەچەئاڕاستەی کردو NP2 جێناوێك بوو، ئەوا هەردووکیان دەتوانن هاونیشانە بن (هەمان مارکەیان هەبێت).

(ب) ئەگەر NP1 لەپێش NP2 وەوە بێت وەچەئاڕاستەی کردو NP2 جێناوێك نەبوو، ئەوا NP1 و NP2 پەیوەندییەکی هاونیشانەیی جیاوازیان (ڕێکەوتنی جیاوازیان) هەیە.[٦٨٤]

---

[٦٨٣] Kasusfilter

[٦٨٤] disjunkte Referenzbeziehung

ئـەو ڕێسـایانەی، (٦٨) لێـوەی هـەڵقوڵاون یـان بناغـەین، لـە تیۆریـی بەسـتنەوەی چۆمسکییەوە[٦٨٥] هاتوون.

٦٩- تیۆریی بەستنەوە:
(ا) ئەنافەرەکان[٦٨٦] لەناو گچکەترین ڕەگەزە حوکمکەرەکەیاندا[٦٨٧] بەستراونەتەوە.
(ب) جێناوەکان لەناو گچکەترین ڕەگەزەکانیاندا ئازادن.
(پ) دەربڕینە ئاماژەدەرەکان[٦٨٨] لە هەموو شوێنەکاندا ئازادن.

ناو ڕێگە بە وەچەبەستێنەوەر[٦٨٩] نادات و پێویستی پێنییە. بۆیە لە ناو گشت ڕستەکەدا هیچ N P یەکی هاونیشانەی نییە. جێناوەکان ئازادن، بەڵام بۆیان هەیە لەگەڵ NP کانی دیکەدا هەمان نیشانەی ئاماژەدەریان هەبێت.
چیی دەتوانێت ببێت بە وەچەبەستێنەوەری[٦٩٠] ئەنافەرەکان؟
فرێزەناوییە فەرهەنگییەکان و ناوەفەرهەنگییەکان[٦٩١] یان جێناوەفەرهەنگییەکان[٦٩٢] دەتوانن ببن بە وەچەبەستێنەوەریان.

٧٠- (pro) لەوەدەچێت [ئازاد خۆی نەخۆشبێت ].
i i j j j

٧١- (pro) لەوەدەچێت [ئەو خۆی نەخۆشبێت ].
i i j j j

٧٢- (pro) لەوەدەچێت [ pro خۆی نەخۆشبێت ].
i i j j j

---

[٦٨٥] Chomsky (LGB:188)

[٦٨٦] Anaphora

[٦٨٧] innerhalb ihrer minimalen regieenden Kategorie

[٦٨٨] referentielle Ausdrücke

[٦٨٩] Antezedens

[٦٩٠] Antezedens

[٦٩١] lexikalische Nomen

[٦٩٢] lexikalische Pronomen

ئەگەر ئێمە ڕستەی تەواوکەر لە (٧٠) دا تاقیبکەینەوە، لەهەمان کاتدا ڕستەی تەواوکەری (٧١) و (٧٢) تاقیدەکەینەوە. لەتەکییدا ئەو زانین و پێزانراوە دەستکەوتووە دەچەسپێنین، کە جیناوی خۆیی[١٩٣] <خۆی> لەلایەن کرداری ڕستەتەواوکەرەکەوە حوکمدەکرێت و کە ئەو گچکەترین گرێیەی S یان NP یەی، کە کردارەکەی تێدایە، ڕستەتەواوکەرەکەی ناو کەوانەشکاوەکەیە. ڕستەتەواوکەرەکەی ناو کەوانەشکاوەکە گچکەترین ڕەگەزی حوکمکەرە، کە جێناوە خۆییەکەی تێیدایە. یەککەمین NP ی لای چەپی جێناوەخۆییەکە لە (٧٠) دا فرێزەناوییەکەی "نەوزاد" ەو لە (٧١) دا جێناوە کەسییەکەی[١٩٤] "ئەو" ەو لە (٧٢) دا جێناوە سفرەکەی[١٩٥] pro یە. لەمەوە ئەو ئەنجامە گرنگەمان چنگدەکەوێت، کە بکەرە سفرەکەی pro دەتوانێت وەچەبەستێنەوەرێك بۆ ئەنافەربێت.

ئایا PRO دەتوانێت وەچەبەستێنەوەرێك بێت بۆ ئەنافەر؟

دابەشبوونی تەواوکەرانەی فرێزەناوییە فەرهەنگییەکان و PRO دووبارە خۆی لە نیشانەتایبەتییە گۆکەرییەکانیاندا دەبینێتەوە. چونکە کەرەستەسەرەتاییەکەی PRO ناتوانێت وەك وەچەبەستێنەوەرێك گۆبکات و ئەو ئەرکەببینێت.

73- He himself seems S PRO to be ill.
i i

74- * He himself S PRO himself to be ill.
i i

تاوەکو ئێستا زەق ترین و ئاشکرا ترین جیاوازییەکانی نێوان هەر دوو کەرەستە سەرەتاییەکەی PRO و pro م دەرخست و چەسپاند. ئەوەیشم دۆزییەوە، کە pro کەی کوردیی کەرەستە سەرەتاییەکی دوو لاییەو دوو نیشانەی تایبەتیی هەیە. لەلایەکەوە ئاکاری جێناویی نیشاندەدات و ڕێدەدات وەك کەرەستەیەکی سەرەتایی ئازاد بناسرێتەوەو دەستنیشانبکرێت و لەلایەکی دیکەیشەوە نیشنەتایبەتییە ئەنافۆرییەکانی دەخاتەڕوو و ڕێدەدات ناوەرۆکەکەی پەیوەستبێت بە فرێزەناوییە فەرهەنگییەکانی ترەوەو پێیانەوە ببەسترێتەوە. ئەمەیش پەیوەندییەکی گرژ لە نێوان تیۆریی کەرەستە سەرەتاییە سفرەکانداو تیۆریی کۆنترۆڵدا دەنوێنێت. چۆن ئەم پەیوەندییە شییدەکرێتەوە، لە بەشەکانی داهاتوودا ڕووندەکرێتەوە.

---

[١٩٣] Reflexivepronomen

[١٩٤] Personalpronomen

[١٩٥] Null-Pronomen

# بەشی چوارهەم

## گواستنەوەی وشەی پرسیار لە ڕستەسازییدا[٦٩٦]

لەپێشدا دەمەوێت بەو جیاوازییە چەمکییە دەستپێبکەم، کە کەرەستەسەرەتاییەکەی AG R (کەس) لە زاراوەی کلیتیکی بکەر جیادەکاتەوە. چونکە زاراوەی کلیتیکی بکەر بەخشکەیی ئەوە دەردەبڕێت، کە زاراوەکە لەتەك فرێزە ناوییەکەی بکەری شوێنی نێوان پەیوەندییە ئەندازیارییەکانی ڕستەدا[٦٩٧] دووهەم کەرەستەی سەرەتایی بکەریی[٦٩٨] ڕستەکەبێت. کەسەکەی کرداری کوردیی ڕێنادات وەك ئەم بکەرە دووهەمەی ڕستە بناسرێتەوەو دەستنییشانبکرێت. ئەم جێناوەلکاوە ئەو کەرەستەسەرەتاییەیە، کە بەکردارەکەوە لکاوەو لەلایەکەوە ڕێکەوتنی بکەرو کرداری ڕستە لەکەس و ژمارەدا[٦٩٩] دەرەخسێنێت و لەلایەکی دیکەیشەوە ڕێ بە دانانەفەرهەنگییەکەی بکەری ڕستە[٧٠٠] دەگرێت. بۆیە کەرەستە سەرەتاییەکەی AGR لە ئێستاو بە دواوە ناودەنێم ئێنکلیتیك[٧٠١] و ئەو فرێزەناوییەی بەرکار، کە ئاخنراوەتە ناو کردارەکەوە ناودەنێم کلیتیك[٧٠٢]. کلیتیك لەڕێی شوێنپێکەیەوە ڕۆڵەبابەتیانەکەی وەردەگرێت. دۆخەڕێزمانییەکەیش لەلایەن ئەمەوە هەڵدەمژرێت[٧٠٣]. بەڵام دۆخی ڕێزمانیی بکەریی لەلایەن ئێنکلیتێکەوە هەڵنامژرێت. چونکە ئێنکلیتیك لە دەق و شوێنی سینتاکسیی جۆراوجۆرداو لەتەك سەری ڕێزمانیی فەرهەنگیی[٧٠٤] جیاوازدا ڕوودەدات و دەردەکەوێت؛ هیچ ڕۆڵێکی بابەتانەیشی نییە.

دەرکەوتنەکانی ئێنکلیتیك و کلیتیکەکان نیشانیدەدەن، کە هەردووکیان وەك مۆرفێم کەرەستەی سەرەتایی ئازادن. ئێنکلیتیکەکان بەهۆی نیشانەتایبەتییەکانیانەوە وەك

---

[٦٩٦] Wh-Bewegung in der Syntax

[٦٩٧] das konfigurationelle NP-Subjekt

[٦٩٨] zweie Subjekt-Element

[٦٩٩] Subjekt-Prädikat-Kongruenz

[٧٠٠] lexikalische Einsetzung de Satzsubjektes

[٧٠١] Enklitik

[٧٠٢] Klitik

[٧٠٣] Borer (1984) و پێش ئەمیش Jaeggli (1982) و Aoun (1979) و Kayne (1969, 1970) .

[٧٠٤] lexical heads

بەشەدروستکەری کردار دارشتەی فۆنۆلۆژیی خراوەرووی سەربەخۆیان[٧٠٥] هەیە. کلیتیکەکان رۆلی بابەتیانەو دۆخی ریزمانییان هەیە. بەلام نیشانەتایبەتییە ریزمانییەکانی خۆیشیان هەیە. بەم جۆرە خاوەنی دارشتەی فۆنۆلژیی خراوەرووی سەربەخۆی خۆیانن. سەرەو ریزبوونی کەرەستەسەرەتاییە کلیتیکییەکان لە رستەدا بابەتی مەرج و سنوورەدانراوە فۆنۆلۆژییەکانن. ئەم ئەنجامە دەستکەوتووە وەك سەرەنجامیکی راستەوخۆی دروستە مۆرفۆسینتاکسییەکانی ریزمانی کوردیی سەیردەکریت. بۆ روونکردنەوەی ئەم راستییە، دەستدەکەم بە شییکردنەوەی ئەگەری گواستنەوەکان لە رستەسازییدا.

## ١/٤) رستەی پرسیار

لەو تیزەوە دەستپیدەکەم و دەردەچم، کە دەلیت: دروستەی سینتاکسیی رستەی پرسیارو دروستەی قوولی رستەی کوردیی یەکدەگرنەوەو وەکیەکن. بۆیە پیویستە ئەم چەشنەی رستە تەواو ورد تر پەسنبکەم.

رستەی پرسیارو چەشنە جۆراوجۆرەکانی:
پرسیاری بریاردان[٧٠٦]:
رستەکانی پرسیاری بریاردان دەتوانرین بەیاریدەی پرسیارتەواوکەری[٧٠٧] <ئایا> یان بە کۆمەکی پیشگری پرسیار /ب-/ یان پیشگری ویست و ئارەزوو /ب -/ و لەرپی قورساییخستنەسەرێکی بەهیزەوە[٧٠٨]، کە ئاوازی رستەکە دەگۆریت، دروستبکرین.

١- پەروین هاتووە!
٢- ئایا پەروین هاتووە؟
٣- پەروین بیت؟
٤- پەروین هاتووە؟ (بەراوردی بکە لەگەل (١) دا !).

پرسیاری تیپەر (تەواوکەرویست)[٧٠٩]:

---

[٧٠٥] unabhängige phonoogische Repräsentation

[٧٠٦] Entscheidungsfragen

[٧٠٧] Fragekomplementizer

[٧٠٨] starke Betonung

[٧٠٩] Ergänzungsfragen

پرسیاری تێپەڕ ئەو پرسیارانەن، کە وشەیکی پرسیاری وەهایان تێدایە، کە وەڵامەکانیان هەندێك زانیارییان بەهەندێك تەواوکردنەوە دەوێت.

٥- پەخشان لە کوێ بوو؟

چەشنەکانی ڕستەی پرسیارەکانی تا ئێستامان تاڕادەیەك لەو پرسیارەدەنگدەرەوانەی[٧١٠] زمانی کوردیی نین، کە قسەی ئەوی دییکە تیایاندا دووبارەنابێتەوە.

پرسیارە تێپەڕەدەنگدەرەوەکان:
ئەم چەشنەی پرسیار لەو ڕێیەوە دروستدەکرێت، کە دروستەی ڕستەی دەربڕ[٧١١] بە وشەیەکی پرسیار ، کە لە شوێنی وەچەپێکهاتە پرسیارلێکراوەکەیە[٧١٢]، دووبارە دادەنرێتەوە.

٦- (ا) ئەو مێژوی کورد دەخوێنێت.
(ب) ئەو چیی دەخوێنێت؟

پرسیاری بڕیاردەری دەنگدەرەوەیی[٧١٣]:
ئەم چەشنەی ڕستەی پرسیار لەڕێی دووپاتکردنەوەی پرسیارێکی بڕیاردانەوە بەرهەمدێنرێت، کە لە دروستکردنەکەیدا وشەی پرسیارەکە لە شوێنی وەچەپێکهاتە پرسیارلێکراوەکەدا بەکاردەهێنرێت.

٧- (ا) ئایا پەروین هاتووە؟
(ب) ئایا کێ هاتوە؟

ئەگەری ئەوەیش هەیە، لە ڕستەیەکی پرسیاری بڕیاردانی دەنگدەرەوەییەوە ڕستەیەکی پرسیاری بڕیاردانی دەنگدەرەوەیی دییکە دروستبکرێت. بەڵام گرنگە تێبینیی ئەوە بکرێت، کە بە گشتیی هیچ چەشنێکی ڕستەی پرسیار لە ڕێزمانی کوردییدا جۆرێك لە جۆرەکانی "وەچەپێکاتەگواستنەوە"[٧١٤] لە سینتاکسەکەیدا نییشاننادات.

---

[٧١٠] Echo-Fragen

[٧١١] Aussagesätze

[٧١٢] in der Position der nachgefragten Konstituente

[٧١٣] Echo-Entscheidungsfragen

[٧١٤] Konstituentenbewegung

## ٢/٤) دروستەی سینتاکسیی ڕستەی پرسیار

ڕستەی پرسیار لەلایەن چۆمسکییەوە[715] وەك ڕستەیەك پێناسەیکراوە، کە ڤاریابڵێکی تێدایەو لەلایەن یان بە ئۆپەراتۆرێکەوە بەستراوەتەوە. چۆمسکی لە پەسنکردنەکەی ڕستەی پرسیاردا پشتی بەزاراوەکانی "ئۆپەراتۆر"[716] (وشەی پرسیار) و "ڤاریابڵ"[717] (کەس) ی ژێربیژیی بەستووەو بەکاریهێناون. پاشانیش فۆرمە ژێربیژییە (فۆرمی لۆژیکیی) دەستکەوتووەکەی بۆ ئەم جۆرە لێکدانەوانە خستووەتەکار.

٨- (ا) تۆ کێ دەناسییت؟
(ب) کام X ە، تۆ X دەناسییت

ڕستەی (٨ (ب)) فۆرمەلۆژیکییەکەی (٨ (ا)) ە. بە زاراوەی "کام X" وشەی پرسیاری <کێ> لێکدەدرێتەوە. ڤاریابڵەکان دەتوانن، وەك لە (٨) دا، ڤاریابڵی بووە بن؛ دەیشتوانن ڤاریابڵی کەس نەبن[718].

٩- (ا) تۆ کام ئارامە دەناسییت؟
(ب) کام X ە، X = ئارام، تۆ X دەناسییت

لەو زمانانەدا، کە وشەی پرسیار لە سینتاکسەکەیاندا بۆ شوێنی پارتیکڵی تەواوکەرانە[719] دەگوێزنەوە، بە ئاسانیی لەڕێی شوێنەبۆشەکەی (شوێنپێی) وشەی پرسیارە گوێزراوەکەوە دیارەو دەزانرێت، ئەگەر پرسیار لە بکەر یان بەرکار کرابێت. ئەم جۆرە دروستانە ڕێدەدەن لەڕێی شوێنەچۆڵکراوەکەوە (تیۆریی شوێنپێوە[720]) فۆرمە لۆژیکییەکەی[721] بزانرێت و

---

[715] Chomsky (1972:284)

[716] Operator (Fragewort)

[717] Variable (Individuen)

[718] nicht Individuen-Variable

[719] Komp-Position

[720] Spurentheorie

[721] logische Form

بخرێتەپاڵ ڕستەکە. لەم ڕستەیەدا ناسنامەی ئاماژەپێدەرەکە[٧٢٢] بە ڕەوانیی نیشانیدەدات، لە بنەڕەتدا چیی لە شوێنە چۆڵکراوەکەدا هەبووە.

10- (a) Welche Blume hast du gepflückt? تۆ کام گوڵەت لێکردەوە؟

(c)




وردە کاریی و زانیاریی دیکە دەربارەی ئەم شوێنپێیانەو سەبارەت یاساکانی، کە ئاماژەیان پێدەدەن و ئاماژەیان بۆ دەکەن، بۆ ئێمە گرنگ نیین؛ چونکە بۆ زانین و چەسپاندنی هاونیشانەکراوەکان، پێویستە شوێنی بنەڕەتیی ڕەگەزەکە لە دروستەی قووڵ یان بنەڕەتدا وەربگیردرێت.

بۆ ئەوەی ئاکاری ڕستەی پرسیاری ڕێزمانی کوردیی لەڕووی ڕستەسازییەوەو بە ڕستەسازیی دیارییبکرێت، دروستەی ڕستەی پرسیاری تەواوکەرانەو دروستەی ڕستەی پرسیاری دەنگدەرەوەیی وەردەگرم و بۆ مەبەستەکانم مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەم. ئەم پرسیارانە وەك دەنگدانەوەی ڕستەکانی دەربڕیینی پێشەوەیان بەکاردێن و دەردەکەون. وشەی پرسیارەکە، کە قورساییەکی بەهێزی لەسەرە، لە ناو ڕستەی پرسیارەکەداو لەشوێنی ئەو فرێزەناوییەدا دەمێنێتەوە، کە پرسیاری لێدەکرێت. ڕستەی (٥) بۆ ئەم مەبەستە باشترین نموونەیە.

بەڵام چۆن دەتوانرێت بە بەڵگە بچەسپێنرێت، کە وشەی پرسیار خۆی لە شوێنی بنەڕەتیی فرێزەناوییە لێپرسراوەکدا دەبیینێتەوەو لەبنەڕەتدا هەر لەوێدا بووە؟

(ا) ئامادەبوون و بوونی وشەی پرسیارەکە دیارییکردنی فرێزەناوییەکەی بکەر یان فرێزەناوییەکەی بەرکار لە ڕستەدا ئاساندەکات. ئەو شوێنە دروستەییەی، کە وشەی پرسیارەکەی تێدایە، ناوەند یان چەقە سەرەکییەکەیە. بۆیە ئەو ڕستەیەی، شوێنپێیەك یان کلیتیکێکی تێدایە، ناتوانێت وشەیەکی پرسیاری تێدابێت.

---

[٧٢٢] Referenzidentität

١١- (ا) * ئازاد، t کیٚ گرتی 0 ی؟
i j j j

(ب) ئازاد، کیٚ گرتیی؟

(ب) وشەی پرسیارەکە ناگوێزرێتەوە. ئەم ڕاستییە ڕوونیدەکاتەوە، بۆچیی دەشێت دوو وشەی پرسیار لە هەمان کاتدا لە شوێنی واژەگۆکەرە تەواوکەرانەدا هەبن.

١٢- ئارام پرسیی [V΄ [کیٚ لە کێی دا]] ؟

چونکــە زمــانی کوردیــی جوڵانــدن و گواســتنەوەی فرێــزی نــاویی لــە ڕستەســازییدا نییشانناندات، بوونی واژەگۆکەرێکی تەواوکەرانەو وشەیەکی پرسیار بەیەکەوە لـە سـەرەتای ڕستەی سەرەکییدا یان لەسەرەتای ڕستەی وەچەپێکهاتەدا[٧٢٣] ڕێیانپێدەدرێت.

١٣- ئەگەر کیٚ بێت [V΄΄ [ئێوە نایەن]] ؟
j j i i

لە کورتەو پوختـەی ئـەم بەشـەی لێکۆڵییـنەوەکـەمدا بانگەشـەی ئـەو گریمانەیـە دەکـەم، کـە ڕسـتەی پرسـیاری ڕێزمـانی کوردیــی یاسـای گواسـتنەوەی " α بجووڵێنـە" نییشـانناندات و نییـەتی. بەم شێوەیە، ڕستەی پرسیار دروستەی قووڵـی ڕسـتەی زمانی کوردیـی دەگرێتـەوەو وەکیەکن.

---

[٧٢٣] Konstituentensatz

# بەشی پێنج هەم

## دروستەی سینتاکسیی ئارگومێنتە دەرنەبڕدراوەکان[٧٢٤]

### ٥/١) بکەری دەرنەبڕدراوو نادیار

پێویستە دەستنیشانکردنی ئاکاری سینتاکسیی ئارگومێنتە نادیارو بەرجەستەنەبووەکان و دیاریکردنی لێکدانەوەی سیمانتیکییان، لەناو پێکهاتەی ڕستەسازییدا، لە مەودای پەیوەندیی نێوان واتای فەرهەنگیی و فۆڕمی سینتاکسییدا جێبەجێبکرێن. گرنگ ئەوەیە، ئەوە دیاریبکرێت، تا کام ڕادەیە هەردوکیان یەکترییدەگرنەوەو یەکتری دادەپۆشن. بەلاّم ئەرکی سەرەکیی ئەوەیە دەربخرێت، ئەو ڕۆڵەبابەتیانانەی بە فۆنەیتیکیی بەرجەستە ناکرێن، وەك ئارگومێنتی نادیار لە داڕشتەی سینتاکسیی خراوەڕووی ڕستەکاندا بە دروستەیی هەن یان نین. ئەو بەڵگەهێنانەوانەی نیشانیدەدەن، کە بکەرە نادیارەکە بە دروستەیی هەیە، دەتوانرێن بەم شێوەیەی لای خوارەوە بخرێنەڕوو.

### ٥/١-١) دوو ڕێسا

(ا) با لە پێشدا لە ڕێسای پرۆژەسازدانی چۆمسکی وردببینەوە، کە دەڵێت: دروستە ڕەگەزییەکان[٧٢٥] لەسەر هەر ئاستێکی سینتاکسیی کاردانەوەی (وێنەئاوێنەی) دروستە بابەتیەکانە[٧٢٦]. ئەو ئاکاردیاریکردنە یاسابەندەی من دیارییدەکەم، لە ڕاستییدا لەڕێی ڕێساکەو سەرەنجامەکانیەوە دیارییدەکرێت. چونکە ئەگەر من بە سەلیقە بڕیاربدەم، ئەوا ئەو بکەرە نادیارە بە دروستەیی هەیە، بەواتا حازروبزرە. بەپێی تیۆریی بابەتانە دەتوانرێت بەو کەرەستەسەرەتاییە هەمان ئەو ڕۆڵە بابەتانەیە بدرێت، کە فرێزێکی ناویی فەرهەنگیی هەر لەو شوێنە سینتاکسییەدا پێیدەبەخشرێت و وەریدەگرێت. بۆیە بانگەشەی ئەو گریمانەیە

---

[٧٢٤] die syntaktische Struktur der unausgesprochnen Argumente

[٧٢٥] kategoriale Strukturen

[٧٢٦] thematische Strukturen

دەکرێت، کە شوێنەبۆشەکەی بکەری ڕستەی (١) بە کەرەستەیەکی جێناویی سفر pr o گیراوە.

١- (ا) pro هاتوون.
(ب) p ro دێن.

(ب) ڕێسای دووهەم دەڵێت، کە هەر بەشی کردارێك داوای بکەرێکێك دەکات، کە دەبێت بە دروستەیی دارشتەیەکی خراوەڕووی هەبێت[٧٢٧]. بەپێی ئەم ڕێسایە شوێنەبۆشەکانی بکەری ڕستەکانی (٢) و (٣) و لەتەکییدا هی پێکهاتووە بیَ کەسەکانی وەك (٤) بە کەرەستەیەکی سەرەتایی سفر گیراون و پڕکراونەتەوە.

٢- سەرما وا لەخەڵکیی دەکات، p ro لەماڵ دەرنەچن.
j j i j i

٣- pro نازانێت، p ro بۆ هەمیشە گرانییە؟
j j i i

٤- .Expl نازانرێت بۆ هەمیشە گرانییە؟
j j i i

## ٢-١/٥) دوو تیۆریی

### (ا) تیۆریی بەستنەوە

یەککەمین هۆمێنانەوە ئاماژە بۆ تیۆریی بەستنەوەدەکات و پەیوەستە بە ئاکاری گۆکەریی کەرەستەی سفرەوە. چونکە جێناوە سفرەکە دەتوانێت وەك وەچەبەستێنەوەرێکی ئەنافەر گۆبکات.

---

[٧٢٧] Chomsky (1981), Williams (1983)

٥- pro خۆیاندەگۆڕن، pro ئەمجا دێن.[٧٢٨]
i i i i

کەرەستەسەرەتاییەکەی <خۆیان> دەکەوێتە ناو مەودای ڕێسای (١) ی تیۆریی بەستنەوەوە. ئەگەر هیچ وەچەبەستێنەوەرێك لە ڕستەکەدا بۆ ئەنافەرەکە نەبێت، ئەوا هیچ دروستەیەکی فۆرمدروستی نابێت. لەبەرئەوەی ڕستەی (٥) ڕستەیەکی ڕێزماندروست و ڕاستەو لەبەرئەوەی ئەو کەرەستەیەی لە شوێنەبۆشەکەی بکەردایە تەنها وەچەبەستێنەوەرێکی جێناوەخۆییەکەیە، ئەمە پاساودانەوەیەکی بەهێزە بۆ بانگەشەی ئەو گریمانەیە، کە دەڵێت: کەرەستەیەکی زمانیی وەك وەچەبەستێنەوەر لەو شوێنەبۆشەی بکەرەکەدا هەیە.
لقی (ا) ی ڕێسای بەستنەوەو پێناسەی پەیوەندییەکانی تیۆریی بەستنەوە بەخشکەیی دەربیدەبڕن، کە لەم ڕستەیەداو لەو ڕستانەدا، کە لەم دەچن، بەستێنەوەرێك[٧٢٩] داڕشتەی دروستەیی[٧٣٠] هەیەو کە تەنها کاندیتێك بۆی، پاڵێوەری سفرە[٧٣١].

## (ب) تیۆریی کۆنترۆڵ (کردن)

بۆمان ئاشکرابوو، کە لە نێوان PRO و کەرەستە کۆنترۆڵکەرەکەیدا[٧٣٢] پەیوەندییەکی کۆنترۆڵکردنی لێکدەرەوە[٧٣٣] هەیە. PRO ڕێدەدات بەتەنها لەڕێی کەرەستەکۆنترۆڵکەرەکەیەوە لێکبدرێتەوە. کەرەستەکۆنترۆڵکەرە لێکدەرەوەکەی (٦)، بۆ نموونە، نیشانەتایبەتییەکانی "کەسی دووهەم، نێر" ی هەڵگرتووە. ئەو بکەرەی PRO، کە لەلایەن ئەمەوە سیمانتیکیی کۆنترۆڵکراوە، دەتوانرێت بەتەنها لەڕێی ئەم نیشانەتایبەتییانەوە لێکبدرێتەوە.

---

[٧٢٨] بەراوردی بکە لەگەڵ: ئەو خۆی بەپێی خۆی هات. لەم ڕستەیەدا <خۆی> ڕاستەوخۆ بە <ئەو>ەوە بەستراوە. لەبەرئەوەی لە زمانی کوردییدا جێناوی خۆیی سەربەخۆی <خۆ> و جێناوی خۆیی بە جێناوی لکاوەوە لە فەرهەنگدا هەن (بڕوانە: <خۆم>، <خۆمان>، <خۆت>، <خۆتان>، <خۆی>، <خۆیان>)، جۆری بەستنەوەکە لە زمانەکەماندا زۆرتر هاونیشانەکردن دەگرێتەوە وەك لەبەستنەوە؛ بەڵام بەستنەوەکەیش ئاشکراو ڕوونە (وەرگێڕ).

[٧٢٩] Verbinder

[٧٣٠] Strukturell repräsentiert

[٧٣١] Null-Filter

[٧٣٢] Kontrll-Element

[٧٣٣] eine interpretative Kontroll-Beziehung

6- He tried PRO to go.
i i i

با ئێستایش لەم ڕستەیە وردببینەوە!

١ ٢ ٣

٧- pro دەیانەوێت pro بچن بۆ شار، pro جلوبەرگ بکڕن.

i i i i i i

پەیوەندییەکەی نێوان pro1 و pro2 و pro3 دەتوانرێت لەڕێی پەیوەندیی وەچەئاڕاستەکردنەوەوە بە ڕەوانیی پەسنبکرێت. بەپێی سنوورەدانراوەکان و مەرجەکانی پەیوەندییەکانی هاونیشانەیی[٧٢٤] هەر دوو pro2 و pro3 لەمەودای ڕکێفی pro1 ان. کەواتە دەکەونە مەودای ڕکێفی بکەری ڕستەی سەرەکییەوە. جێناوە سفرەکەی بکەر سەربە ڕەگەزی فەرهەنگیی [ + جێناو ]ە. بۆیە pro2 و pro3 دەتوانن لەگەڵ pro1 دا هاونیشانەبن. لێکدانەوەی pro2 و pro3 وابەستەی pro1 ن. لەگەڵ ئەمەیشدا ئەو کارتێکردنەی هەیە، کە هەر دوو کەرەستە بکەرییەکی دواییان دانانی کەرەستەی فەرهەنگییان[٧٢٥] نەبێت. ئەمە ئەوە دەردەبڕێت و دەبەخشێت، کە ئامادەبوونی بکەری هەر ڕستەیەکی سەرەکیی[٧٢٦] یان شارستە[٧٢٧] کاتێك دانانی فەرهەنگیی بکەری ڕستەی وەچەپێکاتە یان پاڕستە دیارییدەکات، کە ئەم بکەرانە لە گەڵ بکەری ڕستەکانی پێشوو لە نیشانەتایبەتییەکانی "کەس و ژمارەو دیاروناديار[٧٢٨]" دا ڕێکەوتووبن و یەکبگرنەوە. مەرجەبنەماییەکانی یەکگرتنەوەو ڕێکەوتن گەلێك گریمانەی نەزەریی بەهێزدروستدەکەن و بەدەستیانەوەدەدەن. پشتگیریی ئەو بۆچوونە دەکەن، کە بکەرە سفرە جێناوییەکە دەتوانرێت تەنها لەناو دەقەسینتاکسییەکەیداو لە پەیوەندییدا لەگەڵ سەرە حوکمکەرەکەیدا لێکبدرێتەوە. بەڵام دەیشڵێت، کە ڕستەی وەچەپێکهاتە یان شارستە دروستەیەکی سینتاکسیی سەربەخۆی هەیەو کە نیشانەتایبەتییەکانی لەلایەن کردارەکەی خۆیەوە دیاریی و دەستنیشاندەکرێن.

بەم جۆرە پەیوەندییەکی کۆنترۆڵکردنی لێکدانەوەیی لە نێوان کەرەستەکۆنترۆڵکەری he و کەرەستەکۆنترۆڵکراوەکەی PRO دا هەیەو لە (٦) دا پەیوەندییەکی کۆنترۆڵکردنی لێکدانەوەو لێکدەرەوەییە. بە پێچەوانەوە لەنێوان کەرەستەیەکی کۆنترۆڵکەر (فرێزێکی

---

[٧٢٤] Koreferenzrelationen

[٧٢٥] lexikalische Einsetzung

[٧٢٦] Matrixsatz

[٧٢٧] übergeordneter Satz بەرامبەر بە "پاڕستە" untergeordneter Satz

[٧٢٨] Definitheit/Indefinitheit

ناویی فەرهەنگیی بەرجەستەو هێنراوەدییتن یان pro یەك و pro یەكدا پەیوەندییەكی كۆنترۆڵكردنی مۆرفۆفۆنۆلۆژیی[٧٣٩] هەیە.

كە نیشانەتایبەتییە ناوەرۆكییەكانی PRO بەتەنها لەڕێی كەرەستەكۆنترۆڵكەرەكەیەوە دەناسرێنەوە، ڕاستییەكە، چەندوچوون و مشتومڕی لەسەرناكرێت. كە من بەرجەستەنەبوونی فەرهەنگیی و بەرجەستەنەكردنی بكەری ڕستەی وەچەپێكهاتە یان پاڕستە لەڕێی یەگرتنەوەو ڕێكەوتنیەوە لەگەڵ بكەری ڕستەی سەرەكی یان شاڕستەدا، بۆ داڕشتە فۆنۆلۆژییەكەی ڕستە دەگێڕدرمەوەو بەوەوەی دەبەستمەوە، بۆئەوەیە لەڕێی نیشانەتایبەتییەكانی یاساكانی پێكهاتەی ڕستەسازیی و پێكهاتەی فۆنۆلۆژییەوە بیانسەلمێنم.

ئەگەر بەم جۆرە لە تیۆریی كۆنترۆڵ[٧٤٠] بگەین، ئەوا پەیوەندییە كۆنترۆڵییەكان یان سینتاكسیی-سێمانتیكییەكان[٧٤١] (پەیوەندیی PRO) یان سینتاكسیی-فۆنۆلۆژییەكان[٧٤٢] شییدەكرێنەوە. لەیەكەم باردا یەكەم پەیوەندیی سێمانتیكییەو لە دووهەم حاڵەتدا فۆنۆلۆژییە. چونكە فۆرمە فۆنەتیكییەكەی فرێزێكی ناویی فەرهەنگیی وابەستەی كەرەستەكۆنترۆڵكەرەكەیەتی. لە (٧) دا بكەرە سفرەكەی pro ئەم گۆكردنەی هەیە. ئەم نیشانە گۆكەرییەی pro ئاماژە بۆ ئەوە دەكات، كە خۆی بە دروستەیی هەیە.

## ٥/١-٣) ڕستەی تەكیی و ڕێكەوتنی وەكیەكیی[٧٤٣]

لە زاری سلێمانییدا لێكدانەوەی گشتیی و لێكدانەوەی تایبەتیی بكەری pro، بەگوێرەی دەقە سینتاكسییەكەی و بەپێی كەرەستەكۆنترۆڵكەرەكەی، بە ڕێزمانیی و لەڕووی ڕێزمانەوە یان نیشانەی تایبەتیی [ + دیار ] یان نیشانەی تایبەتیی [ - دیار ] ی هەیە. <پیاو> و <كەس> و <خەڵك> بۆ نموونە نیشانەتایبەتییەكانی "كەسی سێ هەم، تاك، نادیار" یان هەیەو <پیاوان> و <پیاوەكان> فۆرمەكۆكانیانن؛ بەڵام <خەڵك> و <كەس> فۆرمەكۆكانی تایبەت بە خۆیان <خەڵكیی> و <كەسانێك> یان هەیە.

٨- خەڵك ئەمڕۆ، كە لە دنیا بێخەبەرە، ...

٩- خەڵكیی، كە pro ئەمڕۆ لە دنیا بێخەبەرن، ...

---

[٧٣٩] morphophonologische Beziehung

[٧٤٠] Kontrolltheorie

[٧٤١] syntaktisch-semantisch

[٧٤٢] syntaktisch-phonologisch

[٧٤٣] Der Nebensatz und die Kongruenzungleichheit

١٠- کەس نازانێت، ...
١١- کەسانێك دەزانن، کە p ro لێرەبوون، ...

لە (٨) دا بکەرە pro کە بە پەیوەندیی لەگەڵ سەرە حوکمکەرەکەی نیشانە تایبەتییەکانی "کەسی سیٚ هەمی تاك" ی هەیە. لەڕێی پەیوەندییەکەی لەگەڵ سەری سەرجێناویی[٧٤٤] نیشانەی تابەتیی نادیاریش [ - دیار ] وەردەگرێت. بەهەمان ڕیٚ و شێوە ڕستەکانی (١١) و (١٢) یش شییدەکرێنەوە.

١٢- کەس نازانێت، کە p ro دەیانەوێت، pro لەناوەمانبەرن.

ئەگەر ئێمە لە فرێزەناوییە فەرهەنگییەکەی "کەس"، وەك بکەری ڕستەئاڵۆزەکە[٧٤٥] (گشت ڕستەکە بەیەکەوە)، وردبیینەوە، ئەوا ئەم پرسیارە قوتدەبێتەوە: فۆڕمەکۆکانی هەردوو فرێزەکارییەکانی "دەیانەوێت" و "لەناوەمانبەرن" لە کوێوە هاتوون؟
نیشانەتایبەتییە ڕێزمانییەکانی "کەسی سیٚ هەمی کۆ" ی ئەم بەشانەی کردار لەگەڵ نیشانەتایبەتییەکانی بکەری یان بەشی کرداری ڕستەسەرەکییەکە یەکناگرنەوەو وەکیەك نین. بۆیە ئەم بەشانەی کردار وا دەردەکەون، وەك تەواوکەری کرداریی[٧٤٦] کردارە سەرەکییەکەی "نازانێت"، خاوەنی کەرەستەی بکەریی خۆیان بن؛ ئەو بکەرانەی، کە لەگەڵییدا هاونیشانەی گونجاوو ڕاستیان هەیە.

## ٤-١/٥) ڕستەی پرسیار

لە هەندێك دروستەی دیارییکراوی ڕستەدا، کە تیایاندا بکەری ڕستەی تەکیی لەگەڵ ڕەگەزێکی ڕستەی سەرەکییدا هاونیشانەیە، دەبێت شوێنی بکەری پاڕستەکەی بە کەرەستەیەکی جێناویی سفر گیرابێت. وشەکانی پرسیار دەتوانن، لەم حاڵەتەداو لە حاڵەتەکانی دیکەدا لەجێی بکەرە سفرەکە ڕووبدەن یان بەکاربهێنرێن. ئەگەر ئێمە بیر لەوە بکەینەوە، کە زاری سلێمانیی نە گواستنەوەی فرێزی ناویی و نە گواستنەوەی وشەی پرسیاری هەیە، ئەوا بۆمان ئاشکرادەبێت و دەزانین، کە وشەی پرسیار لە شوێنەکەی خۆیدا ماوەتەوەو هەیە.

---

[٧٤٤] Relativkopf
[٧٤٥] Komplexsatz
[٧٤٦] Verbalergänzung

ئەو ئەنجامەی لەمەوە دەستمانکەوتووە، دەڵێت: شوێنی هەر دوو کەرەستەسەرەتاییەکەی "وشەی پرسیار" و "pro " (بکەر) بە دروستەیی هەن.

١٢- (ا) pro دەمەوێت، pro بڕوات!
j j i i

(ب) pro دەتەوێت، کێ بڕوات؟
j j I I

## ٥-١/٥) تیۆریی کەرەستەسەرەتاییە سفرەکان[٧٤٧]

من تاوەکو ئێستا داتای جۆراوجۆرو فرەچەشنەم هێناوەتەوەو لە پێکهاتە جیاوازەکانی حوکمکردن و تیۆریی کۆنترۆڵدا تاقیمکردوونەتەوە. لە ڕوانگەی تیۆرییەکی دیکەوە، کە تیۆریی کەرەستەی سەرەتایی سفرە، کەرەستەسەرەتاییە نادیارەکە نە شوێنپێیەو نە ڤاریابڵە، چونکە بۆ ئەو کەرەستەنادیارە نە وەچەبەستێنەوەرێك و نە ئۆپەراتۆرێك هەیە. بەپێی ئەم تیۆرییە ئەو کەرەستە بۆش و چۆڵەی جێی بکەر، ناوی pro ی لێنراوە؛ چونکە لەو شوێنە حوکمکراوەدایە، کە توند لەلایەن ڕێکەوتنی بکەرو کردارەوە بەستراوەتەوە. بۆ جێگەی بکەر، کە داڕشتەی دروستەیی هەیە، ئەم تیۆرییە پاڵێوەری سفری[٧٤٨] هەیەو بە گوێرەی دەوروبەرەکەی نیشانەیەکی تایبەتیی "کەس و ژمارەو دیاریی/نادیاریی" دەداتێ و دەیخاتەپاڵی. تایپۆلۆژیی[٧٤٩] کەرەستەسەرەتاییەکەی سفر لەم ڕووەوە بەهەمەکیی و تەواویی لەگەڵ ڕێسای پرۆژەسازداندا یەکدەگرێتەوە. بەڵام ڕستەی وەك (١٤) و (١٨) دەرییدەخەن، کە لەنێوان تیۆریی کەرەستەی سفرو تیۆریی کۆنترۆڵدا پەیوەندییەکی هاوبەش هەیە. وادەردەکەوێت، کە لەم دروستەیەداو لەو دروستانەی دیکەدا، کە لەم دەچن، بکەری pro ی ڕستەشکاوەکە لەلایەن ڕەگەزی شاڕستەکەوە کۆنترۆڵی لێکدانەوەیی و لێکدەرەوەیی بکرێت.

١٤- پەروین دەیەوێت pro بڕوات
i i i i

[٧٤٧] Theorie des Null-Elementes

[٧٤٨] Null-Filter

[٧٤٩] Typology

١٥- پەروین   پەیمانی بە ئارام دا، کە  p  ro  بڕوات.
i      i              j     i                i

١٦- (ا) پەروین   داوای لە ئارام کرد، کە pro       بڕوات.
i          i              j       i        i

(ب) پەروین    داوای لە ئارام کرد،  p ro  بڕوات.
j        j             j      i        i

١٧- (ئازادو ئارام)   زۆریان  لە پەروین کرد،     pro        بڕوات.
j         j            j          i               i

١٨- (ئازادو ئارام)   قەناعەتیان  بە پەروین کرد، کە  p  ro    بڕۆن.
i          i              j          i              i

دارشتەی دروستەی ئەم ڕستانە دەتوانرێت وەك لە (١٩) دا کراوە، بخرێتەڕوو.

19- V′  [V′  [N′′ (N′′) V′ V′  [N′′  V′]]]

لە ڕستەکانی (١٤) و (١٥) دا بکەری pro لەگەڵ بکەری ڕستەی سەرەکییدا، بەواتا لەگەڵ N′′ دا هاونیشانەیە. بەڵام لە ڕستەی (١٧) و (١٨) دا لەگەڵ N′′ دا (بەرکاری ڕستەی سەرەکیی و بکەری ڕستەشکاوەکە) هاونیشانەیە. بەم لێکدانەوەو تێگەیشتنەم، بکەری pr o یان لەڕێی بکەر یان لەڕێی بەرکاری ڕستەی سەرەکییەوە لێکدەدرێتەوە. ئەمەیش، هەر وەك ئامارژەم بۆ کرد، پەیوەندییەکی گرژ لەنێوان تیۆریی کەرەستەی سفرو تیۆریی کۆنترۆڵدا دەهێنێتە ئاراوە، کە تەنها بە ڕێزمانی کوردیی چارەیدەکرێت و دووردەخرێتەوە. دانانی واژەگۆکەری تەواوکەرانە /کە/ ڕۆڵێکی مەزن لە لێکدانەوەی بکەری pr o ی ڕستەشکاوەکەدا دەبینێت (بڕوانە ١٦ (ا) و (ب)). جیاوازییەکە S یان S′ ی ڕستەشکاوەکە دروستیدەکات.

چۆن زمانەکەمان چارەی ئەو کێشەیەی کردووە، کە ئامارژەمپێدا؟
تەواوکەرە کردارییەکە دروستەی ڕستەیەکی سەربەخۆی هەیەو دروستەکەی لەلایەن نیشانەتایبەتییەکانی وەچەدیارییکردنی [٧٥٠] کردارەکەیەوە دیارییدەکرێت. بکەرە سفرە

[٧٥٠] Subkategorisierungseigenschaften

جێناوییەکە دەتوانرێت تەنها لەم دەقە سینتاکسییەداو پەیوەند بە سەرە حوکمکەرەکەیەوە لێکبدرێتەوە. بەلام دەتوانرێت بە پراگماتیکیی لێکدانەوەی جۆراوجۆر یان فرەچەشنی هەبێت. ئەم نیشانەتایبەتییەی بکەری سفرو دەقەسینتاکسییەکەی، کە تێیدا دەردەکەوێت، ڕێدەدەن وەك کەرەستەیەکی سەرەتایی ئازادو سەربەخۆ بناسرێتەوەو دیاریبکرێت. لەم ڕێیەوەو بەم شێوەیە هەولدەدرێت ئازادیی بنەڕەتیی و بنجیی ئەم کەرەستەبکەرییە لەڕێی هێنانەوەی هۆو هۆکارەوە بە سینتاکسیی و بە پراگماتیکیی بسەلمێنرێت.

بکەرە سفرەکە، بۆ نموونە، لە ڕستەکانی (١٤) تا (١٨) یشدا دەتوانرێت جۆراوجۆرو جیاواز لێکبدرێتەوەو بە بکەر یان بەرکار یان بە فرێزی وەچەدیارییکراوی[٧٥١] بەشی کرداری سەرەکییەوە بەسترابێتەوە. ئەم ڕاستییە نیشانەیەکی تایبەتیی کردارەکانی ویست و ئارەزووی زمانی کوردییە.

ئەم نیشانە تایبەتییەی کردار کاتێك دەهێنرێتەدییتن و بەرجەستەدەکرێت، کە زانیاریی فۆنۆلۆژیی نوێ لەسەر ئاستێکی بەرزتر لە ئاستی سینتاکسیی دابنرێت. لەم ڕستانەدا pro o ی بکەرەکە نیشانەتایبەتییە هاوبەشەکانی لەگەل PRO دا دەردەخات. لەم ڕستە هاوواتایانەی[٧٥٢] لای خوارەوەدا pro وەك فرێزێکی ناویی فەرهەنگیی (ناوێکی یان جێناوێکی فەرهەنگیی) و هاونرخ لەگەل کەرەستەی بکەرییدا دەکەوێتەڕوو. لەم ڕستانەدا ئاکارە جێناوییەکەی نیشاندەدات. کەواتە pro ی بکەر دوو جۆر نیشانەی تایبەتیی هەیە. بۆیە کرۆك و گەوهەری بوونی ئەم کەرەستەیە لە زاری سلێمانییدا لە هی زمانەبکەرخراوەکانی دییکەی وەك زمانی ئیتالیی و ئیسپانیی جیاوازە.

٢٠- (ا) pro لەوەدەچێت پرشنگ بییەوێت pro گۆرەویی بچنێت.
(ب) pro لەوەدەچێت ئەو بییەوێت pro گۆرەویی بچنێت.
(پ) pro لەوە دەچێت pro بییەوێت pro گۆرەویی بچنێت.

## ٢/٥) چەشنەکانی کەرەستەسەرەتاییەکانی بکەری سفر

### ٢/٥-١) نا ئارگومێنت[٧٥٣]، ئامارژەنەدەر[٧٥٤]، ئامارژەدەر[٧٥٥]

---

[٧٥١] subkategorisierte Phrasen

[٧٥٢] synonyme Sätze

[٧٥٣] Nicht-Argument

[٧٥٤] Nicht-referentiell

جێناوە سفرەکە بەتەنها لە شوێنی حوکمکراودا دەبینرێتەوە، کە تێیدا لە سەرێکی حوکمکەرەوە دۆخی ڕێزمانیی پێدەدرێت. ئیتر گرنگ نییە، ئەگەر سەرە حوکمکەرەکە نیشانەتایبەتییەکانی "کەس و ژمارە" ی هەڵگرتبێت یان نا. چونکە کەرەستەیەکی سەرەتایی سفر دەتوانێت شوێنەبۆشەکەی بکەر پڕبکاتەوە، ئەگەر سەرەڕێزمانییەکە دۆخی ڕێزمانیی پێببەخشێت. بەم جۆرە ڕوودان و دەرکەوتنی بکەری سفری خاوەن نیشانەی تایبەتیی و بێ نیشانەتایبەتییەکان و بکەری سفری دیارو نادیار ڕێی دەستووریی بە بوونیان دەدرێت[٧٥٦]. ئەم تیۆرییە ڕێبازێکیشی تێدایە، کە لە ڕێیەوە نیشانەتایبەتییەکانی کەرەستەسەرەتاییەکەی بکەر بەیارییدەی دەورووبەرییە زمانییەکەی دووبارە دەناسرێتەوە. ئەگەر توانرا ڕێبازی دووبارەناسینەوەکەی بەکاربهێنرێت، ئەوا بەکارهێنان یان بەدەرکەوتنی کەرەستەسەرەتاییەکەی بکەر هێشتا هەر ڕێپێدەدرێت؛ لەم بارەدا بەتەنها وەك کەرەستەیەکی سەرەتایی بێ ناوەرۆك گۆدەکات یان وەك کەرەستەیەکی سەرەتایی بۆشایی پڕکەرەوە[٧٥٧]. ئەو ڕێسایانەی لەمەوە هەڵقوڵاون، ڕێسای (٢١) و (٢٢) ن و لەمانەوە سەرەو ڕیزبوونە بەپلەوپایەکەی[٧٥٨] (ا) تا (پ) هەڵگوێزراوە.

٢١- فرێزێکی ناویی بەتەنها کاتێك ئامـاژەدەرە، کە نیشانەتایبەتییەکانی " + کەس و +ژمارە و + دایرییکراو" ی هەڵگرتبێت.

٢٢- فرێزێکی ناویی بەتەنها کاتێك ئارگومێنتێکە، کە نیشانەی تایبەتیی ژمارەی هەبێت.

(ا) ئەگەر ئێمە نەتوانین هیچ نیشانەیەکی تایبەتیی ناوەرۆکی کەرەستە بکەرە بۆشەکە دووبارە بناسینەوە یان نەتوانین هیچ نیشانەیەکی ناوەرۆکیی بخەینەپاڵ، ئەوا ئەو کەرەستە بکەرە بۆشە ئارگومێنتێك نییە.

٢٣- Expl. وادیارە، ...

(ب) ئەگەر بەتەنها نیشانەی تایبەتیی ژمارەی کەرەستە بکەرەکە دووبارە ناسرایەوە، ئەوا کەرەستە بکەرەکە ئارگومێنتێکی ئاماژەنەدەرە. ئەوانەی سەر بەم کەرەستە بکەرانەن، نیشانە تایبەتییە ڕێزمانییەکانی "کەسی سێ هەمی تاك و نادیار" یان هەیە.

---

[٧٥٥] referentiell

[٧٥٦] Rizzi (1986)

[٧٥٧] Lückenfüller-Element

[٧٥٨] hierarchische Anordnung

٢٤- pro دەتوانرێت ...

(پ) ئەگەر نیشانە تایبەتییەکانی بکەری سفر توانران بدۆزرێنەوەو بناسرێنەوە، ئەوا pr o ئارگومێنتێکی ئامازەدەرە.

٢٥- pro ئازادن.

بوونی ئەم چەشنانەی بکەری سفر لە زاری سلێمانییدا بەرێکەوت نییەو لەگەڵ ئەو تایپۆلۆژییەی کەرەستە سفرەکاندا یەکدەگرێتەوە، کە دەڵێت: pr o ی بکەر لەو زمانانەدا هەلومەرجی بوونی هەیە، کە یان رێکەوتنی بکەرو کرداری بەهێزیان هەیە یان هیچ رێکەوتنێکی بکەرو کرداریان نییە[٧٥٩].

لێکدانەوەیەکی گشتیی بە Pro ی بکەر دەدرێت و دەخرێتەکی، ئەگەر لەگەڵ ڕەگەزێکدا هاونیشانەبێت (رێکەوتووبێت)، کە ئەو نیشانەتایبەتییەی هەیە.

٢٦- پیاو لەدەستی بێت، p ro هەموو کارێك دەکات.

نیشانە تایبەتییە رێزمانییەکانی " + / - دیار" خراوەتە پاڵ ئێنکلیتیکی کەسی سێ هەمی تاکی ئەو نموونەیەی سەرەوە. کە ئەو ئێنکلیتیکە بە زۆر تر لە نیشانەیەکەوە شییکراوەتەوە، بە هیچ شێوەیەك لادان نییە لە ئاکاری بنجیی و بنەڕەتیی ئەو مۆرفێمانەی، کە لە نێوان دارشتەی فۆنۆلۆژیی و سێمانتیکیی مۆرفێمەکاندا بەرجەستەدەبن. مۆرفێمی /ن/، بۆنموونە، دەتوانێت بەگوێرەی دەقە سینتاکسییەکەی وەك ئێنکلیتیکی کەسی سێ هەمی کۆ یان وەك کەسی دووهەمی کۆ لێکبدرێتەوە.

٢٧- pro هاتن ؟ (ئایا ئەوان هاتن؟)
٢٨- pro هاتن ؟ (ئێوە هاتن؟)

دیارە، کە ئەم چەشنانەی رستە بە ئاوازی جیاوازەوە دەردەبڕدرێن. بەڵام دەربیدەخەن، کە ئێنکلیتیکەکان دەتوانن وەك مۆرفێم فرەواتا بن.

---

[٧٥٩] Rizzi (1986) و پێش ئەمیش Huang (1984)

## ٢-٢/٥) نیشانەتایبەتییەکانی بکەرە بۆشەکە

لە پەسنکردنەکانی زاری سلێمانییمدا دەردەکەوێت، کە سێ جەشنی کەرەستەی بکەری سفر هەیە: نائارگومێنت و ئارگومێنتی ئاماژەنەدەرو ئارگومێنتی ئامارژەدەر. ناسینەوەو دیاریکردنی بکەری سفر وابەستەی دەقسینتاکسییەکەی و ناسنامەی ئامارژەیی (ئامارژەپێدەرەکانە)[٧٦٠]. ئەمە ئەوە دەبەخشێت، کە دەرکەوتنی pro جۆرێك لە پەیوەندیی حوکمکردن و پەیوەندیی بەستنەوەی تێدایەو لە رێیەوە نیشانەتایبەتییەرێزمانییەکانی دیارییدەکرێن.

بەهۆی دەرکەوتن و رِوودانی لە شوێنی حوکمکراوداو بەهۆی نەبوون و حازریی ومچەپێکهاتەبەستێنەوەرێك یان ئۆپەراتۆرێك، نە PRO و نە ڤاریابڵ و نە شوێنپێ وەك کاندیدی pro دادەنرێن و pro یش لەوان جیاوازە. بۆیە بکەری سفر وەك کەرەستەیەکی سەرەتایی بە نیشانەتایبەتییەکانی [ +جێناو ] و [ - ئەنافەر ] ناسراوەو ناوبراوە.

## ٣-٢/٥) pro و جێناوو ئامارژەدارەکان (دێئیکتیکەکان) و ئەنافەر[٧٦١]

بناغەی لێکدانەوەی ئەنافەرو دیاریکردنی پەیوەندیی رێکەوتن، دروستەی سینتاکسیی ومچەپێکهاتەکان و پەیوەندیی و پەیوەستییەکانیانن. لەبەر ئەم هۆیەیە، کە دیاریکردنی سینتاکسیی یان دیاریکردنی ئاکاری سینتاکسیی رەگەزەکان و پەیوەندییەکانیان لەگەڵ یەکتریدا بەپێی مەرج و سنووربۆدانانە دروستەییەکانن.

مەرج و سنووربۆدانانەکان لە رکێفە سینتاکسییەکاندا[٧٦٢] دیاریکراون و سنووریان دەستنیشانکراوە. هەر رکێفێك بەشێکی دروستە سینتاکسییەکەی نەمامە ئەندازیارییەکەیە[٧٦٣]. پەیوەندیی رێکەوتن و هاونیشانەو هاونیشانەکردن لەناو نەمامەئەندازیارییەکاندان. ئەگەر فرێزێکی ناویی لە رکێفی فرێزێکی ناویی ئامارژە (نە) دەردا بوو، ئەوا دەبێت ئەم فرێزەناوییە جێناوێك بێت، تاوەکو جێناوەکە لەگەڵ فرێزەناوییەکە یەکبگرێتەوەو هاونیشانەبێت. بۆ ئەمەیش راینهارت (١٩٧٦، ١٩٨١) ئەم پێناسەیەی داوینەتێ، کە بەشێوەیەکی کەمەکیی پێناسەی دووپاتکراوەیە:

---

٧٦٠ Referenzidentität

٧٦١ pro, Pronomen, Deiktika und Anapher

٧٦٢ syntaktische Domäne

٧٦٣ Baum

٢٩- گرێی A تەنهاو تەنها دەتوانێت ئاڕاستەی وەچەپێکهاتەی گرێی B بکات، کە گرێ دووفلییقانەکەی، ڕاستەخۆ بەسەر A ەوەیە، بەسەر B یشەوە بێت ( A و B یش لەژێر ڕکێفی گرێ دووفلییقانەکەدابن).

ڕکێفی گرێیەکی دیارییکراو لە چەند گرێیەکی دیکە دروستبووە، کە لەڕێی یاسا زمانییەکانەوە پێوەی بەستراون. ئەم چەمکە لە (٢٩) دا بەڕوونیی داڕێژراوە.

٣٠- ڕکێفی گرێی A لە گشت ئەو گرێیانەو تەنها لەو گرێیانە دروستبوون، کە لەلایەن A وە وەچەئاڕاستەکراون.

پەسنکردن و دیارییکردنی ڕێکەوتن و هاونییشانە لە دروستەکاندا، وەك لە S - S´ داو لە V - V´ دا لەڕێی ئەم یاسایەوە داڕێژراوە.

٣١- (ا) گرێی A ئاڕاستەی وەچەپێکهاتەی گرێی B دەکات، ئەگەر ئەو گرێ دوو فلییقانەیەی A ڕاستەوخۆ لە ژێر ڕکێفییدایە، B بێش لەژێر ڕکێفییدابێت.
(ب) یان، ئەگەر ئەو گرێیەی α 1 ڕاستەوخۆ لەژێر گرێی α 2 دا بێت، کە لە هەمان چەشنی ڕەگەزی α 1 ەو β لەژێر ڕکێفییدایە.

با ئێستایش لەم ڕستانە وردبببینەوە، بۆ ئەوەی بزانیین، کام کەرەستەسەرەتاییانە جێناوەکانی زمانەکەمانن.

٣٢- نەوزاد بەتەنها کەسانێکی خۆشدەوێت، کە ئەو دەیاننناسێت.
i j i i j i

٣٣- * ئەو بەتەنها کەسانێکی خۆشدەوێت، کە نەوزاد دەیاننناسێت
i j i i j i

٣٤- * نەوزاد بەتەنها کەسانێکی خۆشدەوێت، کە نەوزاد دەیاننناسێت
i j i i j i

٣٥- * ئەو بەتەنها کەسانێکی خۆشدەوێت، کە ئەو دەیاننناسێت
i j i i j i

داڕشتەی دروستەیی ئەو ڕستانە دەتوانرێت وەك لە (٣٦) دا بخرێتەڕوو یان بنوێنرێت.




بەپێی مەرج و سنوورەدانراوەکانی پەیوەندییەکانی ڕێکەوتن (٢٩-٣٠) N′′1 وەچەئاڕاستەی N′′2 دەکات. بۆئەوەی N′′2 لەگەڵ N′′1 دا هاونیشانەبێت، پێویستە N′′2 جێناوێك بێت. بەڵام لەبەرئەوەی N′′2 لەگشت ئەم ڕستانەدا جێناوێك نییە، هاونیشانەیەك لەنێوان N′′2 و N′′1 دا ڕێپێنادرێت. بەڵام ئەگەر پەیوەندییەکی ناهاونیشانەیی[٧٦٤] یان جیا لەنێوان N′′1 و N′′2 دا هەبێت، ئەوا ڕستەکان ڕێزماندروست و ڕاست دەبن.

لە (٣٢) و (٣٥) دا شوێنی N′′2 بە جێناوێکی کەسیی گیراوە، کە لەگەڵ N′′1 دا لە نیشانەتایبەتییەکانی "کەس و ژمارە" دا وەکیەکن و یەکدەگرنەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەم جێناوە لەژێر دەستەڵات و لەناو ڕکێفی شارستەکەدایە، ناتوانێت لەگەڵیدا ڕێکبکەوێت یان هاونیشانە بێت.

ئەگەر ئێمە لەبری جێناوەکە (N′′2) جێناوە سفرەکە دابنێین، ئەوا ڕستەکانی (٣٢-٣٥) دروستەی سینتاکسیی فۆڕمدروستیان دەبێت. لەمانەوە دەتوانم ئەم ئەنجامانە هەڵبهێنجم:

---

[٧٦٤] eine disjunktive Beziehung

(ا) pro نیشانەی تایبەتیی زگماکیی [ +جێناو ] ی هەیەو

(ب) وەك ئەمە pro لەگەڵ جێناوە کەسییەکاندا لە دابەشبوونێکی تەواوکەرانەدایە. هەر کە فرێزێکی ناویی فەرهەنگیی لە ڕستەیەکی ئاڵۆزدا[٧٦٥] لەگەڵ بکەری ڕستەوەچەپێکهاتەکەیدا هاونیشانەبێت، دەبێت pro لەجێی دابنرێت (بڕوانە بەشەکانی خواروو). بەم جۆرە جێناوکەسییەکان خۆیان لە کەرەستەسەرەتاییە جێناوییەکان جیادەکەنەوەو گرووپێك دروستدەکەن، کە ئاکاری ئامارژەدارەکان نیشاندەدەن. بۆ نموونە، بەکارهێنانەکانی جێناوەئیشارییەکان[٧٦٦] و پەیوەندییان بە جێناوەکەسییەکانەوە بەراوردبکە: <من>، <ئەو>، <ئەوان>.

٣٧- منێك، کە pro کوردم.

"ئەو کوڕە" بەرامبەر "ئەم کوڕە"
"ئەوانە" بەرامبەر "ئەمانە".

ئەگەر ئێمە بەم جۆرە جێناوەکەسییەکان ناوبنێین "ئامارژەدار" (دێئێکتیك) و کەرەستەسەرەتاییە سفرەکە ناوبنێین "جێناو"، ئەوا ئێمە لە پرۆسەیەکی بەجێناوبوون دەدوێین، کە pro ی بکەری نافەرهەنگیی لەسەر ئاستی ڕووکەش دەگرێتەوە. بەم گوێرەیە ڕستەکانی (٣٢-٣٥) کاتێك ڕێیانپێدەدرێت، کە شوێنی بکەری ڕستەی وەچەپێکهاتەکە بە بکەرێکی سفری جێناو گیرابێت/پڕبووبێتەوە.

٣٨- ئازاد بەتەنها کەسانێکی خۆشدەوێت، کە p ro دەیانناسێت.
i j i i j i

٣٩- ئەو بەتەنها کەسانێکی خۆشدەوێت، کە p ro دەیانناسێت.
i j i i j i

ڕستەکانی (٣٨) و (٣٩) پرۆسەی بەجێناوبوونیان تێدا جێبەجێکراوە. ئامارژەیش بۆ ئەوە دەکەن، کە بەجێناوبوون لە زاری سلێمانییدا پرۆسەیەکە، ئاراستەکەی بەرەوپێشەوەیە[٧٦٧].

---

[٧٦٥] komplexer Satz

[٧٦٦] Demonstrativpronomen

[٧٦٧] progressiver Prozeß

ئەم ئەنجامليٚکدانەوەيە لەو ڕێيەوە پشتييدەگيريٚت، کە ئەم چەشنە ڕستانەی لای خـوارەوە ڕێيانپيٚنادريٚت.

٤٠- * pro بەتەنها کەسانيٚکی خۆشدەويٚت، کە نەوزاد دەيانناسيٚت.
i j i i j i

٤١- * pro بەتەنها کەسانيٚکی خۆشدەويٚت، کە ئەو دەيانناسيٚت.
i j i i j i

بەدەستپيٚکردن و دەرچوونم لە گشت ئەو گريمانە پەسنکەرانەوە ئەم زانيين و پيٚزانراوانەم چنگکەوت:

(ا) جيٚناوەکەسييەکان لەگەلٚ ئامارٛەدارەکانداو (ب) جيٚناوەکەسييەکان لەگەلٚ pro داو (پ) pro لەگەلٚ جيٚناوە ئيشارييەکاندا هاوبەشيی گۆکەرانەيان لەگەلٚ يەکتريیدا هەيە. جيٚناوە سفرەکە، هەر وەك بۆی چووم، دوولايەنييە. بەهۆی ئاکارە جيٚناوييەکەيەوە ئازادە. بەهۆی پەيوەنديیە دروستەييەکانييەوە دەتوانيٚت، وەك جيٚناوييە خۆييەکان، لەگەلٚ کەرەستەی سەرەتايی ديیکەدا هاونييشانەبيٚت. هاوبەشييە گۆکەرانەکە لە نيٚوان جيٚناوە خۆييەکان و pro دا سنووردياريیکراوە. هەردووکيان تەنها ئەو کەرەستەسەرەتاييە زمانييانەن، کە پەيوەندييە هاونييشانەييە پيٚويستەکان دەردەبڕن. هەردووکيان دابەشبوونی سينتاکسيی تەواوکەرانەيان لەگەلٚ يەکتريیدا هەيە. لەکاتيٚکدا pro تەنها لە شويٚنی بکەردا ئەم گۆکردنەی جيٚبەجيٚدەکات، جيٚناوەخۆييەکان هەمان گۆکردن لە شويٚنی بەرکاری ڕاستەوخۆدا بە ئەنجامدەگەيەنن.

## بەلٚگەی بابەتانەو ئەزموونبەند:

جيٚناوە خۆييەکان و pro سەر بە ڕەگەزە فەرهەنگييەکانی "جيٚناوەکان" ن. جيٚناوەخۆييەکان کەرەستەی سەرەتايی زمانيين بە نييشانەی تايبەتيی زگماکيی[ + ئەنافەر ] ەوە، بە پيٚچەوانەيانەوە pro نييشانەی تايبەتيی [ +جيٚناو ] ی هەلٚگرتووە.

لەبەرئەوەی هەردووکيان نييشانەی تايبەتيی [ +جيٚناو ] ی هاوبەشيان هەيەو چونکە لەهەنديٚك دروستەی ڕستەی دياريیکراودا هەنديٚك پەيوەنديی هاونييشانە دەردەبڕن، چاوەڕيٚدەکريٚت، کە هەردووکيان هەنديٚك هاوبەشيی سينتاکسيی دياريیکراويشيان هەبيٚت.

(ا) دروستە بە فريٚزی پيٚشناويی هيٚنراوەپيٚشەوە[٢٦٨]:

---

[٢٦٨] voranggestellte PPs

٤٢- بۆ خۆیان، ئەوان خەباتدەکەن.

i i i

٤٣- لەتەنیشت خۆیەوە، شیرین منداڵەکەی خەواندووە.

i i i

دارشتەی دروستەی ڕووکەشیی ڕستەکان لە (٤٤) دا خراوەتەڕوو.




لە (٤٤) دا بەپێی (٣١) N''1 وەچەئاڕاستەی N''2 دەکات ولەژێر ڕکێفییدایە. N''1 دەتوانێت لەگەڵ N''2 هاونیشانەبێت، ئەگەر جێناوێك بێت. لەبەرئەوەی شوێنی سینتاکسیی N''2 شوێنی بەرکاری ڕاستەوخۆیە، تەنها جێناوی خۆیی دەتوانێت لەو شوێنەدابێت.

ڕستە ڕێزماندروستە (ڕاستەکان) ی (٤٢) و (٤٣) دەریدەخەن، کە ئاڕاستەی پەیوەندیی کۆرێکەوتن (کۆنیشانەکردن)[٧٦٩] مەرج نییە هەر بەرەو پێشەوە بێت. بەهۆی هاوبەشییەکانی نێوان pro و جێناوەخۆییەکانەوە چاوەڕێدەکەم، کە ئاڕاستەی پرۆسەی بەجێناوبوون بەرەو پشتیشەوە بێت.

(ب) پێشناوەکانی <لەپاش ئەوەی>، <لەگەڵ ئەوەیشدا>:

---

٧٦٩ Koreferenzbeziehungen

ئەمانە لـە پێشـناوێك و ڕسـتەیەك پێكدێـن. لەبەرئـەوەی ئـەم پێشـناوانە بەشـێكی زگمـاكی كردار نین، سـەر بە ڕستەن. بۆیە بەپێچەوانـەی ئـەو پێشـناوانەوەی، كـە بەشـێكی زگمـاكیی كردارن، دەتوانرێن بخرێنە پێشەوەی ڕستەوە.

٤٥- لەگەڵ ئەوەیشدا كە pro یەككەمن، هێشتا (ئەوان) هەر ناڕازیین.
i i i i

٤٦- لەگەڵ ئەوەیشدا، كە pro زۆر زەنگینە، (ئەو) هێشتا هەر هەڵپەیەتی.

ئاوەڵكردارەكـانی وەك <هەركـە> و مۆرفێمـە بـەندەكانی[770] وەك <هەرچـەندە> یـان لەگـەڵدا بەراورد بكە! بڕوانە (٤٧) و وەك داڕشتەی دروستەی ڕووكەشیی (٤٥) و (٤٦) ببینە!

47-




ئەو پەیوەندییەی، لە نێوان N´´1 و N´´2 هەیە، بابەتی مـەرج و سـنووری پەیوەندییـەكانی هاونیشـانەی (٢٩-٣١) یـە. ئەگـەر ئـەم دوو فرێزەناوییـە هاونیشـانە بـن (هـەمان نیشـانە

---

٧٧٠ Konjunktionen

هەڵبگرن)، ئەوا دەبێت N´´2 جێناوێك بێت. چونكە شوێنی سینتاکسیی N´´2 جێگەی بکەرە، دەبێت هەر بە p ro پڕبکرێتەوە.

## ٢/٥-٤) بکەری سفر وەك جێناوێکی ئازاد

کە جێناوە سفرەکە لەگەڵ ڕەگەزێکی دیکە هاونیشانەیە، ئەوە دەبەخشێت، کە ئەو جێناوە بکەرە لەلایەن ڕەگەزەکەوە کۆنترۆڵی لێکدەرەوەیی دەکرێت. بکەرە سفرە جێناوییەکە نیشانەی تایبەتیی خۆی هەیەو هاونیشانەیی (ڕێکەوتنی) بکەرو بەشی کردار دەرەخسێنێت. نیشانەتایبەتییە ڕێزمانییەکانی لە ڕێی دەقە سینتاکسییەکەیەوە دەناسرێنەوە؛ کەواتە pro بەپێی دەقە زمانییەکەی لێکدانەوەی جۆراوجۆرو جیاوازی هەیە؛ لەناو دەقەسینتاکسییەکەدایە، کە pro ئازادە. بەڵگەهێنانەوەکان بۆ داواکردنی ئەم گریمانەیە پەیوەستن بەم ڕاستییانەوە:

(ا) ئەو بکەرە سفرە نافەرهەنگییەی دروستەی ڕووکەش سەر بە ڕەگەزە جێناوییەکانە.
(ب) بکەرە سفرە جێناوییەکەو جێناوەخۆییەکان چەند نیشانەیەکی هاوبەشیان هەیە.
(پ) لەسەر بناغەی (ا) و (ب) یە، کە p ro ی بکەر کەرەستەیەکی سەرەتایی دوو لایەنەیە.
(ت) ڕستەی وەچەپێکهاتەکەو بەتایبەتیی پارستەکە دروستەیەکی سینتاکسیی سەربەخۆی هەیە.

لەئەنجامی ئەمانەدایە، بکەری pro ی ڕستەی وەچەپێکهاتەی زۆربەی زۆرترین ڕستەئاڵۆزەکان دەتوانرێت لەگەڵ هەر ڕەگەزێکی ڕستەسەرەکییەکەدا پەیوەندییەکی ڕێکەوتن و هاونیشانە[٧٧١] یان پەیوەندییەکی ناڕێکەوتن و جیایان[٧٧٢] هەبێت.

٤٨- (ا) ئارام$_i$ دەیەوێت$_i$ p ro$_i$ بڕوات$_i$.

(ب) ئارام$_i$ دەیەوێت$_i$ p ro$_j$ بڕوات$_j$.

[٧٧١] Koreferenzbeziehung

[٧٧٢] Disjunktionsbeziehung

هەمان شییکردنەوە دروستەییەکە پەیوەندییە سینتاکسیی و سیمانتیکییەکەی (١٦) یش ڕووندەکاتەوە؛ چونکە بکەری pro لە گشت ئەو وەچەپێکهاتانەدا نیشانەتایبەتییە جێناوە ڕاستەقینەییەکەی نیشاندەدات. بکەرە سفرەکە لە (٥٨) دا دەتوانرێت بەگوێرەی دەقەکەی بە دوو جۆر لێکبدرێتەوە. لە (٤٨ (ا)) دا قورساییە سەرەکییەکە لەسەر بەشی کرداری ڕستەی وەچەپێکهاتەکەیە. لەم بارەدا بکەری ڕستەی وەچەپێکهاتەکە لەگەڵ بکەری ڕستەسەرەکییەکەدا هاونیشانەیە. پەیوەندییەکە ناگۆڕێت، ئەگەر بەشی کرداری ڕستەسەرەکییەکە بەتایبەتیی قورسایی خرابێتەسەر. ڕستەی (٤٨ (ا)) و ڕستەی (٤٨ (ب)) لەڕووی سینتاکسییەوە وەکیەك و هاونرخن. تەنها جیاوازییەك لەنێوان هەردووکیاندا لەوەدایە، کە قورساییخستنەسەری سەرەکیی تێیدا لەسەر بکەری ڕستەسەرەکییەکەیە. سەرەنجامی ئەمەیش ئەوەیە، کە لێکدانەوەی جیاوازیان هەیە. ئەوەی سەرنجڕاکێشەرە، ئەوەیە، کە ڕوودانی لە (٤٨ (ب)) دا سەرپشکییەو بە ویست و ئارەزووی قسەکەرەو لە (٤٨ (ا)) دا بەزۆرو خورتەکییە.

ڕستەی (٤٩) کاتێك ڕێی پێدەدرێت، کە قورسایی سەرەکیی لەسەر بکەری ڕستەی سەرەکیی یان لەسەر بەشی کرداری ڕستەی وەچەپێکهاتەکە بێت. ڕستەی (٥٠) بۆیە ڕێزماندروست و واتاڕاستە، چونکە قورسایی سەرەکیی لەسەر بکەرە فەرهەنگییە بەرجەستەبووەکەی ڕستەی وەچەپێکهاتەکەیەتی.

٤٩- ئارام دەیەوێت pro بڕۆن.
٥٠- ئارام دەیەوێت ئەوان بڕۆن.

من کاتێك ڕستەکانی (١٤-١٨) م پەسندەکرد، ڕووبەڕووی کێشەیەك بوومەوە، چونکە لەو ڕستانەدا پەیوەندییەکی گرژم لە نێوان تیۆریی کەرەستەی سفرو تیۆریی کۆنترۆڵدا بەدییکرد. ڕستەکانی (١٦-١٨)، کە ڕستەسەرەکییەکانیان کردارێکی هۆکارییان[٧٧٣] تێدایە، نیشانیاندا، کە بکەرە سفرە جێناوییەکەیان کەرەستەیەکی ئازادە. هەمان کردارە هۆکارەکە بورەتەهۆی پەیدابوونی پەیوەندییە گرژەکەی نێوان هەردوو تیۆرییەکە. چۆن ئێمە لەم کێشەیە ڕزگارماندەبێت، دەمەوێت لەم پارانەی لای خوارەوەدا ڕوونیبکەمەوە.

---

[٧٧٣] kausatives Verb

## ٣/٥) کردارە هۆکارییەکان[٧٧٤]

### ٣/٥-١) پەیوەندیی ڕێکەوتن و هاونیشانەکردنی سەرپشکیی pro

هەر ڕستەیەکی سەرەکیی ڕستەکانی (١٥-١٨) کردارێکی هۆکاریی دیارییکراوی هەیە. بکەری ڕستەی وەچەپێکهاتەی ئەم ڕستانە بکەری pro یەو بەزۆرو خورتەکیی لەگەڵ بکەری یان بەرکاری ڕستەسەرەکییەکەدا هاونیشانەیە. بەڵام بەپێی دەقەکەیشی و بەند بە سەرە حوکمکەرەکەیەوە دەشێت هاونیشانەیش نەبن. کردارەهۆکارەکە کارتێکردنێکی لەسەر لێکدانەوەی ناوەڕۆکی pro نییە. ئەو بکەرە سفرە جێناوییە ئاکارە نەبەستراوەییەکەی دەسەلمێنێت.

### ٢-٣/٤) پەیوەندیی ڕێکەوتن و هاونیشانەبوونی بەزۆرو خورتەکیی pro

لە هەندێك لەو دروستانەی ڕستەدا، کە ڕستەی سەرەکیی کردارێکی هۆکاریی (١٥-١٨) یان تێدایەو بکەری p ro ڕستەی وەچەپێکهاتەکەی یان پاڕستەکەی ڕوون و ئاشکرایە، بکەرە pro کەی لەگەڵ یەکێك لە ڕەگەزەکانی ڕستەسەرەکییەکەدا هاونیشانەیە. بکەرە سفرەکە لە (٥٢) دا لەناو ڕکێف و لەژێر دەستەڵاتی بکەری شاڕستەکەدایە. لەگەڵ ئەمدا هەمان نیشانەی ئامارژەدەریی[٧٧٥] هەڵگرتووە. بکەرە سفرەکە لە (٥٣) و (٦٤) دا کەوتۆتە ناو ڕکێفی بەرکاری ڕستەکەوەو لەگەڵییدا وەکیەکن. لێکدانەوەی تەواو ڕوون و ئاشکرای بکەرە سفرەکەی ئەم ڕستانە وابەستەی کەرەستە کۆنترۆڵکەرەکەیەتی.

٥٢- من پەیمانمدا، کە p ro بڕۆم.
٥٣- ئازاد زۆری لەمن کرد، کە p ro بڕۆم.
٥٤- ئازاد داوای لەمن کرد، کە p ro بڕۆم.

بکەرە سفرەکە لەو ڕستانەدا نیشانە نا جێناوییەکەی[٧٧٦] دەردەخات. دروستە سینتاکسییە سەربەخۆکەی ڕستەی وەچەپێکهاتەو ئەو گریمانەیەی، کە دەڵێت بکەری pr o خاوەنی نیشانە تایبەتییە ڕێزمانییەکانی خۆیەتی، پێشبینیی لەوەدەکەن، کە ڕێکەوتن و

---

[٧٧٤] die Kausativen Verben

[٧٧٥] Referenzindex

[٧٧٦] nicht-pronominale Eigenschaft

هاونیيشانەيی بکەرو بەشی کردار لە ئاستی ڕووکەشدا دێتەئاراوە. لەمەیشەوە دەتوانرێت ئەو ئەنجامە هەڵبهێنجرێت، کە پرۆسەکانی هاونیيشانەکردنی نێوان هەر دوو ڕەگەزەکەی ڕستەسەرەکییەکەو بکەرە سفرە جێناوییەکەی ڕستەی وەچەپێکهاتە لە هەندێك ئاستی بەرزتردا لە ئاستی دروستەی ڕووکەش جێبەجێدەکرێن. ئەم ئاستە بەرزترەیش یان ئاستی LF یان ئاستی ´LF ە. دواخستنی ئەم پرۆسەیە بۆ ئاستی ´LF هێزێکی بەگشتییکردن و گشتوەگریی[٧٧٧] هەیە. یەککەمیین، چونکە ئەم ئاستە مەرجی دارشتەیی ڕستەیە؛ کەواتە دارشتەیەکی ڕستەیە، کە ئەو ڕستانەی لێوەرناگیردرێت، کە ڕێیانپێنادرێت و دووهەمییش، چونکە ئەم ئاستە وەك ڕێسایەك بۆ ڕوونکردنەوەی هەندێك پەیوەندیی سێمانتیکیی ئەو وەچەپێکهاتە دیارییکراوانەی ڕستەی وەك "ڕستەسەرجێناوییەکان[٧٧٨]" دەخوات.

٥٥- دروستەی ڕووکەش (SS)

من پەیمانم بە ئەوان دا، کە pro بڕۆم.

i i j z z

٥٦- ئاستی ´LF

من پەیمانم بە ئەوان دا، کە pro بڕۆم.

i i j i

ڕێکەوتن و هاونیيشانەيی بکەرو بەشی کردار لەسەر دروستەی ڕووکەش سەلماندنێکی باوەڕپێکراوە بۆ نیيشانەتایبەتییە جێناوییەکەی بکەری سفر (pro). دواخستنی پرۆسەی هاونیيشانەکردنەکە بۆ ئاستی ´LF بۆ ئەو مەبەستەیە، بکەرە سفرەکە وەك کەرەستەیەکی جێناویی و بە نیيشانەی زگماکیی خۆیەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت. تەنها گۆکردنی پرۆسەی هاونیيشاەکردنەکە[٧٧٩] لەسەر ئەم ئاستە دەربڕییینی یەکگرتنەوەو وەکیەکیی واتاییی[٧٨٠] نێوان ڕستە بنجیی و بەرایییەکانی ڕستە ئاڵۆزەکان و بەتایبەتیی نێوان ڕەگەزەکانی ڕستە ئاڵۆزەکانن.

---

[٧٧٧] eine starke Generalisierungskraft

[٧٧٨] Relativsatz

[٧٧٩] Koindizierungsprozeß

[٧٨٠] semantische Übereinstimmung

## ٤/٥) بە جێناوکردن وەك پرۆسەیەکی یاساجڵەوگیر[٧٨١]

### ٤/٥-١) زاراوەی "بەجێناوکردن"

بکەری pro بەگشتیی و بکەری سفری ڕستەی وەچەپێکهاتە بەتایبەتیی دەتوانن لە ڕێی پرۆسەی بەجێناوکردنەوە ڕووبدەن و دەربکەون. زاراوەی "بەجێناوکردن" دەتوانرێت بە دوو جۆر لێکبدرێتەوە:

(ا) ئەو ڕەگەزە فەرهەنگییەی لە شوێنە چۆڵەکەی ئارگومێنتەکەدا دادەنرێت، لەسەر دروستەی ڕووکەش بە فۆنەیتیکیی بەرجەستەناکرێت و ناهێنرێتەبیستن[٧٨٢]. ئەمە ئەوە دەبەخشێت، کە ڕەگەزەکان لە دروستەی قووڵدا وەك "کەرەستەی فەرهەنگیی بەرجەستە" هەن و کە ئەو کەرەستانە لەسەر دروستەی ڕووکەش فۆرمە فۆنەیتیکییەکانیان نابێت یان نامێنێت.

(ب) لەکاتێکدا شوێنە بۆشەکەی ئارگومێنتەکان بە ڕەگەزەکان دەگیرێن، هەندێك شوێنی دیاریکراو (لەم بارەدا شوێنی بکەری ڕستە) بە سەرپشکیی یان بە زۆرو خورتەکیی بە کەرەستەیەکی سفر (pro ) دەگیرێت. چونکە لە شوێنی هەندێك بکەری دیاریکراوی ڕستەدا کەرەستەی فۆنەیتیکیی بۆش دادەنرێت و لەبەرئەوەی ئەم کەرەستانە نیشانەی تایبەتیی جێناوییان هەیە، ڕەوتی کردەی دانەنانی[٧٨٣] کەرەستەکە وەك پرۆسەی بەجێناوکردن لێکدەدرێتەوەو هەندێك زمانەوان وەهای تێدەگەن.

لەوەدەچێت بۆچوون و لێکدانەوەی (ا) لەڕووی نەزەرییەوە خۆڕاگر نەبێت. بە پێچەوانەوە تیۆریی دووهەم دیاردەی دەرکەوتنە سەرپشکیی و بەزۆرەکانی بکەری pro لە زاری سلێمانییدا دەگرێتەوەو نیشانیدەدات، کە ئەو ڕێسایەی لە (٤/٢) دا هێنرایەوە، مەرج و سنووربۆدانانێکی بەهێزی هەیە، چونکە بکەری pro وەك کەرەستەیەکی وەها ڕووندەکاتەوە، کە خاوەنی نیشانەی تایبەتیی خۆیەتی و کە شوێنێکی بابەتانەی فرێزێکی ناویی تایبەتی هەیەو شوێنەکەیشی لەلایەن کردارێکەوە دیاریکراوە[٧٨٤].

---

[٧٨١] die Pronominalisierung als ein regelgesteuerter Prozeß

[٧٨٢] wird phonetisch nicht realisiert

[٧٨٣] der Vorgang der Nicht-Einsetzung

[٧٨٤] eine vom Verb bestimmte NP-θ-Position

٥/٤-٢) یاساکان

**بەجێناوکردنی بکەری ڕستەی "ڕستەی سەرەکیی":**

شوێنی بکەری هەر ڕستەیەکی بنجیی و بەرایی[٧٨٥] و شوێنی بکەری ڕستەی سەرەکیی و شاڕستەی هەر ڕستەیەکی ئاڵۆز دەتوانێت لە دروستەی ڕووکەشدا بەرجەستەبوون و هاتنەبیستنی فۆنەیتیکیی نەبێت. بۆیە ئەو بکەرە فرێزەناوییەی ئەم ڕستانە دەتوانێت لە دروستەی ڕووکەشدا یان بە pro یان بە فرێزێکی ناویی فەرهەنگیی بەرجەستە بگیرێت و پڕبکرێتەوە. ڕوودان و دەرکەوتنی pro لەڕێی ڕێکەوتنی زەنگیین و بەهێزەوە[٧٨٦] دەسەلمێنرێت. ئەمەیش دەتوانرێت وەك یاسایەك بەم شێوەیەی لای خوارەو دابڕێژرێت.

**٥٧-** جێناوە سفرەکە بە سەرپشکیی لە شوێنی بکەری هەر ڕستەیەکی سەرەکیی و ڕستەیەکی بنجیی و بەراییدا دابنێ، ئەگەر جێناوە سفرەکە بە ڕێکەوتنێکی زەنگیین و بەهێزەوە بەندو بەستراوەبوو.

زاراوەی "ڕێکەوتنی زەنگیین و بەهێز" لێرەدا بەتەنها ئەو ڕەگەزە دەگرێتەوە، کە نیشانەتایبەتییە ڕێزمانییەکانی "کەس و ژمارەو دیارو نادیاریی" بۆ تەرخانکراوە.

**"نەکردن بە کەرەستەی فەرهەنگیی"[٧٨٧] بکەری ڕستەی وەچەپێکهاتە:**

بە فەرهەنگیی نەکردنی بکەری ڕستەیەکی وەچەپێکهاتە یان پارستە بە سەرپشکیی یان بەزۆرو خورتەکیی و بە ناچارییە. کاتێك بە سەرپشکییە، کە بکەری ڕستەی وەچەپێکهاتەکە لەگەڵ هیچ ڕەگەزێکی ڕستەسەرەکییەکەدا هاونیشانە نەبێت؛ بۆیە دەبێت (٥٧) وەك (٥٨) دووبارە دابڕێژرێتەوە.

**٥٨-** جێناو سفرەکە بە سەرپشکیی لە شوێنی بکەری هەر ڕستەیەکی بنجیی و بەرایی و ڕستەی ئاڵۆزدا دابنێ، ئەگەر لەگەڵ کەرەستەیەکی دیکەدا زەنگیین و بەهێز هاونیشانە بوو (ڕێکەوتنی هەبوو) وە ئەگەر لەگەڵ هیچ ڕەگەزێکی دیکەدا، کە کەوتووەتە دەرەوەی ڕەگەزە حوکمکەرەکەی، هاونیشانە نەبوو.

---

[٧٨٥] Elementar-Satz

[٧٨٦] starke Kongruenz

[٧٨٧] Nicht-Lexikalisierung

٥٩- pro ویستیان pro بچین بۆ فێرخانە.
i i j j

بەڵام دانانی جێناوە سفرەکە بەزۆرو بە ناچارییە، ئەگەر بکەری ڕستەی وەچەپێکهاتەکە لەگەڵ یەکێك لە دوو ڕەگەزەکەی بەشی کردارەسەرەکییەکەدا[٧٨٨] هاونیشانەبوو. لەم بارەدا ناشێت بکەری ڕستەی وەچەپێکهاتەکە بەتایبەتیی بەرزبکرێتەوەو قورسایی تایبەتیی بخرێتەسەر.

٦٠- pro پەیمانتپێدەدەم، کە من جارێکی تر کاری وەها نەکەم.

یاسای سێ هەم دەتوانرێت وەك لە (٦١) دا دابڕێژرێت.

٦١- جێناوە سفرەکەی pro لەشوێنی بکەری ڕستەی وەچەپێکهاتە دابنێ، ئەگەر لەگەڵ کەرەستەیەکی دیکەدا ڕێکەوتنی زەنگین و بەهێزی هەبوو، وە ئەگەر لەگەڵ ڕەگەزێکی ڕستەی سەرەکییدا هاونیشانەبوو وە بەتایبەتیی بەرزکرابووەو قورسایی زۆری خرابووە سەر.

پرۆسەی دانەنان و نیشانەتایبەتییە جێناوییەکەی بکەری سفر لەگەڵ دواخستنی پرۆسەی هاونیشانەکردنەکە بۆ ئاستی LF′ نیشانە ئازادییە زگماکییەکەی ئەم ڕەگەزە دەسەلمێنن. ئەم زانین و پێزانینەو ناسینەوەو دیارییکردنی بکەری pro یە وەك ڕەگەزێکی ئازاد ئەوەمان بۆ دەرەخسێنن، واز لە چارەسەرکردنی دیکەی وەك دووبارە شییکردنەوەی بابەتانەی ڕەوڤێرت و ڤێرگناود[٧٨٩] بهێنین.

کورتەو پوختەو ئەنجامڵێکدانەوە:
کەرەستە سفرەکەی بکەری ڕستە سەر بە ڕەگەزەکانی "نا ئارگومێنت"[٧٩٠] و "ئامارژەنەدەر"[٧٩١] و "ئارگومێنتی ئامارژەدەر"[٧٩٢] ن. لە هەندێك دروستەکانی ڕستەدا لەنێوان ئارگومێنتی ئامارژەدەر (pro) و تیۆریی کۆنترۆڵدا پەیوەندییەکی گرژ هەیە. چونکە جێناوە

---

[٧٨٨] Matrixprädikat

[٧٨٩] Rouvert and Vergnaud (1980)

[٧٩٠] Nicht-Argument

[٧٩١] nicht-referentiell

[٧٩٢] referentielles Argument

سفرەکەی ئەم ڕستانە، کە ڕستەسەرەکییەکەیان کردارێکی هۆکاریی تێدایە، وەك کەرەستەیەکی بەستراوە دەردەکەوێت، کە لەڕووی لێکدانەوەوە لەلایەن کەرەستەیەکی ترەوە کۆنترۆڵکراوە. کەرەستە سفرەکە نوێنەری جێناوی ئەم زمانەیە. وەك ئەمە دەتوانێت لەگەڵ دوو ڕەگەزە فەرهەنگییە "جێناوەکەسییەکان" و "جێناوە خۆییەکان" دابەشبوونێکی تەواوکەرانەی هەبێت. بۆیە ئاکارەکەی وەك کەرەستەیەکی جێناویی بە نیشانەتایبەتییەکانی [+جێناویی، - ئەنافەر] دیارییدەکرێت. دیارییکردنی بکەری pro وەك ڕەگەزێکی دوو ڕوو یان دوو لایەنە، مەرجە پێشەکییەکەی ئەوەیە جێناویی بێت؛ ئەمەیش ئەو مەبەستەیە، کە لێرەدا ویستوومە بیسەلمێنم.

بۆ ڕوونکردنەوەی پەیوەندییە گرژەکەی نێوان تیۆریی کەرەستەی سفرو تیۆریی کۆنترۆڵ دوو ئەگەرو بۆچوون هەن:

(ا) کەرەستە هاونیشانەکانی (بکەرو بەرکاری ڕستەی سەرەکیی) دەگەڕێنەوە بۆ نیشانە ڕەگەزییەکانی پرۆژەکانی[٧٩٣] ڕستەی کوردیی. بۆ ئەم مەبەستەیش دارشتەی خراوەڕووی (٢٧) لە (٠/٢-٢/٢-٥) دا ڕوونکردنەوەیەکی باوەڕپێکەرە. بەرجەستەنەکردن و هێنانەنەبیستنی فۆنەیتیکیی بکەری ڕستە لە دروستەی ڕووکەشدا یەککگرتنەوەی سێمانتیکیی و واتایی[٧٩٤] وەك سەرچاوەی تەقاندنەوەی سەیردەکرێت. ئەمەیش پرۆسەیەکی فۆنۆلۆژییە، کە مەبەست و هۆکاریی فۆنۆلۆژیی هەیە.

(ب) دروستە سینتاکسییە سەربەخۆکەی ڕستەی سەرەکیی و ڕستەی تەواوکەر لەگەڵ ئاکارە جێناوییەکەی بکەری سفر pro و ئەگەری پرۆسەی هاونیشانەکردنی نێوان ئەو کەرەستانەی یەکدەگرنەوەو ڕێکەوتنیان هەیە، لەسەر ئاستی LF ی ئەم ڕستانە ڕێدەدەن بکەرە سفرەکە وەك کەرەستەیەك بە دوو نیشانەی تایبەتیی جیاوازەوە بناسرێتەوەو دیارییبکرێت.

---

[٧٩٣] kategoriale Eigenschaften der Projektionen

[٧٩٤] Semantische Übereinstimmung

## بەشی شەش هەم

# بکەرنادیار[٧٩٥] لە زمانی کوردییدا

## ٦/١) تۆمارکردنی فەرهەنگیی[٧٩٦]

بانگەشەی ئەو گریمانەو بۆچوونە، کە پێکهاتەی گواستنەوەی گشت مۆدێلی ڕێزمانی زمانێکی دیارییکراو یاسای گواستنەوەی " α بجوولێنە" ی تێدا نییە، لەتەك هەندێك سەرەنجامی دییکەدا بە خشکەیی ئەوە دەردەبڕێت، کە ڕستەی بکەرنادیارو وەچەپێکهاتەکانی پرسیار لەو زمانەدا هیچ جۆرێك لە جولآندنی فرێزی ناویی بە واتای گواستنەوەوە نییشانناداتو ناخاتەڕوو.

بۆمان ڕوونبووەوە، کە دروستەی ڕستەی پرسیارو دروستەی قوولی ڕستەی کوردیی وەکیەکن و یەکدەگرنەوە. بۆ کرداری بکەرنادیاریش، کە لێرەدا مەبەستی سەرەکییمە، وای بۆدەچم، کە وەك کردارەکانی دییکەی زمانەکەمان هەندێك نییشانەی وەچەدیارییکراوی[٧٩٧] هەیەو کە لەتوانایدایە شوێنە بابەتییەکان[٧٩٨] ببەخشێت و کە وەك کرداری کات و کەسدار حوکمی ڕێزمانیی دەکات.

کاتێك کردارێکی بکەرنادیاری سەربەخۆ بەم نییشانەو مۆرکانەوە چاوەڕێیدەکرێت، کە لە فەرهەنگدا لەڕێی پرۆسەی مۆرفۆلۆژیی بەهێز یان لاوازەوە بووبێت بە لێکسیمی[٧٩٩] سەربەخۆی ناو فەرهەنگ. تێزەکەی من لەوە پێکهاتووە، کە فرێزی ناویی وەك سەرەنجامێکی پرۆسەی بوونەلێکسیمی کرداری بکەرنادیار لە [ NP,S ] ڕۆڵێکی بابەتانەی هەیەو کە لە [ NP,V ] بەدروستەیی حوکمی دۆخی ڕێزمانیی دەکات.

---

[٧٩٥] Passiv

[٧٩٦] lexikalische Eintragung

[٧٩٧] Subkategorisierungseigenschaften

[٧٩٨] θ–Positionen

[٧٩٩] stark oder schwacher morphologische Lexikalisierungsprozesse

## ٦/١-١) کرداره کات و کەسدارەکان

لەگەڵ ئەوەیشدا، کە ئارگومێنتە بابەتییە دەرەکییەکە[٨٠٠] لە ڕکێفی نیشانە تایبەتییە وەچەدیارییکراوەکانی کرداردایە[٨٠١]، بەلام خۆی لە مەودای ڕکێفی ڕستەدا دەدۆزێتەوە. ئەمەیش ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی، کە بەشی کردار داوایەکات نەك کردارەکە بەتەنها.
وەك ئەمەیش، ئارگومێنتە دەرەکییەکە تەنها ئارگومێنتێکی دەرەکیی نەبەستراوەیە، کە دەتوانێت لەگەڵ هەر کەرەستەیەکدا (کەرەستەی سفر یان فرێزی ناویی فەرهەنگیی بەرجەستە) پەیوەستدار و بەستراوەبێت[٨٠٢]. بەپێی ئەم لێکدانەوەیە ڕۆڵە بابەتییە دەرەکییەکە[٨٠٣] ئازادە.
بەلام لەبەرئەوەی بەشی کردار داوای ئارگومێنتە دەرەکییەکە دەکات و چونکە هەر لەم شوێنەدا دەتوانێت دۆخی ڕێزمانیی بکەریی وەربگرێت (چونکە بەهۆی پێدانی دۆخی ڕێزمانیی دروستەییەوە سەرەو ڕیزبوونی وەچەپێکهاتەکان لەسەر ئاستی ڕووکەش سەقامگیرو چەسپاون)، ئارگومێنتە دەرەکییەکە لە ڕستەدا شوێنێکی چەسپاوی هەیەو لەڕێیەوە دەتوانێت لەناو گشت ڕستەکەدا بەپێی مەرج بجوولێنرێت.
تۆمارکردنی ئێنکلیتیك لە فەرهەنگدا هیچ زانیارییەکی دەربارەی ئەوە تێدا نییە، کە ئارگومێنتەدەرەکییەکە هیچ ڕۆڵێکی بابەتانەی هەڵگرتووە یان کە لە هاونیشانەکردندا بەشدارییەك دەکات. ئەو تەنها کاتێك ئەم ئەرکە جێبەجێدەکات، کە لە ڕستەدا بە کردارێکەوە بەسترابێتەوە. کردارە کاتییەکان خۆیان هیچ ڕۆڵێکی بابەتانەیان تێدا نییە. بۆیە ڕێ بە شوێنی فرێزە ناوییە بابەتییەکان[٨٠٤] دەدەن. دارشتەی دروستەیی کردارەکاتییەکان دەتوانرێت وەك لە (١) دا بخرێتەڕوو:

١- دارشتەی دروستەیی خراوەڕووی کردارەکاتییەکانی لە فەرهەنگدا تۆمارکراون

---

[٨٠٠] externe- ϑ -Argument

[٨٠١] Domäne der Subkategorisierungseigenschaften des Verbs

[٨٠٢] assoziiert sein

[٨٠٣] externe ϑ -Rolle

[٨٠٤] NP-ϑ -Position




**بزانه که:**

**ϑ -d   ڕۆڵی بابەتانەی بەرکارە**
**ϑ -S   ڕۆڵی بابەتانەی نوێنەریی و بریکارێتییە**
**X   ئێنکلیتیکە (AGR)**

**بەپێی (١) ئارگومێنتەکان لە مەوداو ڕکێفی ئەو نیشانەتایبەتییە وەچەدیارییکراوانەی کردارە کاتییەکاندان، کە خۆیان هیچ ڕۆڵێکی بابەتییان هەڵنەگرتووە.**

## قەدی کردار:

**زمانی کوردیی قەدی فۆڕمە ڕابوردووەکان لە هی فۆڕمە ڕانەبوردوو و داهاتووەکان جیادەکاتەوە. بۆ دیارییکردنی قەدی کردار تاوەکو ئەمڕۆ فۆڕمەناوییەکەی کردارم وەرگرتووە؛ ئەم ڕێبازە لەم بارەیشدا جێبەجێدەکەم. سەرەنجامی ئەمە ئەوەیە، کە لە ئێستاو بەدواوە کرداری ڕابوردووی گێڕانەوە یاساناسا بۆ ڕوونکردنەوەی پرۆسەمۆرفۆلۆژییەکان وەك قەدی بنجیی کردار بەکاردەهێنم:**

**<مردن>، <مرد ϕ>، <دەمرێت>؛ <کوشتن>، <کوشت ϕ>، <دەگوژێت>؛ <هاتن>، <هات ϕ >، <دێت>.**

ئەم کردارانە کەرەستەی کات و کەس TENSE /ت/ و /د/ یان تێدایە. کەواتە قەدی ئەم کردارانە /مر/ و /کوش/ و /ا/ ن. ئێنکلیتیکی کەسی سێ هەمی تاکی کردارە تێنەپەرە رەسەنەکان دارشتەو هێنانەبیستنی فۆنەیتیکیی نییە:

<هات ф> (قەدی کردار، کات، ئێنکلیتیك).

لە <مردن> دا پاشگری کردن بەناو /ن/ و لە (٢) دا ئێنکلیتیکی کەسی سێ هەمی کۆ /ن/ دانراون.

٢- pro مردن.

کردارە کات و کەسدارەکان و کرداری بکەرنادیار هەمان دروستەیان دەخرێتەپاڵ:

رەگی کردار + کات + ئێنکلیتیکۆن <کوژرا ф>

کات + رەگی کردار + ئێنکلیتیکۆن <دەکوژرێت>

گۆڕینی پاشگری بکەرنادیار لە <کوژرا> و <دەکوژرێت> دا نیشانیدەدات، کە پاشگری /-را/ کەرەستەی کاتی فۆرمەکانی رابوردووی تێدایە. ئەم راستییە بەئاسانیی لە رستەمەرجییەکاندا تێبینییدەکرێت و پێیدەزانرێت.

٣- ئەگەر pro دەکوژرا، ...

٣- ئەگەر pro دەکوژرێت، ...

## ٦/١-٢) کرداری بکەرنادیار

مەرجەبنەماییەکانی رۆڵە بابەتییەکان[٨٠٥] دەرییدەبڕن، کە پێدان و بەخشینی رۆڵەبابەتییەکان رەوان و ئاشکرایە[٨٠٦]. هەر شوێنێك یەك رۆڵ وەردەگرێت و بە هەر شوێنێکیش یەك رۆڵ دەدرێت. ئەو کردارەی خۆی یەك رۆڵی هەڵگرتووە، لە توانایدا نییە ئەو رۆڵە ببەخشێت. بەڵام ئەگەر هێشتا هەر بانگەشەی ئەو گریمانەیە بکەم، کە ئەو مۆرفێمی بکەرنادیارە لکاوەی دەکرێت جیابکرێتەوە، لە زمانێکی دیکەدا دەتوانێت هەڵگری رۆڵێکی بابەتییانەبێت[٨٠٧]، ئەوا منیش دەتوانم بۆ زمانی کوردیی بانگەشەی هەمان گریمانە بکەم؛

---

[٨٠٥] 9 -Kriterium

[٨٠٦] eindeutig

[٨٠٧] بروانە: Borer (1984)

چونکە پاشگری بکەرنادیاری زمانەکەمان بەشێکی کرداری بکەرنادیارەکەیە، کە بووە بە لێکسێمێکی سەربەخۆی ناو فەرهەنگەکەمان. کە پاشگری بکەرنادیار بۆ کردارەکە دەگەڕێتەوەو هی ئەوە، لەو ڕێیەوە بنەمای سەلماندنەکەی دادەڕێژرێت، کە ناتوانرێت لێجیابکرێتەوەو کە by phrase ی زمانی کوردیی "فرێزی لەلایەن" بەهۆی کرداری بە لێکسێمبووی بکەرنادیارەوە چیدیی ڕێی تەواوی پێنادرێت و سینکرۆن لەسنوورێکی گەلێك تەسکدا بەکاردەهێنرێت. ئەم بەڵگەهێنانەوانە بۆیە تا ڕادەیەکی زۆر باوەڕپێکەرن، چونکە زمانی کوردیی زمانێکی لکاوەو مۆرفیمەکانی بە ئاسانیی لەیەك جیادەکرێنەوە.

## ٦/١-٣) هیپۆتیزەی ڕوونیی[٨٠٨]

دووبارە ناسینەوەی ئارگومێنتە نەدرکاوو دەرنەبڕاوەکان، کە گەلێك جار پاساوی هەلمژینی ڕۆڵی بابەتیانەی[٨٠٩] پێدراوەتەوە[٨١٠]، لەم پەیوەندییەدا وەك مەرجی بنەمایی ڕوونیی لێتێگەیشتووم و لێکیدەدەمەوە. داتا زمانییەکانی زمانەکەمان دەریدەخەن، کە گریمانەی هەلمژینی بابەتییانە بەرەو پەسنکردنی نێوانـدژو پەسنکردنێکی کەموکورتی هەندێك لە وەچەڕژێمەکانی[٨١١] ڕێزمانی کوردییمان دەبات.

من وای بۆ دەچم و وای دادەنێم، کە ڕۆڵە بابەتییەکانی ئارگومێنتە نەدرکاوەکان لە مۆرفیمی بکەرنادیاردا دانەڕێژراون و نیین، بەڵکو بە گشت کرداره ئاڵۆزەکەوە بەندن. مەرج نییە بەستنەوەکەیش ئەوە ببەخشێت، کە ڕۆڵەبابەتییەکە بە نادیاریی لە مۆرفیمی بکەرنادیارەکەدا داڕێژرابێت. چونکە مۆرفیمە بکەرنادیارەکە نە فرێزێکی ناوییە، کە ناوەرۆکێکی هەبێت، و نە کەرەستەیەکە، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە بجوڵێنرێت. مۆرفیمی بکەرنادیاریی، کە هیچ نیشانەیەکی تایبەتیی "کەس و ژمارەو دیار/نادیاریی" هەڵنەگرتووە، لە ڕاستییدا کەرەستەیەکی نادیارەو دەبێت لە ئاستی LF دا بۆ ڕۆڵێکی بابەتییانە ڕوون و پەیپێبراوبێت[٨١٢].

کەرەستەکانی لە فۆرمی X ن، لە پێکهاتەی LF دا بۆ ڕۆڵەبابەتییەکان نادیارو نەبیینراون. یان ئەوەتا نیشانەی "کەس و ژمارەو توخم و دۆخی ڕێزمانیی" یان هەیە.

---

[٨٠٨] Sichtbarkeitshypothese

[٨٠٩] θ -Absorbierung

[٨١٠] Borer (1984), Jaeggli (1986)

[٨١١] Modul

[٨١٢] دەربارەی ئەم بابەت و کێشەیە بڕوانە: Chomsky (1981)

ئەو تێزەی دەڵێت، کە ڕۆڵە ناوبراوەکان لە مۆرفێمی بکەرنادیاری کوردییدا داڕێژراون و بانگەشەی ئەو گریمانەیە دەکات، کە کەرەستە نادیارەکان نیشانەی تایبەتیی نادیاری تریان هەڵگرتووەو هێشتا هەر کارتێکردنیان لەسەر سینتاکس هەیە، کەم باوەڕپێدەکرێت و جێیباوەڕنییە.

کرداره بکەرنادیارەکە وەك بەرهەمی پرۆسەیەکی مۆرفۆلۆژیی و نەدرکاندنی ئارگومێنتە دەرەکییەکە وەك سەرەنجامێکی هەمان پرۆسە ڕێدەدات، لەلایەکەوە نیشانەتایبەتییەکانی ئەم چەشنەی کردار بەتایبەتیی زەق و لەڕوو بن و لەلایەکی تریشەوە نیشانیدەدات، کە ناسینەوەی ئارگومێنتە نوقومبووەکان یاسابەندو یاساجڵەوگیرە. کەواتە ڕوون و لەبار بۆ بینین لەڕێی ئامادەبوونی ئارگومێنتە نوقومبووەکەوە نابێت، بەڵکو لەو ڕێیەوە دەبێت، کە یاسای بەبەرهەم هەن. هەر کە یاساکان سنووریان تەسککراوەتەوە یان بەتەواویی لەناوچوون، کرداره بکەرنادیارەکە سەربەخۆ لە فەرهەنگدا تۆمارکراوە؛ بە شێوەیەکیش تۆمارکراوە، کە چییدی ڕۆڵی بابەتییانەی بکەریی کرداره بێ کەسە بنجییەکەی پێشووی وەچەدیارییکراو نەبێت[٨١٣] (ڕۆڵە بابەتییانە بکەرییەکەی کرداره کۆنەکەی نامێنێت).

ئارگومێنتە نەدرکاوەکەو لەگەڵییدا ڕۆڵەبابەتییانەکەی تا ئەو دەمە ڕوونە، کە یاسای بکەرەنادیارەکە جێبەجێدەکرێت و فرێزی لەلایەنەوە ڕێپێدەدرێت. لەبەرئەوەی لە زمانی کوردییدا کرداری بکەرنادیار بووە بە لێکسێمی سەربەخۆو ڕێ بە فرێزی "لەلایەن" نادات، کرداری بکەرنادیار وەك کردارێکی بابەتییانە[٨١٤] ڕۆڵە بابەتییانە بکەرییەکەی وەچەدیارییکراوە. ئەم پرۆسەیە کاتێك ڕوویداوە، کە فرێزی "لەلایەن" بەپێی کات لە سینتاکسی کوردییدا بەرەو لەناوچوون ڕۆیشتووە یان نەماوەو ڕۆڵ و نرخە سینتاکسییەکەی ئارگومێنتە نوقمبووەکەی لەناوچووە.

## ٤-١/٦) پرۆسەی بە لێکسێمبوون

لەڕێی پرۆسەی بە بکەرنادیاربوونەوە هێزی تێپەڕیی کرداره تێپەڕە ڕاستەقینە/ڕەسەنەکان و ناڕاستەقینەکان لاوازدەبێت (لەهێزیان کەمدەبێتەوە). لەم پرۆسەیەدا هەمیشە ئەو ئارگومێنتەی کردارەتێپەڕەکە نوقمدەبێت و تێدەچێت، کە ڕۆڵی بابەتیانەی ئاجێنسی[٨١٥] تێدایە. بۆ ئەمەیش <کوژرا> و <پێشکەشکرا> باش ترین نموونەن.

[٨١٣] für die Agens-θ- Rolle des ursprünglichen Verbs nicht mehr subkategorisiert.

[٨١٤] Themen-Verb

[٨١٥] Agens-θ -Rolle

لەسەرەنجامی بەلێکسیێمبوونی کردارەبکەرنادیارەکاندایە، کردارەبکەرنادیارەکان حاڵەتێکی وەها تایبەتییان وەرگرتووە، کە لەرێی گەشەکردنی مێژوویی زمانەکەمانـەوەو بـەیارییدەی پەیوەندیی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆی لەگەڵ زمـانی فارسیی و عـارەبییدا هاتووەتەکایـەوەو چەسپاوە. سینکرۆن دەتوانرێت ئەم نیشانەتایبەتییەی وەچەدیارییکردنی کردارەئاڵۆزەکەی (١) وەك ئاکاری کردارەبکەرنادیارەکان سەیربکرێت.

بەڵام ئەو مەرج و هۆیانەی لە بەلێکسیێمبوونی کردارە ئاڵۆزەکەی (١) دا بەشدارییانکردووە، دروستەیین و لە جۆری سیێمانتیکیی و مۆرفۆلۆژیی و سینتاکسیی بوون:

(ا) هۆومـەرجی یەککـەم سـەر بـە دروسـتـەی کـرداری بکـەرنادیارە؛ ئـەو دروسـتـەیەی، کـە مۆرفێمـی بکـەرنادیاریی پێوەبەسـتراوەو لێیجیاناکرێتــەوە. جیانەکردنــەوەی پاشــگری بکەرنادیار و ئامادەنەبوونی کردارێکـی یـارییدەدەر[816] بۆیـە پشتگیریی ڕوودانـی پرۆسـەکە دەکـەن، چونکـە ئـەم کەرەسـتانە لەسـەرەتاوە یـەك دروسـتـەی کردارێکـی یـەککگرتوویان بەرهەمهێناوە. دروستەی کرداری بکەرنادیار بە کردارێکی یاریدەدەرەوە <هاتە ~ هاتنە> وەك لە کرمانجی سەرووداهەیە، هێشتا لە کرمانجی خوارووداهەر پاشماوەیەکی کـەمی مـاوە (بڕوانـە: دەسـتم هاتـەخوران. چاکـە هاتـە کـولان)؛ پـەیدابوون و گەشـەکردنی کردارێکـی بکەرنادیاری یەکدروستەیی و یـەککگرتووی مۆرفۆلۆژیـی لـەو دروستەسینتاکسـییە ئـاڵۆزەوە، مـەرجی سـەرەکیی و بنـەمایی بوون، بۆ جێبـەجێبوونی پرۆسـەکەو لەهـەمان کاتیشـدا بەڵگـەی بابەتانەن بۆ ڕاستیی شییکردنەوەکانم[817].

(ب) لێکدانـەوەی "فرێـزی لەلایـەن"، کـە ئاجێنسـیی[818] لێکدەدرێتـەوەو دیـارییکردنی ئـەم فرێزەپێشـناوییەی بەتەنـها بـۆ ڕسـتەی بکـەرنادیار تـەرخانکراوە، وەك هۆکـاری سـەرەکیی دادەنرێن.

(پ) پاشـان تێداچوونـی "فرێــزی لەلایــەن" بــەهۆی نــەگونجاویی[819] پراگمــاتیکیی و سیێمانتیکیی و سینتاکسیی ڕێیان بۆ بەلێکسیێمبوونەکە ئازادو خۆشکردووە.

(ت) واتـاگۆڕیینی[820] کـرداری بکـەرنادیارە هەڵگوێزراوەکـەیش لـەرێی کەمبوونـەوەی هـێزی نیشـانەتایبەتییەکانی وەچەدیارییکردنەکەوەی جێبـەجێکراوە. واتاگۆڕیینەکـە کارئاسـانییەك بووە بۆ بەلێکسیێمبوونەکە. ئەمەیش کاریکردووەتە سەر گۆڕیینی واتای فرێزی "لەلایەن"، کە ئەمڕۆ زۆر تـر واتـای "پییلان" دەبەخشێت؛ کە سینکرۆن فرێزی "بەدەسـتی" تـەواو ورد تـر

---

[816] Auxialverb

[817] وەرگێڕ

[818] agentivisch

[819] Unverträglichkeit

[820] Bedeutungswandel

واتـاو مەبەسـتەکە بەدەسـتەوەدەدات و زۆر تریـش بـەکاردەهێنرێت، ئـەو لێکدانەوەیـەم دەسەلمێنن.
(ج) لەکۆتاییدا ئاماژە بۆ پرۆسەفۆنۆلۆژییەکان دەکەم، کە دارشتەی دروستەیەکی نوێیان بە کردارەبکەرنادیارەکە داوە.

## ٦/١–٥) تێپەڕیی و تێنەپەڕیی: دوو پرۆسەی مۆرفۆلۆژیی[٨٢١]

لەو پرۆسە مۆرفۆلۆژییانەی، پەیوەندییان بە هەردوك پرۆسـەی "بـە بکـەرنادیارییبوون" و "بەلێکسێمبوون" ەوە هەیە، دوو پرۆسەی گرنگ ناودەهێنم، کە گۆڕییـنی چەشنی کرداەکـە بەرپادەکەن و یەکتریی تەواودەکەن.
یەککـەمیان پرۆسـەی "بەتێپـەڕکردنی کـرداره" تێنەپەڕەڕاسـتەقینەکانەو بـەیارییدەی پاشگری /اند/ جێبەجێدەکرێت و لە فۆڕمـەکانی ڕانەبوردوو و داهاتوودا لە شێوەی دارشتەی فۆنەیتیکیی [ێن ] دا بە کردارەکەوە دەلکێنرێت.
نموونەیەك، کە پرۆسەکە دەسەلمێنێت: <خەوت> بەرامبەر <خەواند> و <دەخەوێنێت>.

٥- (ا) منداڵەکە خەوت.
(ب) نەسرینی منداڵەکەی خەواند.

ئـەمجا لـە کـرداره تێپـەڕە ڕاسـتەقینەو ناڕاسـتەقینەکان کـرداری بکـەرنادیار بـەیارییدەی مۆرفێمـی بکـەرنادیار /را ~ رێ/ هـەڵدەگوێزرێت؛ ئـەم پرۆسـەیە، بەپێچەوانـەی پرۆسـەکانی پێشووەوە، ناوی "بەتێپەڕنەکردنی کرداره" تێپەڕەکانی لێنراوە.

٦- (ا) دزەکە گیرا.
(ب) دزەکە دەگیرێت ~ دەگیردرێت.

(پاش فرێدانـی دەنگـە لاییـە دەنگدارەکـەی[٨٢٢] /ر/ ی پاشـگری بکەرنادیارەکـە "گیـرا" > "گیـرا") یـان (خستنەسـەری کۆنسـۆنانتێکی هـەڵتۆقییوی[٨٢٣] [ د ] "دەگـیرێت" > "دەگیردرێت").

[٨٢١] Transitivierung und Intransitivierung als zwei morphologische Prozesse

[٨٢٢] stimmhafter Laterallaut

[٨٢٣] epenthetischer Konsonant

٧- (ا) منداڵەکە  خەوێنرا ~ خەوێندرا.
(ب) منداڵەکە  دەخەوێنرێت ~ دەخەوێندرێت.

بەم شێوەیە کردارەبکەرنادیارەکە خاوەنی بکەرێکی بابەتییانەیە[٨٢٤]. لە ئەنجامی ئەمەدایە کرداری نادیارو کرداری تێپەڕ دروستەی سینتاکسیی لەیەکچوو یان وەکیەکیان هەیە.
ڕستەکانی (٦) نموونەن بۆ بەتێنەپەڕکردنی کرداره تێپەڕە ڕاستەقینەکان؛ کەواتە "بەبکەرنادیاریکردنی ١". نموونەکانی (٧) "بەتێپەڕنەکردنی کردارە" تێپەڕە ناڕاستەقینەکان دەخەنەڕوو، کەواتە "بەبکەرنادیاریکردنی ٢". هەر دوو پڕۆسەکە فۆڕمە بەلێکسێمبووەکان نیشاندەدەن، کە لەڕێی پڕۆسەی مۆرفۆلۆژیی زۆرترەوە فۆڕمی تەواویان وەرگرتووە: <دڕاو>، <بەشخوراو> ...
لەمەوە ئەوە هەڵدەهێنجم، کە ئەم پڕۆسە مۆرفۆلۆژییانە گۆڕینی سێمانتیکیی و گۆڕینی ڕەگەزیی بەرپادەکەن. لەڕێیانەوە نیشانەتایبەتییەکان زۆرتر/فراوان تر دەکەن یان کەم تر/تەسك تر دەکەنەوە یان هاوسەنگیان دەکەن. کەوابێت، "بە بکەرنادیاریکردن" بەتەنها "بەتێنەپەڕکردنی" کرداره تێپەڕە ڕاستەقینەو ناڕاستەقینەکان نابەخشێت، بەڵکو کەمکردنەوەو زۆرتر کردنی نیشانەکانیش دەگرێتەوە. کرداره تێنەپەڕە ڕاستەقینەکان بۆنموونە کرداری بابەتییانەن[٨٢٥] و ڕێ بە بکەری بابەتییانە[٨٢٦] دەدەن[٨٢٧]. کرداره بکەرنادیاره هەڵگوێزراوەکە، وەك کرداره تێنەپەڕە ڕاستەقینەکە داوای بکەرێکی بابەتییانە دەکات. لەئەنجامی ئەمەدایە ئەو دوو چەشنەی کردار دروستەی وەکیەك و لەیەکچوویان هەیە (بڕوانە (٨) و (٩).

٨- پیاوەکە  مرد.
٩- بەردەکە  خلبووەوە.

نموونەیەکی دیکە "ڕێکخراوە سینتاکسییە چوونیەکەکە"[٨٢٨] ی ڕستەی بکەرنادیارو ڕستەکانی پەیپێبردنن[٨٢٩]. بکەرنادیار لە زمانی کوردییدا بەتەنها بە بەرکاری کردارەوە

[٨٢٤] Themen-Subjekt
[٨٢٥] Themen-Verben
[٨٢٦] Themen-Subjekt
[٨٢٧] Wunderlich (1985)
[٨٢٨] homogene syntaktische Organisation
[٨٢٩] Erkenntnissätze

نەبەستراوەو تەنها ئەوی نییە. کرداره بکەرنادیارەکە داوای پەیوەندییەکی بابەتییانەی[830] نێوان بەشی کرداری بکەرنادیارو بکەری ڕستەیش دەکات. بۆیە ڕێ بە ڕوودان و دەرکەوتنی کەرەستەی ئارگومێنت و نائارگومێنتی ئامارژەدەر[831] و ئامارژەنەدەر[832] دەدات. لەمەوەیە لێکدانەوەی ڕستەی بکەرنادیار لەڕێی دروستەی قووڵ و دروستەی ڕووکەشی ڕستەوە دیاریی و دەستنیشاندەکرێت.

۱۰- دڵشاد باوەرپێپێدەکرێت.
۱۱- (ا) pro دەگوترێت، ...
(ب) چیی دەگوترێت، ...

۱۲- (ا) .Expl باوەڕدەکرێت، ...
(ب) *چیی باوەڕدەکرێت، ...

شوێنی بکەر لە (۱۲ (ا)) دا شوێنێکی بابەتییانە[833] نییە. بەڵام شوێنی بکەری ڕستەکانی (۱۰) و (۱۱) شوێنی بابەتیانەیە. وەك کرداری بکەرنادیار لە (۱۰) و (۱۱) دا، کردارەکانی پەیپێبردنیش (کردارەکانی وادەرکەوتن) شوێنی بابەتییانە دەبەخشن. چونکە لەڕووی ڕێزمانییەوەو بەڕێزمانیی بۆ هەمان نیشانەتایبەتییەکان دیارییکراون و هەمان نیشانەیان هەیە. بۆیە هیچ ناتەباییەك لە ڕێزمانی کوردییدا پەیدا نابێت، ئەگەر کرداری پەیپێبردن و کرداری بکەرنادیار لەزۆر ڕووەوە دروستەی سینتاکسیی ڕستەی لەیەکچوویان هەبێت.
بۆ ئەم مەبەستەیش بڕوانە کردارەکانی <وادیارە>، <وادەردەکەوێت>، <پێدەچێت>، کە نیشانەتایبەتییەکانی کەسی سێ هەمی تاك و نادیاریان[834] هەیە.
سەرەنجامی سینتاکسیی بەبکەرنادیارییکردن و بەلێکسیمبوونی خۆیان لە پێدان و بەخشینی دۆخی ڕێزمانییدا دەردەخەن و سەرنج بەرەولای خۆیان ڕادەکێشن، چونکە بەبکەرنادیارییکردن لە زۆر حاڵەتدا ڕێ تەنها بە پێدانی دۆخی ڕێزمانیی لێکدراو[835] دەدات.

۱۳- نەوزاد، ڕییشی تاشرا.

---

[830] thematische Relation

[831] referentiell

[832] nicht-referentiell

[833] ϑ -Position

[834] 3.P.Sg., -definit

[835] kompositionelle Kasuszuweisung

١٤- pro، دەستی بڕرا ~ بڕدرا.

پاش ئەوەی لە هۆو بەرهەمی بەلێکسێمبوونی بکەرنادیار کۆڵیمەوە، دەتوانم ئێستا جیاکردنەوەو هەڵبژاردنی ڕۆڵەبابەتییانەکانیان[٨٣٦] بەڕوونیی بخەمەڕوو. من خۆم بە هۆکێستراوە[٨٣٧] ەوە دەبەستمەوەو وەهای دادەدنێم، کە جیاکردنەوەو هەڵبژاردنی ڕۆڵەبابەتییەکان و گۆکردنە ڕێزمانییەکان لە فەرهەنگدا دیارییکراون.

چونکە ڕۆڵە بابەتیانەکانی کردارەکان لە فەرهەنگدا دیارییکراون و چونکە کرداری بکەرنادیار وەك کردارێکی بابەتییانە دەناسرێتەوەو دەستنییشاندەکرێت، کرداری بکەرنادیار لە فەرهەنگدا بۆ ڕۆڵێکی بابەتییانە وەچەدیارییکردنی هەیە. بۆیە گۆڕیینی حوکمکردنی ڕێزمانیی[٨٣٨] لە بەرکاری ڕستەوە بۆ بکەری ڕستە بە واتاو ناوەڕۆکی کواستنەوەی بکەرنادیارەوە[٨٣٩] پێویستناکات. ئەمەیش بۆیە وەهایە، چونکە بانگەشەی ئەو گریمانەیە دەکرێت، کە ئاجێنسی تێپەڕ[٨٤٠] وەك بکەری تێپەڕ[٨٤١] لە وەچەپێکهاتەیەکی تێپەڕدا ڕوودەدات و دەردەکەوێت و کە پاسێنتی تێپەڕ[٨٤٢] وەك بکەری تێنەپەڕ[٨٤٣] لە ڕستەی بکەرنادیاردا ڕوودەدات و دەردەکەوێت.

ئەو کردارەبکەرنادیارەی لە فەرهەنگی کوردییدا بۆ ڕۆڵێکی بابەتییانە وەچەدیارییکردنی هەیە، لە دروستەی قووڵدا خاوەنی شوێنێکی بابەتییانەی بکەرە، کە دەبێت لە دروستەی قووڵ یان ڕووکەشدا بە بکەرێکی بابەتییانە پڕبکرێتەوە. بکەری ڕستەیەکی بکەرنادیار، (١٠) و (١١)، ڕۆڵێکی بابەتییانەی هەیە، کە پاساوی ڕۆڵی بابەتییانەی بکەری ڕستەکانی (٨) و (٩) دەداتەوە.

ئەگەر ئەو ڕۆڵە بابەتییانەیە چەسپاوو نەگۆڕبێت یان نا، لەبەر کەمیی شوێن ناتوانرێت لێرەدا لێیبدوێم و بەدوای وەڵامەکەیدا بگەڕێم. بەڵام گرنگ ئەوەیە، کە ئەم بکەرە دەتوانێت بەبێ گوێدان بە ڕۆڵی بابەتییانە، دۆخی ڕێزمانیی وەربگرێت، ئەگەر بە کەرەستەی هاونیشانەی زەنگین و بەهێزەوە بەستراببێتەوەو لەلایەن INFL ەوە حوکمی دۆخی

---

[٨٣٦] Selektion ihrer thematischen Rolle

[٨٣٧] Hokestra (1984)

[٨٣٨] der Wechsel der grammatikalischen Rektion

[٨٣٩] Passivtransformation

[٨٤٠] der transitive Agent

[٨٤١] das transitive Subjekt

[٨٤٢] der transitive Patient

[٨٤٣] das intransitive Subjekt

ڕێزمانیی کرابێت. پەیوەست بە ئارگومێنتی ناوەکییەوە ئەو ڕوونکردنەوانە ڕێدەدەن هەندێك بۆچوونی پێشبینییەکانە[844] دەربارەی دروستەی سینتاکسیی ڕستەی بکەرنادیار بکرێن. بەڵگەیەکی کەرەستەیی ئەزموونبەند[845] بۆ ئەوەی، کە بە بکەرنادیارییکردن، واتای کەمکردنەوەی هێزی تێپەڕیی کردارە تێپەڕەکان دەبەخشێت و کە کرداری بکەرنادیار بەم چەشن و ناوەرۆکەوە لە فەرهەنگدا بۆ هەندێك نیشانەی تایبەتیی وەچەدیارییکراوە، دیاردەیەکی تایبەتیی زمانەکەمانەو لە کردارە لێکدراوەکانماندا بەدییدەکرێت.

زۆربەی زۆری کردارەکانی گەنجی وشەی کوردیی لێکدراون؛ لە بەشێکی ناویی و بەشێکی کرداریی دروستبوون. بۆئەوەی ڕێسای پڕۆژەسازدان بریندار نەبێت، بەشەناوییەکەی کردارە لێکدراوەکە لە ڕستەدا وەك ئارگومێنتی ناوەکیی کردارەکە دادەنرێت. بەڵام ئەو بەشە ناوییەی کردار لە کردارەبکەرنادیارەکاندا وەك ئارگومێنتی دەرەکیی دەهێنرێتەدییتن و بەرجەستەدەکرێت. ئەمەیش ئەوە دەبەخشێت، کە بەخشیینی دۆخی ڕێزمانیی، وەك پێدانی ڕۆڵی بابەتییانە، ئازادە. بەراوردکردنی چەند کردارێکی وەك <پێشکەشکردن> و <نانکردن> و <نانکردنەوە> ڕوونکردنەوەیەکی باشە بۆ ئەم مەبەستە.

١٥- (ا) نەسرین گوڵێکی پێشکەشکرا.
(ب) گوڵێك، پێشکەشی نەسرین کرا.
(پ) گوڵێك، پێشکەش بە نەسرین کرا.

## ٦-١/٦) ئەرگەتیڤیی و کرداری بکەرنادیار

تاوەکو هیچ تێکەڵکردنێك و سەرلێشێواندنێك ڕوونەدات، پێدەچێت گرنگ بێت، ئاماژەیەك بۆ ئەوە بکەم، کە کرداری بکەرنادیار لە زاری سلێمانییدا پەیوەندییەکی بە کردارە ئەرگەتیڤەکانەوە نییە. ئەگەر من لە پێناسەی کردارە ئەرگاتیڤەکانەوە دەستپێبکەم و دەربچم، ئەوا بۆم ئاشکرادەبێت، کە کرداری بکەرنادیاری زمانی کوردیی سەر بە چەشنی کردارە ئەرگەتیڤەکان نییە. چونکە بکەری کرداری بکەرنادیاری زمانی کوردیی هەمان مۆرفێمی دۆخی ڕێزمانیی بەرکاری کردارە تێپەڕەکانی نییە. بەرکارە ڕاستەوخۆکەی کردارە بکەرنادیارەکەیش ئەو مۆرفێمەی دۆخە ڕێزمانییە بکەرییەکەی وەرنەگرتووە، کە بکەری

---

[844] Prognose

[845] ein empirisches Beweismaterial

کردارەتێپەڕەکان وەرییدەگرن[846]. بەڵگەیەك بۆ ئەمە ئەوەیە، کە بکەرە ڕێزمانییەکەی کرداری بکەرنادیار هیچ ئینکلیتیکێك وەرناگرێت.

## ۱/۶-۷) سەرەنجامی سینتاکسیی

بکەری کرداری بکەرنادیار لەلایەن INFL ەوە حوکمی دۆخی ڕێزمانیی دەکرێت، ئەگەر بکەرەکە لەگەڵ بەشی کردارەکەیدا هاونیشانەو ڕێکەوتووبێت. بەهۆی دۆخی ڕێزمانیی دروستەییەوە ناتوانرێت بکەرەکە لەگەڵ ڕەگەزە ڕێزمانییەکانی دیکەدا شوێنەکەی بگۆڕێتەوە.
سەرەنجامی سینتاکسیی پرۆسەی بەلێکسیمبوون ئەنجامی کارلەیەکتریکردنی گەلێك فاکتەرو هۆکارن. بەڵام هۆکانی ئەم دیاردە سینتاکسییانە دەگەڕێنەوە بۆ پرۆسەی بە لێکسیمبوون: پەیوەست بە تێپەڕیی و تێنەپەڕیی کردارەوە، کرداری بکەرنادیار لە ڕێکخراوی سینتاکسیی ڕستەدا هیچ جیاوازییەکی گەورەو زەق نیشاننادات. بۆیە فرێزی ناویی لە:

[NP, V] دا وەك بەرکارو لە

[NP, S] دا وەك بکەر شیدەکرێتەوە.

ئەنجامی ئەمەیش ئەوەیە، کە ڕستەکان هەمان پرۆسە سینتاکسییەکان نیشاندەدەن: بکەری ڕستە دەشێت لە دروستەی ڕووکەشدا دانانی فەرهەنگیی نەبێت (دەربڕین و بەرجەستەبوونی فۆنەیتیکیی نەبێت). ئارگومێنتە ناوەکییەکە (بەرکاری ڕاستەوخۆ) دەتوانرێت بە ویست و ئارەزووی قسەکەر بکرێت بە کلیتیك (جێناوی لکاوی بەرکار).

## ۲/۶) ڕستەی بکەرنادیار

هەرچەندە ڕستەی بکەرنادیار فرێزی پێشناویی "لەلایەنەوە"ی تێدا نییە، ڕۆڵی بابەتییانەی ئاجێنسیی[847] هەیە[848]. بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا وای بۆدەچم، هەر وەك

---

[846] زۆر تر دەربارەی ئەم بابەتە لە Burzio (1981), Grewendorf (1986) دەبینرێتەوە.

[847] Agens- θ -Rolle

[848] Chomsky (1981)

ڕوونمکردەوە، کە مۆرفیمەکە ئەم ڕۆڵە بابەتییانەیەی هەڵمژییبێت. ئەم گریمانەیە دەڵێت، کە مۆرفیمی بکەرنادیار هەڵگری ئەم ڕۆڵە بابەتییانەیەیە.

وەکیەکیی و هاوئاهەنگیی دروستە سینتاکسییەکەی ڕستەی لەم چەشنانە و تایبەتمەندییەکانی کردارە بکەرنادیارە بەلێکسیمبووەکان، کە ئەم ڕۆڵە بابەتییانەیەیان پێوە بەستراوە، ڕێ بە بیرکردنەوە لە هیچ جۆرێك لە هەڵمژیینی ڕۆڵی بابەتییانەو جووڵاندن و گواستنەوەی فرێزی ناویی نادەن. کەواتە کردارە بکەرنادیارەکانی زاری سلێمانیی نە هەڵمژیینی ڕۆڵی بابەتییانەیان هەیەو نە گواستنەوەی فرێزی ناویی بەرپادەکەن.

١٦- باران دەبارێت.
١٧- میوە بەکاڵیی ناخورێت.
١٨- گوڵەکان گەشانەوە.
١٩- دەرگاکان داخران.

## ١-٢/٦) شوێنی بابەتییانەی فرێزی ناویی[٨٤٩]

ئەو ڕۆڵە بابەتییانانەی، مەرجەبنەماییەبابەتییەکان داوایاندەکەن[٨٥٠]، بەستراون بە نییشانەتایبەتییەتییەکانی وەچەدیارییکردنەوەوە[٨٥١]. شوێنی Y، کە لەلایەن X ەوە وەچەدیارییکراوە، لە X ەوە ڕۆڵێکی بابەتییانە وەردەگرێت. ئەو ڕەگەزەی، لێیەوە شوێنی بکەر ڕۆڵێکی بابەتییانەی پێدەدرێت، بەشی کرداری ڕستەکەیە[٨٥٢].

پراوپڕ بەپێی ئەم ڕێسا نەزەرییانە شوێنی بکەری ڕستەکانی (١٦-١٩) ڕۆڵەبابەتییەکانیان لە بەشەکانی کردار خۆیانەوە وەردەگرن. بەمە بانگەشەی ئەو گریمانەیە دەکرێت، کە هەر یەکێك لەم کردارانە کردارێکی بابەتییەو کە هەر بەشێکی کرداری ئەم ڕستانە ئەو پێویستییە نەزەرییانەی جێبەجێکردووە. پێویستییە نەزەرییە جێبەجێکراوەکان دەتوانرێن لەلایەن ئەم دیاردە زمانییە ئەزموونبەندییانەوە پشتگیرییان لێبکرێت:

(ا) لە زمانی کوردییدا، وەك زمانێکی بکەرخراو، دەشێت تەنها بکەری دروستەیی قووڵ لە دروستەی ڕووکەشدا بەفەرهەنگیی بەرجەستەنەکرێت و نەهێنرێتەدییتن.

---

[٨٤٩] Np- θ -Position

[٨٥٠] Chomsky (1981)

[٨٥١] Chomsky (1965)

[٨٥٢] Williams (1984)

٢٠- هۆڵەکە بەدڵتەنگییەوە چۆڵکرا.

من، ئەگەر ئێستا بانگەشەی ئەو گریمانەیە بکەم، کە pro و لەتەکییدا ڕۆڵەبابەتییەکەی بۆ شوێنی بکەر گوێزراونەتەوە، بە چەوتیی بانگەشەی ئەوگریمانەیەدەکەم، کە بکەری pro ی ڕووکەش لە ئاستی قووڵدا وەك فرێزێکی ناویی فەرهەنگیی بەرجەستە هەیەو ئامادەیە. ئەمەیش بەپێچەوانەی ڕوونکردنەوە ڕۆیشتووەکانی سینتاکسی زمانەبکەرخراوەکانەوەیە. چونکە بەمە دان بە هەبوونی بکەری pro ی دروستەیی قووڵدا نانرێت؛ بەگشتیی ڕوونکراوەتەوە، کە pro لە دروستەی قووڵدا هەیە.

(ب) ڕستەی (٢٠) بانگەشەی گریمانەیەکی تەواو[853] دەردەبڕێت. ئەمەیش ڕاستیی باگەشەی گریمانەکە دەسەلمێنێت، کە دەڵێت، فرێزەناوییەکان لە (١٧) و (١٩) دا خاوەنی شوێنی بابەتییانەی خۆیانن.

ئەم پەیوەندییە سینتاکسییانە لە زمانی ئێنگلیزیدا، بۆ نموونە، بەهۆی نیشانەتایبەتییەکانی کردارەوە بەتەواویی جیاوازن. بەم شێوەیە، ڕستەی (٢١) هیچ دەربڕینێك[854] دەرنابڕێت، چونکە هیچ شوێنی بکەرێکی نییە. بەپێچەوانەوە ڕستەی (٢٢) کەرەستەسەرەتاییەکەی PRO ی تێدایەو دەربڕینێکی تەواوە.

21-* The room was left sad

22- They expected PRO to left the room.

بۆ چۆمسکی[855] فرێزی ناویی لە [NP, S] دا هیچ ڕۆڵێکی بابەتییانە وەرناگرێت، چونکە ڕۆڵەبابەتییەکەی لەلایەن مۆرفێمی بکەرنادیارەوە هەڵمژراوە[856]. کە ڕێ بە هەڵمژینی ڕۆڵی بابەتیی دەدرێت، لەو ڕێیەوە بەبەڵگە دەسەلمێنرێت، کە:

(ا) ڕۆڵە بابەتییە دەرەکییەکە تەنها ڕۆڵێکی بابەتییانەیە، کە دەتوانێت لەگەڵ هەر کەرەستەیەکدا پەیوەستداربێت[857] و کە

(ب) ڕۆڵی بابەتییانە لە سینتاکسدا دەتوانرێت بەو پاشگرە بدرێت، کە لە مەودای ڕکێفی کرداردایە[858].

---

[853] vollständige Behauptung

[854] Aussage

[855] Chomsky (1981)

[856] Jaeggli (1986)

[857] assoziert sein

[858] Borer (1984)

یەککەمیان ڕێدەدات، شوێنی بکەری بەشی کرداری بکەرنادیار[٨٥٩] بەهەر ڕەگەزێك بێت، پڕبکرێتەوە. لەم ڕووەوەیە هیچ لادانێکی بنجیی و ڕێسایی لە ڕستەی بکەرنادیاری زمانی کوردییدا بەدیناکرێت. تایبەتمەندییەکانی کرداری بکەرنادیاری زمانەکەمان نیشانییدەدەن، کە پەیوەندییە سینتاکسییەکان ڕەچاوی ڕێسا گشتییەکانی دروستەی ڕستەی زمانەکە دەکەن و بەگوێرەی دەستوورەکانی لەکاردان. ئەو کردارەبکەرنادیارەی لە فەرهەنگدا بووە بە لێکسیمی سەربەخۆ، ڕێدەدات، بکەرە بابەتییەکە بە دروستەیی حوکمی دۆخی ڕێزمانیی بکرێت. لەم ڕێیەوە خۆی لە "ئاوەڵناوێکی کراوی بێلایەن و ساردکراوە"[٨٦٠] جیادەکاتەوەو خۆی لە پۆلی کردارەکاتدارەکاندا ڕیزدەکات و ڕێ بە شوێنی فرێزی ناویی بابەتییانە دەدات.

## ٦/٢-٢) پێشناوی بکەرنادیار "لەلایەن"

لەگەڵ ئەوەیشدا، کە فرێزەپێشناوییەکەی بکەرنادیار "لەلایەن" مەیلێکی زۆری هەیە تیابچێت، هێشتا لە باری زۆر سنووربۆدانراودا بە لێکدانەوەی بنجیی ئاگێنسییەوە[٨٦١] هەر بەکاردەهێنرێت.

٢٣- (ا) * نامەکە لەلایەن پڕشنگەوە نووسرا

(ب) نامەکە نووسرا.

(پ) ؟؟نامەکە بەدەستی پڕشنگ نووسرا.

بەم شێوەیە، ڕوودان و دەرکەوتنی فرێزی "لەلایەن" بۆ ئەم فۆرمەی کردارەکان تەرخانکراوە. فرێزەپێشناوییەکە کاتێك بەکاردەهێنرێت، بۆ ئەوەی ببێت بە پردێك بۆ تافە (کاتە) جیاوازەکە.

٢٤- نامەکە لەلایەن پڕشنگەوە نووسرابوو.

لەبەر ڕۆشنایی ئەم داتایانەدا فرێزی "لەلایەن" وەچەپێکاتەیەکی فراوانکراوەی کرداری بکەرنادیارە، کە پەڕینەوەی کاتە جیاوازەکە دەردەبڕێت.

---

[٨٥٩] Passivprädikat

[٨٦٠] das neutralisierte Passivpartizip

[٨٦١] ursprüngliche Agent-Interpretation

گشت ڕووونکردنەوەکانی تا ئێستام دەربارەی کرداری بکەرنادیار، فرێزێکی ناویی "فرێزی لەلایـەن" ەکـە نـاتوانێت لـە ڕکێفـی نیشـانەتایبەتییەکانی وەچـەدیارییکردنی کـرداری بکەرنادیاردا بێت. بانگەشەی ئـەوەیش کـرا، کـە ڕۆڵـی بابەتییانـەی ئاگێنسـیی لـە مۆرفێمـی بکـەرنادیاردا دانـەڕێژراوە. لەبەرئـەوەی پاشـگری بکـەرنادیار ئـەم ڕۆڵەبابەتییـەی لـەخۆیدا هەڵنەگرتووە، ڕۆڵکە دەتوانرێت بەسەر پاشگری بکەرنادیارداو بۆ پێشناوەکەو لەمیشەوە بۆ فرێزەناوییەکە بگوێزرێتەوە[٨٦٢].

پێشـناوی "لەلایـەن" بەتەنـها ئـەم پەیوەندییـە سـێمانتیکییە دەردەبڕێت[٨٦٣]. زیـادکردنی پێشناوی بکەرنادیارەکە لە هەندێك فۆڕمی تافەکاندا بـۆ ئەوەیـە، حوکمـی دۆخـی ڕێزمـانیی فرێزەناوییەکەی فرێزە پێشناوییەکە بکات و ئەم پەیوەندییە سێمانتیکییە دەربڕێت. لەمەوە ئـەوە هـەڵدەهێنجم، کـە ڕسـتەی بکـەرنادیار لـە زاری سـلێمانییدا ئـەم دروسـتەقووڵەی لای خوارەوەی هەیە.

٢٥- دارشتەی هێڵکاریی ئەندازیاریی دروستەی قووڵ




ئەنجامڕاسـتیی دارشـتن و ڕوونکردنـەوەکانی تائێسـتام لـەو ڕێـەوە داکۆکیـی لێدەکرێـت و پشتییدەگیرێت، کە:

[٨٦٢] بیشروانە: Jaeggli (1986)

[٨٦٣] بەراوردیی بکە لەگەڵ پەیوەندییە سێمانتیکییەکەی فرێزی پێشناویی {بەدەستی} دا (بڕوانە (٢٧، ٢٨)).

(ا) پێشــناوی بکــەرنادیاریی لــە زاری ســلێمانییدا بەتەنــها بــۆ ڕســتەی بکــەرنادیار تەرخانکراوەو کە

(ب) فریزەناوییەکەی فریزی "لەلایەن" دەتوانرێت تەنها وەك ئاجێنسی بنجیی و بنەڕەتیی لێکبدرێتەوە. بوون و ئامادەبوونی فریزی پێشناویی ئامێریی[٨٦٤] "بەدەستی"، لەتەك فریزی "لەلایەن" ەوە، بەڵگەیەکە بۆ ئەو ڕاستییە.

بەراوردێك لـەنێوان وەچەپێکهاتـەکانی بکـەرنادیاری ئینگلیزیی و بکـەرنادیاری کوردییـدا ئەوە دەسەلمێنێت، کە لە (ب) دا چەسپێنرا:

26- John was killed by Bill. (agent)

٢٧- * نەوزاد لەلایەن دوژمنەوە کوژرا

٢٨- نەوزاد بەدەستی دوژمن کوژرا.

29- The package was sent by John. (ursprung)

30- (بڕوانە (٢٢) ی زاری سلێمانیی)

31- The letter was received by Bill. (Ziel)

32- (زاری سلێمانیی)

33– That professor is feared by all students. (Erfahrung)

34- (زاری سلێمانیی)

ڕستەی لـەم چەشـنانەی لای خـوارەوە، تـەرخانکردنی پێشـناوی بکـەرنادیار "لەلایـەن" بـۆ ڕستەی بکەرنادیار، دەیسەلمێنن.

35- John is killing Mary by Bill. (Lokativ)

36- (زاری سلێمانیی)

37- John is travelling through Europe by train. (Instrumental)[865]

38- (زاری سلێمانیی)

---

[٨٦٤] Instrumental PP

[٨٦٥] نموونەکان لە (1986:599) Jaeggli ەوە وەرگیراون.

پێشناوی بکەرنادیار "لەلایەن" بەدەگمەن و تاڕادەیەکیش هەر بەکارنابرێت؛ پێشناوەکە لە ڕێیدا بەتەواویی لەبیرمان بچێتەوەو لەناوبچێت. ئەگەر بزانین، کە زمانی عارەبیی کلاسیکیی و فارسیی و لیتوانیی و ئوردوو و کوپیایی و گەلێك زمانی دیکەیش هەمان دیاردەی زمانیی نیشاندەدەن[٨٦٦]، ئەوا تێداچوونی فرێزی "لەلایەن" لە زمانی کوردییدا وەك دیاردەو پرۆسەیەکی سروشتیی و ئاسان دێتەبەرچاومان.

## ٣-٢/٦) دۆخی ڕێزمانیی

گواستنەوەی بەزۆرو خورتەکیی لەناو پێکهاتووی بکەرنادیاردا بەشێوەیەکی سەرەکیی دەگەڕێتەوە بۆ تیۆریی دۆخی ڕێزمانیی. بۆ چۆمسکی[٨٦٧] فرێزی ناویی لە [NP ، VP] دا دۆخی ڕێزمانیی وەرناگرێت. کە کرداری بکەرنادیار لەبارییدا نییەو ناتوانێت دۆخی ڕێزمانیی بدات، لەو ڕێیەوە هۆی بۆ هێنراوەتەوەو سەلمێنراوە، کە سەر بە ڕەگەزە بێلایەن و ساردبووەکان [+V] ە. بەپێی ئەو گریمانەیەی، کە ئاوەڵناوی کراو ناتوانێت دۆخی ڕێزمانیی بدات، دەبێت John لە (٣٩) دا بگوێزرێتەوە، ئەگینا[٨٦٨] مەرجی پاڵێوەری دۆخی ڕێزمانیی بریندار دەکرێت. وەك سەرەنجامێکی ڕێسای پرۆژەسازدان و مەرجەبنەماییەکانی ڕۆڵی بابەتییانە دەگوێزرێتەوە بۆ شوێنی بکەر، بۆئەوەی لەوێ حوکمی دۆخی ڕێزمانیی بکرێت؛ لە شوێنە بنجییەکەی خۆی، کە شوێنی ڕۆڵێکی بابەتییانەیە، شوێنپێیەك بەجێدەهێڵێت و لێوەی ڕۆڵەکە وەردەگرێت.

39- D-Structure e was killed John

40- S-Structure John was killed

ئەم ڕوونکردنەوەیە بێ کێشە نییە. چونکە بەپێی ڕوونکردنەوەکە فرێزی ناویی a book لە (٤١) دا، ناتوانێت دۆخی ڕێزمانیی پێبدرێت و وەریبگرێت.

41- John was given a book by Bill.

---

[٨٦٦] Siewierska (1984:35), Jaeggli (1986)

[٨٦٧] Chomsky (1981)

[٨٦٨] Rouvert and Vergnaud (1980:12)

بۆیــه زمانەوانــەكان وای بۆدەچــن، كــه ئــەم ئارگومێنتــه، تەنــها ئــارگومێنتێكی كــرداری بكەرناديارى زمانى ئینگلیزییە، كه دۆخی ڕێزمانیی زگماكیی[٨٦٩] هەیە.
بەلام ئەگەر كرداره بكەرنادیارەكه سەر بە ڕەگەزه بێلایەنه ساردبووەكه [ V+ ] نەبوو، هەر وەك چۆن لــه زمــانى كینیــارواندادا وەهایــه[٨٧٠]، ئــەوا یاســا سینتاكســییەكان و پرۆســەكان بەشێوەیەكى جیاواز گۆدەكەن و لەكاردادەبن.
لــه زمــانى كوردییــدا كــردارى بكــەرنادیار ڕێ بــه شــوێنێكى بابەتییانــەی بكــەر دەدات، كــه لەلایــەن INFL ەوەو حوكمــی دۆخــی ڕێزمــانیی دەكرێــت. دۆخەڕێزمانییــه دروســتەییەكه ڕێشــدەدات ئارگومێنتــه ناوەكییەكــه وەك بــەركار ئاشــكرابێت یــان ئاشــكرابكرێت. ئــەم بانگەشەی گریمانانه دەتوانرێن لەڕێی گەلێك مەرجی بنەماییەوە تاقیبكرێنەوە، كه هەندێك پرۆســەی دیــارییكراوی ڕســتەی بكــەردیار(ڕســتەی چــالاك)[٨٧١]و بكــەرنادیار و مــەرج و سنووربۆدانانەكانیان ڕووندەكەنەوە.

## ڕێكەوتن و هاونیيشانەیی بكەرو بەشى كردار:

ئەگــەر مــن وەك تۆمــان[٨٧٢] ماركــەی دۆخــی ڕێزمــانیی بــەركارى ڕاســتەوخۆ[٨٧٣]و ماركــەی بەركاریی ڕاستەوخۆ[٨٧٤]ی ئێنكلیتیكــەكان بەیەكــەوە ببەســتمەوە، ئــەوا بەركارەڕاســتەوخۆكە، نەك بكەرەكە، ڕێدەدات وەك بــەركار بناسرێتەوەو دەستنییشــانبكرێت. هاونییشــانەیی بكــەرو بەشى كردار لێرەدا تەنها وەك سەنگێكى محەك گۆدەكات.

٤٢- ئەوان گیران.
٤٣- نەسرین و پەروین گوڵیان پێشكەشكرا.

بكــەر لــه (٤٢) و (٤٣) دا لــەڕێی هاونییشــانەیی و ڕێكەوتنــەوە لەگــەڵ بەشــی كــرداری بكەرنادیاردا دۆخی ڕێزمانیی بكــەریی وەردەگرێــت؛ هــەر كــه ئەمــه جێبــەجێكرا، ئارگومێنتــه ناوەكییەكــەی، ئێنكلیتیكەكــەی پێوەدەلكێــنرێت و وەك بــەركارى ڕاســتەوخۆی كردارەكــه جێگیردەكرێت.

---

[٨٦٩] inhärenter Kasus

[٨٧٠] Siewierska (1984:60-62), in: Jaeggli (1986)

[٨٧١] Aktivsätze

[٨٧٢] Thoman (1986)

[٨٧٣] Akkusativmarkierung

[٨٧٤] Objektmarkierung

شوێنی سینتاکسیی بکەری ڕستەکەو هاونیشانەیی لەگەڵ بەشی کردارەکەی ڕێدەدەن، بکەرەکە وەك ئارگومێنتی دەرەکیی بناسرێتەوەو دەستنیشانبکرێت. شوێنی دروستەیی بکەرو ئەو ئێنکلیتیکەی پێوەی دەلکێنرێت، دەتوانرێن وەك ئارگومێنتی ناوەکیی کرداری بکەرنادیار دیارییبکرێت.

٤٤- گوڵیان پێشکەشکرا.

بەڵگەهێنانەوەکان سەربە بکەری دروستەی قووڵن، کە وەك بەرکارە ڕاستەوخۆکەی کردار ناتوانرێت بئاخنرێتە ناو بەشی کردارەکەوە. چونکە ئارگومێنتە ناوەکییەکە تەنها ئارگومێنتێکە، کە دەتوانرێت لەڕێی ئەم گواستنەوە سەرەتاییەوە بکرێت بەکلیتیك.
لەڕێی بوونی نیشانەتایبەتییەکان و پرۆسەکانەوە، کە تایبەتن بە بکەری دروستەیی قووڵەوە، بکەر ڕێیدا بە دۆخی ڕێزمانیی بکەرییەوە بناسرێتەوەو دەستنیشانبکرێت. بەلام بکەرە دروستەییە قووڵکە توانرا لەو ڕێیەوە بە دۆخی ڕێزمانیی بەرکارییەوە بناسرێتەوە، کە لە ڕستەی کردارە ڕابوردووەکاندا ئێنکلیتیکی هەڵگرتووە. بەکلیتیککردنی بەرکار بەڵگەیەکی ڕاستەوخۆیە بۆ ئەم بانگەشەی گریمانەیە. ئاکاری تایبەتیی بەرکاری ڕاستەوخۆ لە زاری سلێمانییدا بە کلیتیککردنە.

٤٥- (pro) t پێشکەشیانکرا ϕ .

ئێستا ئاشکرایە، کە بکەری دروستەیی قووڵ تەنها لە ڕێی ڕێکەوتن و هەاونیشانەییەوە لەگەڵ بەشی کرداری بکەرنادیار لە بەرکاری دروستەیی قووڵ جیاناکرێتەوە، بەڵکو لەو ڕێیەشەوە لێیجیادەکرێتەوە، کە ناتوانرێت بکرێت بە کلیتیك.
لەوانەوە ئەو ئەنجامە هەڵدەهێنجێنرێت، کە فرێزە ناوییەکان لە ڕێکخراوی دروستەیی[٨٧٥] لەیەکچووی ڕستەی بکەردیار (ڕستەی چالاك) و ڕستەی بکەرنادیار (ڕستەی سست) دا حوکمی ڕێزمانیی دروستەیی دەکرێن. چونکە دۆخی ڕێزمانیی بە ڕۆڵی بابەتییانەوە نە بەستراوەتەوەو کرداری بکەرنادیاریش لەتوانایدایە حوکمی دۆخی ڕێزمانیی هەر ڕەگەزێك بکات، بەبێ ئەوەی گوێ بە ڕۆڵە بابەتییانەکەی بدات.

[٨٧٥] strukturelle Organisation

ئارگومێنته بابەتییەکان[٨٧٦]:
٤٦- (ا) نەسرین گوڵێکی پێشکەشکرا.
(ب) گوڵێک پێشکەش بە نەسرین کرا.

پاتسیێنت:
٤٧- دزەکە گیرا.
٤٨- بەنەوزاد گوترا، ...

## کورتەو پوختەی ئەنجامەکان:

کرداری بکەر نادیار لە گەشەکردنی مێژوویی زمانەکەدا بەشدارییکردووەو لە ئەنجامی پەیوەندییە ڕاستەوخۆکەیدا لەگەڵ زمانی فارسیی و عارەبییدا بارێکی تایبەتیی وەرگرتووە، کە سەرەنجامەکانی دووبارە لە دروستەی سینتاکسیی کرداری بکەرنادیاردا دەبیینرێنەوە. یەکێک لە دیارو لەڕوو تریینی ئەو گەشەکردنە، گوومبوونی "فرێزی لەلایەن" ە لە ڕێزمانی کوردییدا، کە لە ڕێیەوە کرداری بکەرنادیار بووە بە لێکسیمێکی سەربەخۆی ناو فەرهەنگەکەمان. لەبەرئەوەی بەشی کرداری بکەرنادیار بکەرێکی دروستەیی قووڵ (و بەرکارێک) ی هەیەو چونکە دۆخی ڕێزمانیی لە زاری سلێمانییدا دروستەییەو بە دروستەی سینتاکسییەوە بەندە، نە بکەرو نە بەرکار دۆخی ڕێزمانیی زگماکییان هەیە. لەمەوەیە دەڵێم، کە: وەچەپێکهاتەکانی بکەرنادیاری زمانی کوردیی پێویستیان بە گواستنەوەی بەزۆری تایبەت بە بکەرنادیار نییە؛ زاری سلێمانیی گواستنەوەکانی بکەرنادیاری پێویست نییە.

---

[٨٧٦] Themen-Argumente

# بەشی حەوت هەم

## ڕستەی سەرجێناویی[٨٧٧]

لێرەدا هەوڵدەدەم، بەڵگە بۆ ئەو تێزە بهێنمەوە، کە ڕستە سەرجێناوییەکانی زمانی کوردیی هیــچ یاســایەکی گواســتنەوەیان نــاوێت و نیشــیانە. ئــەو ئەنجامانــەی، دەمــەوێت بەدەستیانبخەم، لەو بانگەشەی گریمانەیەوە سەرهەڵدەدەن و بنەماکەی ئەوەن، کە فرێزێکی ناویی لەناو گچکەترین مەودای ڕکێفدارەکەیدا[٨٧٨] دەکرێت بە کلیتیك یان کە فرێزی ناویی بکەر لە دروستەی قووڵدا بە فەرهەنگیی بەرجەستەناکرێت و دەرنابڕدرێت.
بناغەی ڕستەی سەرجێناویی دروستەیەکە، کە تایبەتە بە خۆی. من دەمەوێت لە سەرەتاوە لەم دروستەیەو لە تایبەتمەندییەکان و نیشانەتایبەتییەکانی ڕستەی سەرجێناوی کوردیی بدوێم و ڕوونیانبکەمەوە. بۆ ئەم مەبەستەیش هەمیشە پەنامبردووەتە بەر چۆمسکیی و گرێڤندۆرف و سافیر[٨٧٩]. بەڵام نە بەتەواوی کارم بە بۆچوونەکانی ئەمیان و نە بە تێڕوانینەکانی ئەوی تریان کردووە. لەبری ئەمە، وەچەپێکهاتەی ڕستە سەرجێناوییەکانی زمانەکەمانم لەبەر ڕۆشنایی داتاو کەرەستەکانی زمانی کوردییداو بەیاریدەی زاراوە بەکارهاتووەکانی ڕێزمانی بەرهەمهێنان و ڕێسا گشتییە پەسنکەرەکانی قوتابخانەکەی پەسنکردووە.

## ١/٧) ڕستەی سەرجێناویی سنووردارییکراوو سنووردارییی نەکراو[٨٨٠]

ئەم چەشنەی ڕستەی سەرجێناویی ناوە باوەکەی "ڕستەی سەرجێناویی بەستراوە"[٨٨١] یان "ڕستەی سەرجێناویی بەند"ی هەڵگرتووە. لە ڕستەی سەرجێناویی بەستراوەدا، شوێنی دروستەیی فرێزەناوییەکەو بەم پێیەیش هی سەری ڕستە سەرجێناوییەکە[٨٨٢] یان هی ئەو ناوەی دەستپێدەکرێت[٨٨٣] لەو جێیەدایە، کە لە دروستەی (١) دا هەیەو ئەمەیش مەرجێکی

---

[٨٧٧] Relativsätze

[٨٧٨] innerhalb ihrer minimalen Domäne

[٨٧٩] Chomsky (1982), Grewendorf (1985), Safir (1986)

[٨٨٠] restriktive- und nicht-restriktive R-Sätze

[٨٨١] gebundener R-elativsatz

[٨٨٢] R-Kopf

بنەمایی گرنگە بۆ ئەوەی، ڕستەی سەرجێناوییە بەستراوەکان[٨٨٤] لە ڕستەی سەرجێناوییە نەبەستراوەکان[٨٨٥] جیابکرێنەوە. چونکە لەکاتێکدا شوێنی سەری ڕستەی سەرجێناویی بەستراوە دەدۆزرێتەوەو دەناسرێتەوە، سەری ڕستەی سەرجێناویی نەبەستراوەتەوەو نادۆزرێتەوە.

1-




α = سەری ڕستەی سەرجێناویی، ناوی دەستپێکراو

β = جێناوی سەرجێناویی[886] (who, whom ...)

(ا) ئەو دروستە سینتاکسییەی، کە بناغەی ڕستەی سەرجێناویی بەستراوەیە:




ئەو دروستە سینتاکسییەی، کە بناغەی ڕستەی سەرجێناویی نەبەستراوەیە:

---

[٨٨٤] restriktive Relativsätze

[٨٨٥] nicht-restriktive Relativsätze

[٨٨٦] R-Pronomen (Relativpronomen)




پراوپـــڕ بـــەپێی ئـــەم پەســـنکردنە دروســـتەییەی ڕســـتەی ســـەرجێناویی، ڕســـتە سەرجێناوییەکانی زاری سلێمانیی دەتوانرێن وەك نموونـەو نوێنـەر بـۆ ڕستە سـەرجێناوییە بەستراوەکان دیارییبکرێن. ئەم زانیین و پێزانیینـەم لـەو ڕێیـەوە بەبەڵگـە دەسـەلمێنرێت، کـە شـوێنی comp لــە گشــت وەچەپێکهاتــەی ڕســتەکانییدا بــە واژەگۆکــەرە تەواوکەرانــە نەشــکاوەکە[887] پڕبووەتــەوە. هــەرچی لێکدانــەوەی ســێمانتیکیی ســەری ڕســتە سەرجێناوییەکەیە، ئەوا سەری ڕستە سـەرجێناوییەکە لـە چەشنی نەبەتەستراوەیە؛ چونکـە ئەو سەرەی ڕستەی سەرجێناوییەکانمان کۆمەڵەی ئەو دەربڕاوانەی، دەربارەی دەردەبڕدرێن، بەگشـتیی سـنووربۆدانراوو دیـارییکراون. سـەری ڕسـتە سـەرجێناوییەکەی، لـە هێڵکارییـە ئەندازیارییەکەی[888] (١) دا یە، بە ئاسانی دەدۆزرێتەوەو دەناسرێتەوە.




---

[887] unflektierte Komplementpartikel (کە، ئەگەر)

[888] Konfiguration

٢- ئەو پیاوەی، کە p ro دوێنێ لێرەبوو ϕ، pro برامە.
٣- ئەو ئازادەی، کە p ro تۆ دەناسێت، pro مامۆستایە.

٤- پیاوێك، کە تۆ t بیناسییت، ...
٥- هەرکەسێك، (کە) pro زەنگین بوو ϕ، ...

لەسەرەتادا، وەك بناغەیەك بۆ هەڵگواستنی ڕستە سەرجێناوییە بەستراوەکانی زمانی کوردیی ئەم یاسایەی دروستەی فرێز دەکەمە گریمانەی سەرەکیی:

N´´ فراواندەکرێتەوە بۆ N´´ V´´ .

ڕستەی شەقکراو[٨٨٩] و دروستەی ڕستە بە وەچەپێکهاتەی هێنراوە پێش و قورساییخراوەسەرەوە[٨٩٠] بابەتەکانی ئەم بەشەن؛ تێیدا مامەڵە لەگەڵ ئەو دروستانەی ڕستەی سەرجێناودا دەکەم، کە لەتەك کەرەستەیەکی هێنراوەپێش و قورساییخراوەسەری دەستنیشانکراو یان ڕستەی شەقکراودا ڕوودەدەن و هەن. بۆ ئەم مەبەستەیش لە ڕستەکانی (٦) و (٧) دەدوێم، کە تیایاندا سەری ڕستەی سەرجێناویی لە شوێنە سینتاکسییەکەی (١) دا دەتوانرێت بێ خۆماندووکردنێك بدۆزرێتەوەو بناسرێتەوە.

٦- (ا) منم ئەو کەسەی، کە تۆ لەدووی t دەگەڕێیت.

٧- (ا) ئازاد، ئەوەی کە p ro دوێنێ لێرەبوو ϕ، ...

---

[٨٨٩] Spaltsätze

[٨٩٠] Fokuselement

٦- (ب)




٧- (ب)




ئەو پاشکۆیەی لە چۆمسکی (١٩٧٧ و ١٩٨٢) هوە کارپێدەکرێت:
''وەچەپێکهاتەکانی ڕستەی سەرجێناویی داوای کەرەستەی بەستنەوەی تایبەتیی دەکەن''

پێشبینیی ئەوە دەکات، کە دەبێت لەبارین بۆئەوەی بەتەواویی لێکبدرێنەوەو کە ئەو پێناسانەی بەستنەوەی[٨٩١] (٨-٩) بۆ پەسنکردنی پەیوەندییە ناوبراوەکان هەن، جیاوازو جۆراوجۆرن:

٨- Y بە X ەوە بەستراوە، ئەگەر X وەچەئاڕاستەی Y بکات و ئەگەر Y و X هەمان نیشانەی ئاماژەیی[٨٩٢] هەڵبگرن.

٩- بەستنەوەی ´A: بەستنەوە لەڕێی شوێنێکی ناڕێزمانییەوە؛

بەستنەوەی A: بەستنەوە لەڕێی شوێنێکی ڕێزمانییەوە.

بۆ پەیوەندییە تایبەتییەکانی بەستنەوەو بەم پێیە بۆ پەیوەندییەکەی بەستنەوەی (٨)، سەری ڕستەسەرجێناوییەکە کەرەستەی دیارییکەرە لە ڕستەی سەرجێناویی کوردییدا. ئەگەر ئێمە بزانین، کە زمانی کوردیی یاساکانی گواستنەوەی بەزۆرو خورتەکیی نییەو کە ئۆپەراتۆری نییە، ئەوا چاکترە ڕووبکەینە ئەو پەیوەندییانەی بەستنەوە، کە لەلایەن سافیر[٨٩٣]ەوە پێشنیازکراون:

١٠- (ا) بەستنەوەی ڕستەی سەرجێناویی: بەستنەوە لەڕێی (لەلایەن) سەری ڕستەی سەرجێناوەوە.

(ب) بەستنەوەی X: بەستنەوە لەڕێی ناوەڕۆکی پارتیکڵی تەواوکەرانە[٨٩٤]ی ڕستەی سەرجێناوییەوە ( who, whoes, ...)

لەنێوان سەری ڕستەی سەرجێناویی و ئەو ئارگومێنتەی (ئارگومێنتێکی، کە لەڕێی ڕستەی سەرجێناوییەوە بەستراوەتەوە)، کە پێوەی بەستراوە، پەیوەندییەکی بەستنەوەی ڕاستەوخۆ هەیە. لە (٢) و (٣) دا، بۆ نموونە، بکەرە سفرە جێناوییەکەی ڕستی یان ڕستییلەی ڕستەسەرجێناوییەکە[٨٩٥] لەلایەن سەری ڕستەسەرجێناوییەکەوە بە بەستنەوەی ڕستەی سەرجێناوییەوە بەستراوەتەوە. بەڵام لە (٤) دا شوێنی بنجیی و بنەڕەتیی کلیتیکی بەرکار لەلایەن سەری ڕستەی سەرجێناوییەوە بە بەستنەوەی ڕستەی سەرجێناوییەوە بەستراوەتەوە. بۆیە ئەگەری ئەوە زۆر کەمە، ڕستییلەی ڕستەی سەرجێناویی بتوانێت

---

[٨٩١] Bindungsdefinitionen

[٨٩٢] Referenzindex

[٨٩٣] Safir (1986:665-667)

[٨٩٤] Relativ-Complementizer

[٨٩٥] Relativ-Klausel

لەڕووی سینتاکس و سێمانتیکەوە دروستەی ڕستەی داخراوبێت. بەڵام بابگەڕێنەوە بۆ سەر ڕێکخراوی سینتاکسیی[٨٩٦] ڕستەی سەرجێناویی: ڕێکخراوی سینتاکسیی ڕستەی سەرجێناویی بەواتاو ناوەرۆکی (لەبەر ڕۆشنایی) پەیوەندییەکانی بەستنەوەی نێوان سەری ڕستەی سەرجێناویی و ئەو ئارگومێنتەی، کە بە ڕستەی سەرجێناوییەوە بەستراوەتەوە، پەسندەکرێت. من وای بۆدەچم، کە سەری ڕستەی سەرجێناویی و ڕستە سەرجێناوییەکەی دوای پارتیکڵەتەواوکەرانە[٨٩٧] نەشکاوەکە دێت، لە ئاستی قووڵدا بەرهەمهێنراون. سەری ڕستەسەرجێناوییەکە، کە دروستەکەی بە یاسا مۆرفۆلۆژییەکان هەڵگوێزراوە[٨٩٨]، ناوەرۆکێکی واتایی نادیار دەردەبڕێت. لەمەوەیە ئەگەری ئەوە هەیە، سەری ڕستەی سەرجێناویی وەك ئارگومێنتێکی ناوەکیی[٨٩٩] کرداری سەرەکیی[٩٠٠] دەربکەوێت و بەکاربهێنرێت. بەهۆی (لەسەر بناغەی) واتای کراوەی[٩٠١] سەری ڕستەی سەرجێناوییەکەوەیە، پاش ڕستە سەرەکییەکە ڕستییلەی ڕستەی سەرجێناوی دێت. بەم جۆرە، جیاکردنەوەی دوو چەشنەکەی ڕستەی سەرجێناویی لەم پارو وەچەپارانەی لای خوارەوەدا بناغەیەکی دروستەی سینتاکسییان هەیە.

## ٢/٧) پێکهاتووی ڕستەی سەرجێناویی[٩٠٢]

### ٢/٧-١) پێکهاتووی ڕستەی سەرجێناویی لەچەشنی ١

سەری ڕستەی سەرجێناویی وەك کەرەستەی دیاریکەری ڕستەی سەرجێناویی لەم چەشنەیدا ئارگومێنتی ناوەوەی کردارەسەرکییەکەیە[٩٠٣]. ئەو ئارگومێنتەی لەگەڵییدا

---

[٨٩٦] syntaktische Organisation

[٨٩٧] das unflektierte Komplementpartikel

[٨٩٨] eine morphologisch abgeleitete Struktur

[٨٩٩] internes Argument

[٩٠٠] Matrixverb

[٩٠١] offene Bedeutung

[٩٠٢] Relativsatzkonstruktionen

[٩٠٣] Matrixverb

هاونیشانەیە، یان بکەری ڕستییلەی ڕستەسەرجێناوەکەیە[٩٠٤] یان بەرکاری بەشی کرداری ئەم ڕستییلە ڕستەسەرجێناوییەیە.

١١- (ا) کەس ئەو پیاوانەی نەدەناسیی، کە ئێوە سڵاوتان t لێکردن.
j z z ij i

(ب) کەس ئەو پیاوانەی نەدەناسیی، کە pro سڵاویان لە ئێوە کرد.
z j j i j i

پەیوەست بە دیاردەی ڕێکەوتن و هاونیشانەکردنەوەوە بۆ تیۆرییەکی ڕێزمانی ڕستەی سەرجێناویی کوردیی لە چەشنی ١، شییکردنەوەی دروستەی (١٢) پێشنیازدەکەم، کە ساکارو ئاسان دڕێژراوە.

١٢- کاتێك ڕستەیەکی سەرجێناویی ڕێکەوتنی هەیە، کە سەرە زاڵەکەی ڕستەسەرجێناوییەکە لە ڕستەسەرەکییەکەدا بەپێی (٨) و (١٠) ئەو ئارگومێنتەی ڕستییلە ڕستەسەرجێناوییەکەی لەژێر ڕکێفدابێت و لەگەڵییدا لە نیشانەتایبەتییەکانی "کەس" و "ژمارە" دا وەکیەك بێت.

## ٢/٧-٢) پێکهاتووی ڕستەی سەرجێناویی لەچەشنی ٢

سەری ڕستەی سەرجێناویی لەم چەشنەی ڕستەی سەرجێناوییدا لە شوێنی ئارگومێنتێك نییە. پێویستیی و مەرجەبنەماییەکانی بابەتانەو مۆرکەکانی نیشانەتایبەتییەکانی وەچەدیارییکردنی گشت ڕستەکە بەگشتیی و هی سەری ڕستەسەرجێناوییەکە بەتایبەتیی لەو ڕێیەوە جێبەجێدەبێت، کە سەری ڕستەسەرجێناوییەکە لەگەڵ ئارگومێنتێکی بەشی کرداری ڕستییلەی سەرجێناوییەکەدا هاونیشانەیە. کەواتە سەری ڕستەسەرجێناوییەکە فرێزێکی ناوییە، کە ڕستییلەی ڕستەسەرجێناوییەکەی تێیدا شکاوەتەوە/تێناخنراوە.
دروستەی ڕستەی سەرجێناویی لەچەشنی٢ دەتوانێت بەگوێرەی هێپۆتێزەی شکاندنەوە بەم شێوەیە دابڕێژرێت (لەبەر گرنگیی چەمکی سیمانتیکیی زاراوەی [ +/ - دیار ] بۆ

---

[٩٠٤] R-Klausel

بەڵگەهێنانـەوەکان، لـێرەدا نیيشـانەی تایبـەتیی "دیـارو نادیـاریی"[905] یـش هێنراوەتـەوەو خراوەتە سەر پێناسەکە).

١٣- کاتێك ڕستەیەکی سەرجێناویی ڕێکەوتنی هەیە، کە سەری ڕستەسەرجێناوییەکەو ئەو ئارگومێنتـــەی بەســـەرجێناویی پێـــوەی بەســـتراوە[906]، بـــەپێی (٨) و (١٠) لـــە نیيشانەتایبەتییەکانی "کەس" و "ژمارە" و "دیارو نادیاریی" دا وەکیەك بن.

خستنەڕووی پەسـەندی ڕسـتەی سـەرجێناویی بەسـتراوە، بـەو شـێوەیەی لـە ڕێزمـانی گواسـتنەوەدا هەیـەو ڕۆیشـتووە، ئەوەیـە، کـە ڕسـتەی سـەرجێناویی وەك ڕسـتەیەکی لـەناو فرێزێکی ناوییدا شکاوە شییدەکاتەوە[907]. ئەو داڕشتنە گونجاوەی بۆ ڕستەی سەرجێناویی کوردیـی پێشکەشـکرا، دەرییدەخـات کـە ڕسـتەی سـەرجێناویی زمانەکـەمان بـەگوێرەی هێپۆتێزەی شکاندنەوەی ڕێزمانی بەرهەمهێنان یەکێك لەم دروستانەی خوارەوەی هەیە:

١٤- (ا) N'' [ N'' [ ئەو پیاوەی V'' [ comp [ کە V' [ pro ئەوزاد دەناسێت ]]]]]

(ب) N'' [ N'' [ ئەو پیاوەی V'' [ comp [ کە V' [ ئەوزاد t دەیناسێت ]]]]]

١٥- (ا) V'' [ V' [ ئازاد ئەو پیاوەی دەناسیی [ comp [ کە V' [ pro لەدووت t دەگەڕا ϕ ]]]]]

(ب) V'' [ V' [ئازاد ئەو پیاوەی دەناسیی [ comp [ کە V' [ pro لەدووی t دەگەڕایت ]]]]]

---

[905] Definitheitsspezifikation

[906] R-gebunden

[907] بڕوانە: Chomsky (1965), Rosenbaum und Jacobs (1986), Langendoen (1969), Kuroda (1969), Partee (1975), Jackendoff (1977), (Edmonds (1979), Mc Closkey (1979), Linque (1982), و گەلێك زمانەوانانی دییکە.

هەر وەك ڕستەكانی (١٤) و (١٥) دەریدەخەن، ڕستەسەرجێناوییەكان دروستەی لەناویەكدا شكاوەن. وەك ئەمانەیش چەند ڕێسایەك بەرهەمیاندێنن. ڕێساكانییش پەیوەستن بە نیشانەتایبەتییەكانی وەچەدیارییكردنەوەو بە پەیوەندییەكانی بەستنەوەوەو بە پەیوەندییەكانی بكەرو بەشی كرداروەوە. لە (١٤ (ب)) و (١٥ (ب)) دا، بۆ نموونە، جێناوی لكاوی بەركار لەڕێی شوێنە بنجییەكەیەوە لەگەڵ سەری ڕستەسەرجێناوییەكەدا هاونیشانەیە. پەیوەست بە سەری ڕستەسەرجێناوییەكەوەو بە جێناوی لكاوی بەركارییشەوە ئەم پەیوەندیی بەستنەوەیە وەك مەرج و پێویستییە بابەتییەكان و نیشانەتایبەتییەكانی وەچەدیارییكردن ئاشكرا دەكرێت و ڕووندەكرێتەوە. چۆن سروشتی ئەم پەیوەندیانەی بەستنەوە پەسندەكرێت، لەم وەچەپارەی داهاتوودا ڕوونیدەكەمەوە.

## ٣/٧) پەیوەندییەكانی بەستنەوە

یەككەمین پەیوەندی بەستنەوە پەیوەستە بە پەیوەندیی نێوان جێناوی لكاوی بەركارو شوێنە بنجییەكەیەوە، كە بۆ نیشانەتایبەتییەكانی وەچەدیارییكردن و بۆ سەری ڕستەسەرجێناوییەكە دەگەڕێتەوە. دووهەمین پەیوەندیی بەستنەوە هی بكەری سفرە جێناوییەكەو هی سەری ڕستەسەرجێناوییەكەیە.

پرسیارێكی لێرەدا دەكرێت، بەم شێوەیە دادەڕێژرێت: ئەم پەیوەندیانەی بەستنەوە تا چ ڕادەیەك ڕێساكانی تیۆریی بەستنەوە بریندارەدەكەن و لێیان لادەدەن؟

جێناو دەتوانێت لەگەڵ هەر فریزێكدا لەدەرەوەی گچكەترین مەودای ڕكێفەكەیدا هاونیشانەبێت[٩٠٨]. بكەری pro یان جێناوی لكاوی بەركارە جێناوییەكە لەگەڵ سەری ڕستەسەرجێناوییەكە هەمان نیشانەی ئاماژەیی[٩٠٩] هەڵدەگرن؛ بۆ نموونە، لە (١٤ (ا)) دا بكەرە سفرەكە لەگەڵ سەری ڕستەسەرجێناوییەكەدا هاونیشانەیە. لە (١٤ (ب)) دا جێناوی لكاوی بەركار ئەو كەرەستەیەیە، كە نیشانەتایبەتییەكانی سەری ڕستەی سەرجێناویی هەڵگرتووە. بەم واتاو ناوەڕۆكەوە، ئەو كەرەستەیەی بە سەری ڕستەسەرجێناوییەكەوە بەستراوە، لەلایەن ئەمەوە كۆنترۆڵی واتایی یان سێمانتیكیی كراوە. چونكە ئەم پەیوەندییە سێمانتیكییە لەسەر ئاستێكی بەزۆرو خورتەكیی[٩١٠] بەڕێوە دەچێت. جێناوەكان، pr o و كلیتیكەكانییش (جێناوەلكاوەكان)، بەواتاو ناوەڕۆكی سێمانتیكییەوە هیچ ڤاریابڵێكی بەستراوە نین. ئەمەیش ئەوە دەبەخشێت، كە دەبێت ئەم پەیوەندیانەی بەستنەوە لەنێوان

---

٩٠٨ Keyser (1986:209)

٩٠٩ Referenzindex

٩١٠ obligatorisch

سەری ڕستەی سەرجێناویی و ئەم جێناوانەدا لەگەڵ داواکاریی و مەرجەکانی "کایزەرد" دا یەکبگرنەوەو بەپێی ئەوان لەکاردابن.
بۆئەوەی مەرج و پێویستییەکانی بهێنرێنەدییتن و جێبەجێبکرێن، خواستن و وەرگرتنی "بیری هاونیشانەی بەڕێکەوت[٩١١]" پەسەندەکەم[٩١٢]؛ بیرەکە دەڵێت، کە:
وەچەپێکهاتووی ڕستەی سەرجێناویی بە سەرێکی ڕستەی سەرجێناویی تایبەتییەوە ڕێ بە جۆرێك لە پەیوەندیی کۆڕێکەوتنی بەڕێکەوت[٩١٣] لەنێوان سەری ڕستەی سەرجێناویی و ئەو ئارگومێنتەی پێوەی بەستراوە، دەدات.
هەر وەك بۆمان ئاشکرادەبێت، ڕستییلەی ڕستەی سەرجێناویی دروستەی ڕستەیەکی سینتاکسیی داخراوە. کەواتە دروستەی ڕستەیەکی سینتاکسیی سەربەخۆیە. بۆیە پرۆسەی هاونیشانەکردنەکە لەسەر ئاستێکی بەرز تر لە ئاستی سینتاکسیی ڕوودەدات؛ لەسەر ئاستێك جێبەجێدەکرێت، کە تێیدا سەری ڕستەی سەرجێناویی لەڕێی ئەو تێبینییەوە[٩١٤]، کە ڕستییلەی ڕستەسەرجێناوییەکەی دەربارەی دەیدات، بووە بە کەرەستەیەکی ئامارژەدەر[٩١٥] و بە کەرەستەیەکی [ + دیار ]. ئەمجا ئەمەیش ئەوە دەبەخشێت، کە لەڕاستییدا پەیوەندییەکی کۆڕێکەوتن لەنێوان دوو کەرەستەی ئامارژەدەردا دروستدەبێت و کە خواستن و وەرگرتنی ئەو بیرەی سەرەوە بە ڕاستیی و دروستیی دەخرێتەکار.
کە پەیوەندییەکی بەستنەوەی لەم جۆرە لە زاری سلێمانییدا ڕێی پێدەدرێت، لەو ڕێیەوە بە بەڵگە سەلماندم، کە ڕستە شکاوەکە[٩١٦] بەگشتیی دروستەی ڕستەیەکی سینتاکسیی[٩١٧] داخراوی هەیە.
واژەگۆکەرە تەواکەرانە نەشکاوەکە لە شوێنی ئارگومێنتێکدا نییە. بۆیە ناتوانێت هیچ نیشانەیەکی هاونیشانەکردن هەڵبگرێت. ڕستە سەرجێناوییەکەیش بۆیە هیچ ئۆپەراتۆرێکی تێدا نییە، چونکە هیچ یاسایەکی گواستنەوەی بەزۆرو خورتەکیی نیشاننادات. لە هەموو ئەم تێبینییکردنانەمەوە ئەو ئەنجامەم بەدەستخستووە، کە سەری ڕستەی سەرجێناویی کوردیی دروستەیەکی تایبەتیی هەیەو کە لەنێوان ئەم و ئەو

---

[٩١١] accidental correference, die zufällige Koreferenz

[٩١٢] Lasnik (1976), Evans (1980), Reinhart (1981), Chao and Sells (1984), Safir (1986:670)
گەلێك زمانەوانی دییکەیش.

[٩١٣] Zufälliger Koreferenzrelation

[٩١٤] Kommentar

[٩١٥] referentielles Element

[٩١٦] der eingebetete Satz

[٩١٧] syntaktisch geschlossener Satzstruktur

ئارگومێنتەی لەگەڵییدا هاونیشانەیە، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ هەیە. دروستەتایبەتییەکەی سەری ڕستەسەرجێناوییەکەو ڕۆڵە تایبەتییەکەی لە ڕستەی سەرجێناویی زمانی کوردییدا پاڵمپێوەدنێن و هانمدەدەن، هەندێك ڕوونکردنەوە دەربارەیان بدەم.

## ٤/٧) سەری ڕستەی سەرجێناویی

بەستراوەیی ڕستەی سەرجێناویی، وەك لە (١) دا خشتەکەی خراوەتەڕوو، دروستەیەکی سینتاکسیی بناغەکەیەتی. جیاوازیی نێوان ڕستەی سەرجێناویی بەستراوەو نەبەستراوە دەیشگێڕدرێتەوە بۆ نیشانە سێمانتیکییەکەی "دیارو نادیاریی" ی سەری ڕستەی سەرجێناویی[٩١٨]. دوا جیاکردنەوەی چەشنەکانی نابێتەهۆی جیاکردنەوەیەکی سینتاکسیی ڕستەسەرجێناوییەکان. بەڵام جیاکردنەوەکە دەتوانێت لە هەندێك دیاردەی دیارییکرودا سەرەنجامی جیاوازی هەبێت. نموونەیەك بۆ ئەمە دیاردەی "پەڕینەوەی لاوازە"[٩١٩]، کە لە ڕستەسەرجێناوییە بەستراوەکاندا چاوەڕێدەکرێت و لە نەبەستراوەکانییدا چاوەڕێناکرێت[٩٢٠]. من وایشی بۆدەچم، کە سەری ڕستەی سەرجێناویی لە زاری سلێمانییدا، بەهۆی نیشانە سێمانتیکییە [definit-] کەیەوە، سەرەنجامی خۆی دەبێت. ئەم سەرەنجامانە لە سەری ڕستەسەرجێناوییە شکاوەکاندا بەدییدەکرێت (بڕوانە پارەکانی داهاتوو). با ئێستایش بگەڕێمەوە سەر پەسنکردنی دروستەیی سەری ڕستەی سەرجێناویی.

چەشنی یەککەمی سەری ڕستەی سەرجێناویی بەزۆرو خورتەکیی لەگەڵ فۆڕمی ئاساییدا[٩٢١] یەکدەگرێتەوەو تەتابوقدەکات و لەیەکێك لەم دروستانەی خوارەوەدا ڕوودەدات و دەردەکەوێت.

(ا) ناوێك لەگەڵ جێناوی سەرجێناوی[٩٢٢] "ئەوەی" :

<پیاو> : <ئەو پیاوەی> : <ئەو پیاوانەی>؛

(ب) ناوێك لەگەڵ مۆرفێمی ناسیاریی /کە/ و مۆرفێمی جێناویی[٩٢٣] /ی/:

---

٩١٨ Safir (1986:667-668)

٩١٩ weak crossover

٩٢٠ Safir (1986)

٩٢١ Indikativform

٩٢٢ Relativpronomen

٩٢٣ pronominal Morphem

<پیاو> : <پیاوەکەی>.

چەشنی دووهەمی لە بنەڕتدا لەگەڵ فۆڕمی ویست و ئارەزووی کردارەکاندا لەم دروستانەدا ڕوودەدات و دەردەکەوێت.

(ا) ناوێك لەگەڵ مۆرفێمی نەناسیاریی /ێك/ یان /یەك/:
{یەك پیاو} : {پیاوێك}؛
(ب) لەگەڵ جێناوی نادیاریی[٩٢٤] <هەر>:
<پیاو> : <هەر پیاوێك>.

١٦- ئەو پیاوەی، کە p ro دێت، pro برامە.
١٧-* ئەو پیاوەی، کە p ro بێت، pro برامە
١٨- pro کوردێك دەناسییت، کە pro ترسنۆك بێت.
١٩- * pro کوردێك دەناسییت، کە pro ترسنۆکە

چەمکی سێمانتیکیی [ + definit ] ی سەری ڕستەی سەرجێناویی، وەك لە نموونەکانی (١٧) و (١٩) دا دەردەکەوێت، مەرج و پێویستییەکی گرنگە بۆ پەیوەندییەکانی بەستنەوە. ئەم نیشانەتایبەتییە لە ڕاستییدا ڕەگ و ڕیشەیەکی قووڵی لە زمانەکەماندا هەیە. چونکە لەتەك نیشانەکانی "کەس" و "ژمارە" دا یەکێکە لە نیشانە پێویستییەکان بۆ هاونیشانەیی و یەکگرتنەوەو ڕێکەوتنی بکەرو بەشی کردار. ڕستەکانی (٢٠)، بۆنموونە، جگە لەم نیشانەتایبەتییە سێمانتیکییە، کە نیشانەی هاونیشانەیی و ڕێکەوتنە، هیچ ڕێسایەکی دیکەی زمانی کوردییان بریندارنەکردووە؛ بۆیە ڕێ بەهیچیان نادرێت.

٢٠- (ا) * پیاو هات
(ب) * هەر پیاوێك هات

لە (٢٠ (ا)) دا ناوەکە نیشانەتایبەتییەکانی کەسی سێهەمی تاك و نادیاری هەیە. بەشی کرداری ڕستەکەی، بە پێچەوانەوە، نیشانەتایبەتییەکانی کەسی سێ هەمی تاك و دیاری هەڵگرتووە. لەبەرئەمەیە پەیوەندیی دوو ڕەگەزە ڕێزمانییەکە "بکەرو بەشی کردار" بە هیچ جۆرێك نایەتەدیتن و نەبوونەکراوە.

---

[٩٢٤] Indefinitpronomen

من بانگەشەی ئەو گریمانەیەم کرد، کە سەری ڕستەی سەرجێناویی لەگەڵ فۆڕمی ئاسایی کرداردا یەکدەگرێتەوەو تەتابوقدەکات و یەکێك لەم دروستانەی هەیە:

(ا) ئەو _ناو _ ەی <ئەوپیاوەی>؛
(ب) ناو _ ئەکەی <پیاوەکەی>.

لە فۆڕمی ئاسایی کرداردا پارتیکڵەتەواوکەرانەکە /کە/ دەتوانێت سەرپشکی لابرێت/فرێبدرێت.

٢١- بەردەکەی، (کە) تۆ t هاویشتت ϕ، pro بەر من کەوت.

سەری ڕستەسەرجێناوییەکەی لەگەڵ فۆڕمی مەرجیی یەکدەگرێتەوەو تەتابوقدەکات، یەکێك لەم دروستانەی هەیە.

(ا) ناو _ ێك <پیاوێك>؛
(ب) هەر _ ناو _ ێك <هەر پیاوێك>.

لە ڕستەی مەرجییدا بەڵام، پارتیکڵەکە بە زۆرو خورتەکیی فڕێدەدرێت.

٢٢- (ا) هەر کەسێك، pro بتوانێت، pro من بگرێت، ...
(ب) * هەر کەسێك، کە p ro بتوانێت، pro من بگرێت، ...

ناوەگەلییەکانی[٩٢٥] وەك <پیاو> سەر بە چەشنی دوایین. ئەم ناوانە دەتوانن لەگەڵ پارتیکڵەتەواوکەرانەکەو بەبێ ئەو پارتیکڵە بەکاربهێنرێن و ڕووبدەن. لەتەکیدا هەمیشە پەیرەویی چەشنی ئەو کرداره دەکەن، کە لە گەڵییدان. ئەمە ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی، کە نیشانەتایبەتییەکانی سەری ڕستەی سەرجێناویی هەندێك لەو سەرەنجامە سینتاکسیی و سیمانتیکییانە لەگەڵ خۆیدا دەهێنێتەئاراوە، کە جێی مەرج و سنووربۆدانانە (ئاوەڵکرداره) شوێنییەکان دەگرنەوە.

---

[٩٢٥] kollektiva

## ٥/٧) جێناوی سەرجێناویی[٩٢٦] (ڕستەی سەرجێناویی)

لەگەڵ ئەوەیشدا، کە جێناوی سەرجێناوی <ئەوەی> و <ئەوانەی> دەتوانن لە هەندێک بارودۆخدا بەتەنها بەکاربهێنرێن و ڕووبدەن (بڕوانە (٧ (ا))، نابێت بەهیچ جۆرێک وەک ئۆپەراتۆر سەیربکرێن. یەککەمیان چونکە جێناوێکەو دووهەمیینیش چونکە ئۆپەراتۆرێک کاتێک لە ڕستەیەکدا دەبێت، کە لە پاش گواستنەوەیەکی بەزۆرو خورتەکیی ڤاریابڵێک لەناو ئەو ڕستەیەدا بە خۆیەوە ببەستێتەوە.

لە زمانی ئینگلیزیدا، بۆ نموونە، وەک جێناوێک ناوەرۆکێکی سینتاکسیی هەیەو وەک ئارگومێنتێکی بەشی کردارێک خاوەنی شوێنی بنەڕەتیی و بنجیی خۆیەتی.

23- (a) [John] [who [ Bill saw [e]]] LF لەسەر ئاستی
i j j
(b) [ John] [ who [ Bill saw [ e ]]] LF′ لەسەر ئاستی
i i i

جێناوی ئیشارەیی <ئەوە>[٩٢٧] لەگەڵ مۆرفیمی جێناویی /ی/ سەرێکی جێناویی <ئەوەی> بەواتای (ئەو کەسەی) دروستدەکات. ئەمە ئەوە دەبەخشێت، کە <ئەوەی> ناشێت وەک جێناوی ئیشارە لێکبدرێتەوە؛ جێناوی ئیشارەی زمانی کوردیی <ئەو کەسەی> بەرامبەر بە جێناوی ئیشارەی زمانی ئەڵمانیی derjenige دەوەستێتەوە. جێناوی سەرجێناویی کوردیی لەگەڵ جێناوێکی ئەڵمانیی der و die یەکدەگرێتەوە، کە واتای (ئەوکەسەیان بۆ نێرو بۆ مێ) هەیە.

٢٤- ئەوەی، pro تۆ بناسێت، ...

کەواتە جێناوی ئیشارە لە فۆڕمی نێوانگرێک[٩٢٨] جێناوی سەرجێناویی کوردیی دروستدەکات. کە چەشنە جۆراوجۆرەکانی جێناوەدەستپێکەرەکە[٩٢٩] (سەری جێناویی) لە زمانی کوردییدا بەپێی تاڤ کردار دابەشبوونێکی تەواوکەرانەیان هەیە، تا ئەو ڕادەیە یاسائاساو ڕێکوپێک و ئاساییە، کە زمانەکە زمانێکی لکاوەو هەندێک گۆکردنی سیمانتیکیی

---

٩٢٧ Demonstrativpronomen

٩٢٨ Infix

٩٢٩ Leitnomina

و سینتاکسیی لەڕێی کەرەستە فۆرمدروستکەرەکانەوە[930] (بە مۆرفۆلۆژیی، بەیاریدەی لاگرەکان) دەردەبڕێت. ڕوون ترین نموونە بۆ ئەمە دروستکردنی فۆرمەکانی ڕابوردوو ڕانەبوردوون لەگەڵ داڕشتن و خستنەڕووی فۆرمی ئاسایی[931] و فۆرمی مەرجیی[932] کردار بەیاریدەی لاگرە (پێشگر، نێوانگر، پاشگر، جووتلاگر) جۆراوجۆرەکان.

دروستەی سەرە جێناوییەکەی، بە مۆرفۆلۆژیی هەڵگوێزراوە، بە خشکەیی ئەوە ئاشکرادەکات، بۆچیی ئەو ئارگومێنتانەی پێوەی بەستراون، مەرج و سنووریان بۆ دانەنراوە. چونکە وەك ئەو نموونانەی لای خوارەوە دەریدەخەن، هەم ئارگومێنتە دەرەکییەکەو هەم ئارگومێنتە ناوەکییەکەی بەشی کردارەکە دەتوانن لە ڕستییلەی ڕستە سەرجێناوییەکەدا[933] لەلایەن ئەمەوە بە سەرجێناویی ببەسترێنەوە[934] و ئەم پەیوەندیی بەستنەوەیە دەتوانێت بەسەر چەند ئارگومێنتێکی جیاوازدا تێپەڕێت و بپەڕێتەوەو بیانگرێتەوە.

سەری جێناویی بکەر بکەر

٢٥- (ا) ئەو پیاوەی، کە p ro لێرەبوو، pro مامۆستی ئێمەیە.

سەری جێناویی بەرکار بەرکار

(ب) ئەو فێرخوازەی، کە ئارام t دەیناسێت، پۆلیس ئەمرۆ t گرت ϕ یی.

سەری جێناویی بکەر بەرکار

(پ) ئەو فێرخوازەی، کە p ro ئارام دەناسێت، پۆلیس ئەمڕۆ t گرت ϕ یی.

سەری جێناویی بەرکار بکەر

(ت) ئەو فێرخوازەی، کە ئارام t دەیناسێت، p ro بەیەککەم دەرچوو.

---

[930] Formelelemente

[931] Indikativform

[932] Konjungtivform

[933] Relativ-Klausel

[934] R-gebunden

## ٦/٧) ئاستەکانی لێکدانەوەی LF و LF′

بانگەشەی ئەو گریمانەیەی دەڵێت، کە بەستنەوەی سەرجێناویی[٩٣٥] لە S′ دا نابێت بێ واتاو ناوەڕۆك بێت[٩٣٦]، بەتایبەتیی قورسایی دەخاتەسەر پێویستیی جێبەجێکردنی مەرجە بابەتییەکان و لێکدانەوەی واتایی تەواوی ڕستە. ئەم داواکارییە بەگشتیی دەخوات. بەتایبەتیی لەو زمانانەدا دەخوات، کە بەهۆی نیشانەی ئامـاژەیی و نائامـاژەیی[٩٣٧] سەرە جێناوییەکەیەوە ڕستەی سەرجێناویی بەستراوە لە ڕستەی سەرجێناویی نەبەستراوە جیادەکاتەوە.

ئەو جیاکردنەوەیەی لەسەر بناغەکەی ڕستەی سەرجێناویی بەستراوەی لە نەبەستراوە پێجیاکراوەتەوە، دەبێتە هۆی جیاکردنەوەیەك لە جۆرێکی دیکەو ئەویش گریمانەی جیاکردنەوەی ئاستی LF لە ئاستی LF′[٩٣٨].

بۆ ئەم مەبەستەیش ئەم نموونەیە پێشکەشکراوە[٩٣٩]:

```
26- [[the man]  [who  Bill saw  [e]]]
           i          i              i
```

لەکاتێکدا کردەی هاونیشانەکردن لە (٢٦) دا لەبەر سەرەجێناوییە نائامـاژەییەکەی ڕستەسەرجێناوییە بەستراوەکە لەسەر ئاستی LF جێبەجێدەبێت، پێویستە ئەم کردەیە بەهۆی لێکدانەوەی ئامـاژەیی سەربەخۆو ئازادی سەرەجێناوییەکەی ڕستەی سەرجێناویی نەبەستراوەوە (بڕوانە (٢٧)) دوابخرێت و لەسەر ئاستێکی بەرز تر لە ئاستی LF بێتەدیتن.

```
27- (a)  [ John  [[who  [his wife]  loves [ e ]]]        LF   لەسەر ئاستی
            j        i        j              j
```

---

[٩٣٥] R-Bindung

[٩٣٦] Chomsky (1986)

[٩٣٧] referentiell und nicht referentiell

[٩٣٨] بڕوانە: Chomsky (1982)

[٩٣٩] Safir (1986:668-677)

(b) [John [[who [his wife] loves [ e ]]] LF′ لەسەر ئاستی
j j j j

بەستراوەیی[940] ڕستەی سەرجێناوی زمانی کوردیی لەسەر بناغەی ئەو مەرج و بنەمایانە نییە. سەری ڕستەسەرجێناوییەکە لەڕووی سیمانتیکییەوە کراوەیەو نیشانەی تایبەتیی [ - efinit] هەیە. وەك ئەم کەرەستەیەیش خاوەنی هیچ لێکدانەوەیەکی سەربەخۆ نییە. ڕستییلەی ڕستەسەرجێناوییەکە دروستەیەکی داخراوی هەیە. چونکە بکەرە سفرە جێناوییەکەی pro و/یان کلیتیکێکی تێدایە (بڕوانە (٢٢)).
جیاوازییە زەق و گرنگەکەی نێوان زمانی ئینگلیزیی و زمانی کوردیی لەوەدایە، کە ڕستییلەی ڕستەسەرجێناوییەکەی یەککەمیان دروستەیەکی سینتاکسیی (پێدەچێت دروستەیەکی سیمانتیکیی) کراوەی هەیە. بەم پێیە، سەرەنجامی ڕاستەوخۆی جیاوازییە سینتاکسیی و سیمانتیکییەکان لە دروستبوونی سینتاکسیی ڕستە سەرجێناوییەکانیاندا بەشێوەیەکی باوەڕپێکراوو بەبەڵگە ڕونکراوەیەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا، کە سەری ڕستەی سەرجێناویی لە زمانی کوردییدا بەگشتیی، وەك ئەوەی ڕستەسەرجێناوییەکەی زمانی ئینگلیزیی، کەرەستەیەکی نائامارژەییە، من وای بۆدەچم، کە پرۆسەی هاونیشانەکردن لە زاری سلێمانییدا، بە پێچەوانەی ئەوەی زمانی ئینگلیزییەوە (بڕوانە (٢٦)، لەسەر ئاستی L F′ جێبەجێببێت، نەك لەسەر ئاستی LF . چونکە بەستنەوەی سەرجێناویی لە S′ دا، هەر وەك چۆمسکیی داوایدەکات، بێ ناوەڕۆك نییە. بەشی کرداری ڕستەی سەرجێناویی ئارگومێنتە دەرەکیی pro و ئارگومێنتە ناوەکیی (کلیتیکیی) ەکانی خۆی هەیە. کلیتیك و بکەرە سفرەکە مەرج و پێویستییە بنەماییە بابەتییەکان[941] جێبەجێدەکەن و لێکدانەوەیەکی واتایی بە ڕستەکە دەدەن.

٢٨- (ا) ئەو ئارامەی، کە p ro تۆ دەناسێت، ... لەسەر ئاستی L F
i j i i

(ب) ئەو ئارامەی V ′′ comp کە pro تۆ دەناسێت، ...
j j j

چۆن ئەو ڕاستییە پاساویدەدرێتەوە یان بەبەڵگە دەسەلمێنرێت، کە پرۆسەی هاونیشانەکردن لەسەر ئاستی LF′ جێبەجێدەبێت و دێتەدییتن نەك لەسەر ئاستی LF ؟

---

[940] Restriktivität

[941] ϑ -Kriterien

سەری ڕستەی سەرجێناویی وەك كەرەستەیەكی [ -d efinit ] لەڕووی سیمانتیكییەوە وەچەپێكهاتەیەكی كراوەیە. ڕستیلەی ڕستەی سەرجێناویی ئەو ڕستەیەیە، كەهەواڵێك/ زانیارییەك دەربارەی سەری ڕستەسەرجێناوییەكە دەدات. بۆیە باوەڕپێكراوە، گەر وای دابنێم، كە ڕستیلەی ڕستەی سەرجێناویی ناشێت پێكهاتوویەكی كراوەبێت. لەبەرئەوەی وشەی پرسیار بۆنموونە ناوەرۆكێكی نادیاری هەیە، ڕستیلەی ڕستەی پرسیار نابێت و ناتوانێت ڕستەیەكی پرسیاربێت.

ئەو بانگەشەی گریمانەیەی سەرەوە دەتوانرێت (ا) لەو ڕێیەوە پشتیبگیردرێت، كە ڕستەی سەرجێناویی لەسەر ئاستە بەرزەكانی دیكە وشەیەكی پرسیار یان چەند وشەیەكی پرسیاری تێدابێت (بڕوانە لێكۆڵینەوەو ڕوونكردنەوەكانی داهاتوو). دووهەمییش، ئەگەر من بەبەڵگەی ئەزموونبەند بییسەلمێنم، كە ئاستی LF´ مەرجی داڕشتەیی[٩٤٢] ڕستەی سەرجێناویی زمانی كوردییە، دەیشتوانم بانگەشەی ئەو گریمانەیە بسەلمێنم، كە پرۆسەی هاونیشانەكردنەكە دەبرێتە ئاستی LF´ . ئەمە ئەوەیش ڕووندەكاتەوە، بۆچیی چەند وشەیەكی پرسیار لە ڕستیلەیەكی ڕستەی سەرجێناوییدا بە یان بەبێ قورساییخستنەسەرێكی بەرامبەریی و پێچەوانەوە[٩٤٣] ڕێپێنەدرێت. دووهەمین پاساودانەوە یان سەلماندن پەیوەستە بە ڕستەكانی (٢٠) ەوە یان بەو ڕستانەوە، كە لەم چەشنەن. من گوتم، كە ڕستەكانی وەك (٢٩) ن، لەبەر نەبوونی یەككگرتنەوەو ڕێكەوتنی تەواوی نێوان بكەرێكی نادیار [ - efinit ] و كردارێكی دیار [ + definit ] لەسەر ئاستی سینتاكسیی ڕێپێنادرێت.

٢٩- (ا) پیاو دەكوژرێت. (لەسەر ئاستی LF)

i j

(ب) پیاو دەكوژرێت (نەك ژن). (لەسەر ئاستی LF´)

i i

لەسەر ئاستی LF بكەرەكە نیشانەی تایبەتیی [ + definit] ی هەڵگرتووە. لەسەر ئاستی LF´ ، پاش ئەوەی كە بكەرەكە بەتایبەتیی قورسایی بەرامبەریی و پێچەوانەی دەخرێتەسەرو ئاوازەكەی لەكۆتاییدا دەشكێنرێتەوەو دەبڕدرێت[٩٤٤] ، بەشێوەیەك لەڕووی فۆنۆلۆژییەوە جیادەكرێتەوە، كە بە سیمانتیكیی یان لەڕووی سیمانتیكییەوە دیاریی

---

[٩٤٢] Repräsentationsbedingung

[٩٤٣] kontrastive Betonung

[٩٤٤] Intonationsbruch

و دەستنیشانبکرێت. بەم واتاو ناوەڕۆکەوە، ناوە دیاریکراوو دەستنیشانکراوەکەی <پیاو> بەرامبەر بە ناوی <ژن> دەوەستێتەوە، کە ئەویش لە ڕووی سێمانتیکییەوە دیاریکراوو دەستنیشانکراوە. قورساییخستنەسەرە بەرامبەریی و پێچەوانەکە[٩٤٥] لە (٣٠) دا پەیوەست بە وشەی پرسیارەوەیەو لەبنەڕتدا گۆکردنێکی وەك ئەوەی سەرەوەی هەیە؛ چونکە ئەم چەشنەی قورساییخستنەسەرە، لەتەك پێویستیی فۆنۆلۆژیی دییکەدا، نیشانەی سێمانتیکیی "دیاریکراو (دیار)"[٩٤٦] ی وشەی پرسیارە "نادیاریکراوەکان (نادیارەکان)"[٩٤٧] دەردەبڕێت.

٣٠- ئەو ئارامەی، کە کێ دەناسێت، ... ؟ (وشەی پرسیارەکە قورساییەکی تایبەتیی و جیای خراوەتەسەر)

ئەو ڕستانە بەتەنها ئەوە نیشاننادەن، کە ئاستی LF´ مەرجی داڕشتەیی ڕستەی سەرجێناویی کوردیین، بەڵکو پێشبینیی ئەوەیش دەکەن، کە دەتوانن بەیڕەویی مەرجە فۆنۆلۆژییەکانیش بکەن. چونکە (ا) هەردوك LF و PF سەر بە پێکهاتەی لێکدەرەوەن[٩٤٨] و (ب) داتاکانیش خۆیان دەرییدەخەن، کە پەیوەندییەکی تەسك و توند لەنێوان پێکهاتەی سینتاکس و پێکهاتەی فۆنۆلۆژیدا بەدییدەکرێت.
ئەگەر من ئاستی LF وەك مەرجی داڕشتەیی[٩٤٩] ڕستەی سەرجێناوی کوردیی پەسەند بکەم، ئەوا دەبێت ڕستەکانی (٢٩) و (٣٠) لەسەر ئەم ئاستە تەواوبن و کۆتاییان پێبێت؛ پێش ئەوەی بگەنە ئاستی LF´. لەبەرئەوەی ڕستەکانی (٢٩) و (٣٠) لەسەر ئاستی LF´ ڕێیانپێدەدرێت، دەبێت ئەم گریمانەیەم ڕاست نەبێت. بیری هێنانەکایەی پەیوەندیی هاونیشانەیی[٩٥٠] لەسەر ئاستی LF´ بۆیە لەگەڵ هاونیشانەیی بەڕێکەوت[٩٥١]دا گونجاوە، چونکە سەری ڕستە سەرجێناوییەکەی لە بنەڕەتدا [-definit] ە، لەسەر ئەم ئاستە کەرەستەیەکی ئامـاژەدەرە[٩٥٢]. ئەمەیش لەبەرئەوەیە، کە لە تیۆرییەکی ڕێکەوتنی

---

[٩٤٥] kontrastive Betonung

[٩٤٦] die definite semantische spezifikation

[٩٤٧] indefinit

[٩٤٨] interpretative Komponente

[٩٤٩] Repräsentationsbedingung

[٩٥٠] Idee der Herstellung der Korreferenzbeziehungen

[٩٥١] die zufällige Korreferenz

[٩٥٢] referentielles Element

بەڕێکەوتدایە، ئەگەری ئەم جۆرە بەستنەوەیەی پەیوەندیی[953] هەیە؛ پەیوەندییە بەستنەوەییەکەیش کاتێك دەبێت، کە بتوانرێت لێکدانەوەیەکی ئاماژەیی[954] بە سەری ڕستەی سەرجێناوییەکە بدرێت و بخرێتەکی. گونجاویی ئەنجامەکانی هەردوو بیرەکە ئاماژەو نیشانەیەکی دیکەیە بۆ ڕاستیی هەردوو گریمانەکەی، کە لەسەرتادا بانگەشەیان بۆکرا.

## ٧/٧) ئایا ڕستە سەرجێناوییەکانی زمانی کوردیی وەك گواستنەوەی وشەی پرسیار[955] شییدەکرێنەوە؟

ئەو کەرەستەیەی، کە لە ڕستەی سەرجێناوییدا گوێزراوەتەوە، ئەو سەرە جێناوییەیە[956]، کە لە ڕستەشکاوەکە دەرهێنراوەو هێنراوەتە پێشەوە[957]. گونجاو لەگەڵ نیشانەتایبەتییەکانی وەچەدیارییکردنی کردارەکەدا ڕستییلەی ڕستەسەرجێناوییەکە[958] شوێنپێیەکی تێدایە، کە شوێنی بنەڕەتیی سەرەجێناوییە گوێزراوەکەیە. بۆیە ڕستەیەکی سەرجێناویی ئەم دروستەیەی خوارەوەی بۆدادەنرێت و دەخرێتەکی.

٣١- پەیوەندیی دروستەیی لە هێڵکارییدا[959] (ڕستەی سەرجێناویی)




ئەو ژنەی، کە ئەو [ e ] بینیی.

[953] Bindungsrelation

[954] referentielle Interpretation

[955] Wh-Bewegung

[956] R-Pronomen

[957] extrahiert

[958] R-Klausel

[959] strukturelle Konfiguration

## ٧/٧-١) شییکرنەوەی کلیتیك (جێناوی لکاوی بەرکار)

ئـەو کلیتیکـەی لـە فۆرمـی ئـارگومێنتێکی نـاوەکییدا دەردەکـەوێت، داواکـاریی و پێویسـتییەکانی نیشـانەتایبەتییەکانی وەچـەدیارییکردنی کردارەکـەی و شـییکردنەوەی گواستنەوەیی ڕستەی سەرجێناویی کوردیی بەرپەرچدەداتەوە.

٣٢- ئەو کۆچەرانەی، کە جەندرمەکان زۆر t ئازاریاندەدان، pro دوو ڕۆژە لەم ناوچەیە نەماون.

j j i j i j i

٣٣- دروستەی سینتاکسیی ڕستەکە




## ٧/٧-٢) شییکردنەوەی pro

کـاتێك بکـەری ڕسـتیلەی ڕسـتە سـەرجێناوییەکە لەلایـەن سـەری ڕستەسـەرجێناوییەکەوە دەبەسـترێتەوە، لەسـەر ئاسـتی ڕووکـەش بکەرەکـە وەك کەرەسـتەیەکی فەرهـەنگیی

نامێنرێتەدییتن و بەرجەستەناکرێت[٩٦٠] (نابیسترێت). بکەرە جێناوییە سفرەکە پێویستیی و داواکارییەکانی بەشی کردارەکەی دەهێنێتەدییتن و بەئاشکرا بەرپەرچی شییکردنەوەی گواستنەوە دەداتەوەو پووچەڵیدەکاتەوە.

٣٤- [[ ئەو کۆچەرانەی ]، [ کە ] [ pro دوێنێ کۆچیانکرد ]]، ...
i i i

٣٥- پەیوەندییە دروستەییەکان لە هێڵکاریی ڕستە سەرجێناوییەکەدا




بەم شییکردنەوانەم ئەو دروستەسینتاکسییەم بۆ ڕستەی سەرجێناویی زمانی کوردیی سەلماند، کە ئاکاریی تایبەتیی زمانەکەمانە. تاقییکردنەوەی ئەوەی، کە ڕستە سەرجێناوییەکانی زمانەکەمان ڕێسا جیهانییەکانی وەك مەرجەکانی هاوسێیەتییان[٩٦١] بریندارکردبێت یان نا وە بە چ ڕیوشوێنێك زمانەکەمان مامەڵەی لەگەڵ ئەو مەرجانەدا کردووە، چەند بەشێکیان ڕوونکرانەوە. بەڵام ئەم دباردانەی لای خوارەوە پێویستییان بە لێکۆڵینەوەو دەرخستنێك هەیە.

---

[٩٦٠] wird es nicht lexikalisiert

[٩٦١] Subjazenzbedingung

## ٨/٧) دوو دیاردە

### ٨/٧-١) پێکهاتووی تەڵەی مشك[٩٦٢]

ئەو پێکهاتووانەی، کە شوێنی comp ەکەیان فریزێکی تێدایەو بەتەواویی لەگەڵ سەری ڕستەسەرجێناوییەکەدا ڕێکناکەوێت و یەکناگرێتەوە[٩٦٣]، لە کاتی "ڕۆس"[٩٦٤] ەوە بە pied piping ناسراوە. لەم پێکهاتوانەدا وا دەردەکەوێت، کە نەك بەتەنها جێناوی ڕستەی سەرجێناویی، بەڵکو گشت ڕستەکە ( S2 )، گوێزرابێتەوە بۆ شوێنی comp .

36- Ein Umstand [S′ [comp [ S′ Hans immer [S′ [comp [S den zu berücksichtigen]]]] vergessen hat ]]

37- ئەو دروستەیەی لە (٣٦) ەوە هەڵگوێزراوە

Ein Umstand, den Hans immer zu berücksichtigen vergessen hat.

37- پێکهاتووی تەڵەی مشك

Ein Umstand, den zu berücksichtigen Hans immer vergessen hat.[965]

دروستەی وەك پێکهاتووی تەڵەی مشك (٣٨) لە زمانی کوردیدا لە نیشانەتایبەتییەکانی وەچەدیارییکردنی[٩٦٦] پێکهاتووە پێشخراوەکانی بەقورسایخستنەسەرەوەی[٩٦٧] هەیە، کە لە سەری ڕستەیەکی سەرجێناوییدا شکاوەتەوە[٩٦٨].

---

Rattenfänger-Konstruktion, pied piping ٩٦٢

nicht übereinstimmt ٩٦٣

Ross (1967) ٩٦٤

Grewendorf (1985:102-103) ٩٦٥

Subkategorisierungseigenschaften ٩٦٦

Fokus-Konstruktion ٩٦٧

in einem R-Kopf eingebetet ٩٦٨

پێشـخراوەکە بـە قورسـاییەکەیەوەو ڕسـتە شـەقکراوەکە، هــەر وەك بینییمـان، هیـچ نیشـانەیەکی گواسـتنەوەی وشـەی پرسـیار نیشـانناداەن. بۆیـە هیـچ هـۆو هۆکـارێکم نییـە، وەهای دابنێم، کە ئەم چەشنە ڕستانەی لای خوارەوە گواستنەوەی پێکهاتوویان تێدابێت.

٣٨- [[ ئەو ژنانەی ] [ V´´ ] comp [ کە ] V´ [منداڵەکانیان t V´ [دایەن t پەروەردەیاندەکەن]]]]، ...

## ٢-٨/٧) بڕین یان بەسەردا پەڕینەوە[٩٦٩]

ڕسـتەی پرسـیار، کـە یاسـای گواسـتنەوەی " α بجوولێنـەی" لەتـەکدا جێبـەجێدەکرێت، شـوێنپێیەکی لـە جێی وەچەپێکهاتـە گوێزراوەکـەدا تێدایـە. پڕۆسـەی هاونیشـانەکردنەکە[٩٧٠] ئەو پەیوەندییە دەردەبڕێـت، کـە شـوێنپێیەکەو وەچەپێکهاتەکـە سـەربەیەکن. لـە هـەندێك لـە دروسـتە تایبەتییـەکانی ڕسـتەدا، کـەتیایاندا بـاز بەسـەر جێنـاوە هاونیشـانەکەدا[٩٧١] دراوە، دیاردەی "بڕین" بەدییدەکرێت.

39- [[ John ] [who [[his wife] loves [e]]]]
i i i j i

ئـەو نموونەیـەی لـە "سـافیر"[٩٧٢]ەوە وەرگیـراوە، دەریدەخـات، چـۆن ئـەو جێنـاوە سەرجێناوییە[٩٧٣] گوێزراوەیـە (ئۆپـەراتۆر)[٩٧٤] بـازی بەسـەر جێنـاوە خۆییەکـەدا[٩٧٥] داوە. بـەپێی

[٩٦٩] Crossover

[٩٧٠] der Koindizierungsprozeß

[٩٧١] korreferente Pronomen ist übersprungen

[٩٧٢] Safir (1986:668)

[٩٧٣] R-Pronomen

[٩٧٤] Operator

[٩٧٥] Reflexivpronomen

سافیر ئەم جێناوەی ڕستە سەرجێناوییەکان، کە لە سەرێکی ئاماژەنەدری[٩٧٦] ڕستەی سەرجێناوییدا شکاوەتەوە[٩٧٧]، سنووربۆدانراوو دیارییکراوە[٩٧٨].

40- * [[a man] [who [[his wife] loves [ e]]]]
         i        i   i   j              i

تاوەکو ئێستا ڕستەی کوردیی وەك ڕستییلەیەکی ڕستەی سەرجێناویی شییکرایەوە، کە لە سەری ڕستە سەرجێناوییەکەدا شکاوەتەوە. پەیوەندیی ڕێکەوتن[٩٧٩] لەنێوان سەری ڕستەسەرجێناوییەکەو کلیتیکە جێناوییەکەدا، کەواتە ئەو پەیوەندییەی هەردوو ڕەگەزەکە تێیدان، ڕێ بە گریمانەی هیچ جۆرێك لە گواستنەوە نادات. هۆی ئەمەیە دیاردەی بڕین یان بازدان بەسەردا لە زمانەکەماندا بەدییناکرێت (بڕوانە (٤٢)).

٤٢- [[ ئەو پیاوەی ] V´´ [comp [کە] V´ [کوڕەکەی t پێشمەرگەیە، ...]]]]

## کورتەو پوختەو ئەنجاملێکدانەوە:

لێکدانەوەی ڕستە ئاڵۆزەکان[٩٨٠] کەرەستەی چەند سنووربۆدانان و مەرجێکن[٩٨١]. ئارگومێنتە هاونیشانەییەکانی[٩٨٢] ڕستە ئاڵۆزەکان، پێویستە بۆ نموونە هەمان گۆکردنی ڕێزمانییان هەبێت. چونکە گۆکردنە ڕێزمانییەکان جڵەوی ئەم جۆرەی پەیوەندیی هاونیشانەو ڕێکەوتنیان گرتووە[٩٨٣] و بەڕێوەیاندەبەن.

بۆ لێکدانەوەی جێناوی سفرو جێناوی کلیتیکیش سنووربۆدانانێك و مەرجێك هەیە، کە پەیوەندییەکانی هاونیشانەو ڕێکەوتنیان لە لایەن گۆکردنە ڕێزمانییەکانەوە -بکەر لەگەڵ

---

nicht-referentieller R-Kopf [٩٧٦]

eingebetet [٩٧٧]

eingeschränkt [٩٧٨]

Kongruenzbeziehung [٩٧٩]

komplexe Sätze [٩٨٠]

Einschränkungen [٩٨١]

korreferente Argumente [٩٨٢]

Korreferenzrelation [٩٨٣]

بکەرو بەرکار لەگەڵ بەرکار- دیاریکراون. ئەم مەرج و سنووربۆدانانەی لەلایەن "ڕۆز" و "ولیامز" و "گوودال"[984] ەوە بۆ ڤاریابڵەکان[985] دانراوە، لە (٤٣) دا خراوەتەڕوو.

٤٣- مەرجی بڕینی سنووری پێکهاتووەکان A TB[986]

لە دروستەیەکی هاوتەریبیی P، کە لە پێکهاتەکانی S 1 و S2 دروستبووە، دەبێت ئارگومێنتێکی سفری پێکهاتەی ڕستەیەکیان لەگەڵ ئەو ئارگومێنتەی پێکهاتەی ڕستەکەی دیکەیاندا هاونیشانەبێت، کە هەمان گۆکردنی ڕێزمانیی ئەوەی پێشووی هەیە.

ئەم مەرجی دیاریکردنە مەرجێکە بۆ کوانتۆرە جیاکراوەو دەرهێنراوەکان[987]. کەواتە ڤاریابڵەکان کەرەستەی ئەم مەرجەن و پەیڕەویی ئەو دەکەن. بەڵام زاری سلێمانی هیچ ڤاریبلێکی نییە؛ چونکە زمانەکەمان ڕێ بە ڕستەی لەم چەشنەی لای خوارەوە نادات.

٤٤- (ا) * نەوزاد، e بۆ قوتابخانە چوو ϕ.
i i i

(ب) * e بۆ قوتابخانە چوو ϕ، نەوزاد.

هەر ئارگومێنتێك، کە لەلایەن سەری ڕستەی سەرجیناوییەوە ئاڕاستەی وەچەپێکهاتەیی دەکرێت، دەتوانێت لەگەڵییدا هاونیشانە بێت. ئارگومێنتەدەرەکییەکەی، لەگەڵ سەری ڕستەسەرجێناوییەکە هاونیشانەیە، لەسەر داڕشتەی ڕووکەش هیچ هێنانەدییتن و بەرجەستەبوونێکی فۆنەیتیکیی نییە. ئەو ئارگومێنتە ناوەکییەی، لەگەڵ سەری ڕستەسەرجێناوییەکە هاونیشانەیە لە فۆڕمی کلیتیکدایە. ئەم دوو کەرەستەیە سەر بە ڕەگەزە جێناوییەکانی زاری سلێمانیین. وەك ئەم کەرەستە جێناوییە " pr o ی بکەر" و "کلیتیکی بەرکار" کاردانەوەیەکی کارتێکەرانەی ATB نیشاننادەن.

پێکهاتوویەکی، لەگەڵ ئەم شیکردنەوە دروستەییەدا پەیوەندییەکی هەیە، دروستەی پێکهاتووە لەتەکیەك ڕێکخراوەکانە[988]. بۆ دروستە لەتەکیەك ڕێکخراوو گونجاوەکان لە ویلیامز[989] دا ئەم مەرج و سنووربۆدانانە پێشکەشکراوە.

---

[984] Rose (1967), Williams (1978), Goodall (1984)

[985] Variable

[986] Constraint on ATB (Cross-the-Board-Construction)

[987] die extrahierten Quantoren

[988] koordinierte Konstruktionen

٤٥- مەرجی دروستەی لەتەکیەك ڕێکخراوو گونجاودا

لــــە دروســــتەیەکی لەتەکیــــەك ڕێکخــــراودا هیــــچ پەیوەندییــــەك[٩٩٠] نــــابێت بجوولێنرێت/بگوێزرێتەوەو نابێت هیچ کەرەستەیەکی لەناو پەیوەدییەکدایە دەربهێنرێت و بجوولێنرێت/بگوێزرێتەوە.

46- John picked and I washed and Layla will prepare these grapes.

47- * John picked, and I washed some turnips, and Layla will prepare these grapes.

ئێستا ئێمە دەزانیین، کە زاری سلێمانیی "دیاردەکانی کەلێن"[٩٩١] نییشاننادات و کە ڕستەی سەرەکیی و ڕستەی وەچەپێکهاتە[٩٩٢] و بەتایبەتیی "هەر پەیوەندییەکی ڕستەی پەیوەندییەك"[٩٩٣] دروستەی سینتاکسیی هاوتەرییبیان نییەو هەریەکەیان خاوەنی دروستەی داخراوی[٩٩٤] خۆیەتی. ئەم زانیین و پێزانراوانە ڕوونیدەکەنەوە، بۆچی ئەم ڕستانەی لای خوارەوەی زمانەکەمان ڕێیانپێدەدرێت.

٤٨_ (ا) ئەمە، ئەو کەسەیە، کە p ro پاش ئەوەی لە نەوزادی دا، p ro ڕایکرد.
i i i j i i i

(ب) ئەو پیاوەی، کە ئێوە t خۆشتاندەوێت ϕ ، pro خەڵکی کوێیە؟
I i i j i j i

٤٩_ (ا) من منداڵەکان و پەروبین قاپەکان و شیرین پەرداخەکانی شت.

(ب) من منداڵەکانم شت و پەرویین قاپەکانی سڕیی و شیرین پەرداخەکانی پاککردەوە.

---

[٩٨٩] Williams (1978)

[٩٩٠] conjunct, Konjunktion, Bindewort

[٩٩١] Lücken-Phänomen

[٩٩٢] Matrix- und Konstituentensatz

[٩٩٣] jedes Konjunkt einer Konjunktion

[٩٩٤] geschlossene Struktur

(پ) کاتێك من t پاکمدەکردنەوە، شیرین پەرداخەکانی دەسڕی.
(ت) کەی دێیتەوەو چییم بۆ دێنییت؟

نموونەکانی ڕستەی ئاڵۆز دروستەی سینتاکسیی هاوتەریبیان هەیە. ئەو ڕستانە هیچ کەلێنێك[995] نیشاننادەن. بۆیە تەواو ڕاست نییە بانگەشەی ئەو گریمانەیە بکەین، کە دەتوانرێت ڕستییلەی ڕستەی سەرجێناویی وەك بکەری شاڕستە[996] (وەك لە (٥٠ (ا) دا) یان وەك بەرکاری شاڕستە (وەك لە (٥٠ (ب) دا) شییبکرێتەوە.

٥٠_ (ا) ئەو منداڵەی، کە pro دایکی t ماچکرد، باوکیی t زۆر t خۆشیدەوێت ф.

(ب) ئەو منداڵەی، کە دایکی t ماچیکرد، باوگی t زۆر t خۆشیدەوێت ф.

---

[995] Lücke

[996] Matrixsatz

# بەشی هەشت هەم

## دارشتە نادیارەکان[997] و یاساکانی LF "هێنانەپێش و قورساییخستنەسەر[998] لەگەڵ گواستنەوەی وشەی پرسیار[999]"

لەم بەشەی نامەکەمدا خۆم بە پرسیارو بابەتەکانی دارشتەنادیارەکانی "لە کوانتۆر چوو _ ڤاریابل"[1000] یان "کوانتۆر _ ڤاریابڵ" ەوە خەریکدەکەم. چونکە لەگەڵ ئەوەیشدا، کە یاساکانی گواستنەوە لە ڕستەسازیی زمانی کوردییدا بە ئاشکرا کاریگەرنین، دەتوانرێت بانگەشەی ئەو گریمانەیە بکرێت، کە ئەو یاسایانە بە نادیاریی لە زمانەکەماندا (دارشتەیان) هەیە؛ بەگوێرەی ئەو گریمانەیەو بەتایبەتیی بە شێوەیەك هەن، کە پاشان لە ئاستە بەرزەکاندا جێبەجێدەکرێن و بەئەنجامدەگەیەنرێن. بەبێ هۆ نییە، کە ئەو بابەت و کێشانەی "یاساکانی گواستنەوە"[1001] و "مەرج و سنووربۆدانانەکانی یاساکان[1002]" (جوڵاندنی وشەی پرسیارو ڕستەی شەقبوو[1003] و بەتایبەتیی "مەرجی دورگەیی[1004]" ی ڕۆس و "مەرجی هاوسێیەتیی[1005]" چۆمسکیی)، کە لەلایەن هوانگ[1006] ەوە لێیان کۆڵراوەتەوە، ناوەندی ئەم شیکردنەوەیەمن.

---

[997] abstrakte Repräsentationen

[998] Fokus-Regeln

[999] Wh-Bewegung

[1000] Quasi-Quantor- Variable-Repräsentationen

[1001] Bewegungsregeln

[1002] Regel-Beschränkungen

[1003] Spaltsätze

[1004] Island constraint

[1005] Subjacency Condition

[1006] Huang (1982)

## ٨/١) یاساکانی گواستنەوە

### ٨/١-١) یاساکان و مەرج و سنوورەدانراوەکان

یاساکانی گواستنەوەی ڕستەی پرسیارو ڕستەی شەقبوو کەرەستەی ئەو مەرج و سنوورەدانراوانەی سەرەوەن، کە هەر ئێستا ناویانبرا. پێناسەی مەرجە شوێنییەکان[١٠٠٧]، بەهۆی جوڵاندن و گواستنەوەی ئاشکرای ناو ڕستەسازیی، جۆرێک لە وابەستەیی دیارییکراوی لەنێوان شوێنە دروستەییەکاندا[١٠٠٨] تێدایە. ئەمانە، کە پەیوەندیی "ئۆپەراتۆر ـ ڤاریابل"[١٠٠٩] ن، کاتێك پێکدێن و دێنەئاراوە، کە یاسایەکی گواستنەوە لە ڕستەسازییدا یان لە پێکهاتەی LF[١٠١٠] دا جێبەجێبکرێت.

یاساکانی گواستنەوە، کە پەیڕەویی ئەو جۆرە مەرج و سنوورەدانراوانە دەکەن، دەتوانرێن لەڕێی ئەو چەشنە پەیوەندییە دروستەییانەوە پەسندبکرێن، کە گونجاوترین و ڕاست ترین تایبەتییەکانی پێکهاتووەکانی ڕستەی پرسیارو ڕستەی شەقبووی زمانی کوردییمان دەدەنێ.

ئەو پرسیارانەی پەیوەست بەم بابەت و کێشەیەوەن و بۆ ئێمە گرنگن، ئەمانەن:

(ا) ڕەوش و بوونی ئەو مەرج و سنوورەدانراوە شوێنییانە لەو زمانانەی وەك چینیی و کوردییدا چۆنن، کە تیایاندا نە لە دروستکردنی ڕستەی شەقکراودا گواستنەوەو جوڵاندنێکی بەرجەستەو لەڕوو هەیەو نە وشەی پرسیار لە ڕستەکانیاندا دەگوێزرێتەوە؟

(ب) تا چ ڕادەیەك زمانی کوردیی لە زمانی چینیی جیاوازە؟

### ٨/١-١-١) یاساکان

یاساکانی گواستنەوە لە ناوەندو چەقی ئەم بەشەدان. دووپاتکردنەوەیەکی ئەم یاسایانەو ڕوونکردنەوەی ئەو سنووربۆدانانەی پێیانەوە بەستراون، لێرەدا پێویستن. ئەو یاسایانەی گواستنەوە، کە لەژێر سەرناوی " α بجوولێنە" دا کۆکراونەتەوە، گرنگ ترین ئەو یاسایانەن.

١ـ α بجوولێنە

---

١٠٠٧ lokale Beschränkung

١٠٠٨ strukturelle Positionen

١٠٠٩ Operator-Variable - Relation

١٠١٠ LF-Komponente

(ا) فرێزی ناویی بجوولێنه (بگوێزەرەوە)
(ب) فرێزی وشەی پرسیار بجوولێنه
(پ) بەرزکردنەوەی کوانتۆرەکان

**فرێزی ناویی بجوولێنه:**
فرێزی ناویی بجوولێنه، یاسایەکە، کە لە ڕێیەوە فرێزێکی ناویی بۆ جێگەیەك دەگوێزرێتەوە، کە کەرەستەی ڕێسای ڕەگەزە بۆشەکانە ECP و کەرەستەی ڕێسای نادیارییە Opacity Principle (OCP)[1011].

**فرێزی وشەی پرسیار بجوولێنه:**
لەڕێی ئەم یاسایەوە وشەیەکی پرسیار، کە ئارگومێنتێکی بابەتانەی سەرێکی حوکمکەرە، لە دروستەی ڕووکەشدا S-Structure لە سەرەتای ڕستەدا بەرجەستەدەبێت.

**بەرزکردنەوەی کوانتۆرەکان:**
ئەم یاسایە وەك حاڵەتێکی تایبەتیی یاسا گشتییەکەی " α بجوولێنه" دادەنرێت و مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت[1012]. یاساکە ڕکێفی مەودای کوانتۆرەکە دیاریدەکات و دروستەی ڕووکەش بە ئاستی لۆژیکەوە LF دەبەستێتەوە.

## ١/٨-١-٢) مەرج و سنوورە دانراوەکان

**٢_ سووڕیی (مەرجی سووڕیی تەواو (توند))[1013]**
یاساکانی گواستنەوە لە ژێر دەستەڵاتی مەرجی سووڕیی تەواودان. لەبەرئەوەی مەرجی هاوسێیەتیی یەکێك لە نیشانەکانی یاسا سووڕییەکانە، وەك بەشەپێکهێنەرێکی پێناسەی "سووڕییش" ناسراوە.
(ا) مەرجی هاوسێیەتیی[1014] دەڵێت:
یاسایەکی سووڕیی ناتوانێت هیچ فرێزێك لە شوێنی Y ەوە بۆ شوێنی X (یان بەپێچەوانەوە) لە دروستەیەکی وەك ئەم فۆڕمەی لای خوارەوەدا بجوڵێنێت/بگوێزێتەوە.

---

[1011] Chomsky (1971)

[1012] May (1977, 1982), Higginbotham (1983)

[1013] (strict) syclic striction, Chomsky (1973:51)

[1014] Subjazenzbedingung

3- … X … [… [ … Y …] … ] … X …
α β

لەم فۆرمەدا ئەلفاو بێتا دوو یاسای سووڕپێن

ئەو مەرج و سنووربۆدانانەی لە مەرجی هاوسێیەتییەوە هەڵگوێزراون، مەرجەکانی "دورگەی وشەی پرسیار" و "مەرجی فرێزی ناویی ئاڵۆز" ن، کە پێناسەکانیان دەتوانرێت بەم شێوانەی لای خوارەوە دابڕێژرێن:

دورگەی وشەی پرسیار:[١٠١٥]
فرێزێکی ناویی، کە بەشێکی ناڕاستەوخۆی ڕستەیەکی پرسیارە، نەدەتوانرێت پرسیاری لێبکرێت و نە دەتوانرێت بکرێت بە ڕستەی سەرجێناویی.

4- (a) John wondered who would win a gold medal.
(b) * What did John wonder who would win
(c) * The medal that John wonders who would win was the gold medal

ئێستایش بڕوانە، چۆن مەرجی دورگەی وشەی پرسیار لە مەرجی هاوسێیەتی هەڵدەگوێزرێت.

5- (a) * Which books did you ask John where Bill bought

(b) [S comp [S you asked John [S comp [S Bill bought which books] where] S] S] SS




[١٠١٥] Riemsdijk (1986:22-23)

مەرجی هاوسێیەتیی لە (٥) دا ڕێ بە II نادات. مەرجی سووڕیی تەواو پێشبینیی ئەوە دەکات:

بۆچیی III نەکراوەو نەدەکرێت؛ چونکە II تەنها پاش III ڕێپێدەدرێت.

CNPC

ناوەڕۆکی ئەم ڕێسایە دەریدەبڕێت:

لە ڕستەیەکدا، کە لەژێر ڕکێفی فرێزێکی ناویی بە سەرێکی فەرهەنگییەوەیە، ناتوانرێت هیچ کەرەستەیەك لە ڕێی یاسایەکی گواستنەوەوە دەربهێنرێت/بگوێزرێتەوە.

مەرجی CNPC ئەم دیاردانەیش دەگرێتەوە.[١٠١٦]

(ا) فرێزێکی ناویی، کە لەناو زنجیرەیەك لە تەواوکەری ناوێکدایە، نە دەتوانرێت پرسیاری لێبکرێت و نە دەتوانرێت بکرێت بە ڕستەی سەرجێناویی.

6- (a) He refuted the proof that you can´t square an ellipse.

(b) * What did he refuted the proof that you can square?

(c) * The figure that he refuted the proof that you can´t square looks a bit like an egg

(ب) فرێزێکی ناویی، کە بەشێکی ڕستیلەیەکی ڕستەی سەرجێناوییە، نە دەتوانرێت پرسیاری لێبکرێت و نە دەیشتوانرێت ڕستەیەکی سەرجێناویی لێدروستبکرێت.

7- (a) Bill found a principle which sloves the problem.

(b) * Which problem did Bill find a principle which solves

(c) * The problem that Bill found a principle which solves, was very recalcitrant

هەڵگواستنی مەرجی CNPC لە مەرجی هاوسێیەتییەوە:

8- (a) Comp [S Bill reject [NP the evidence [S´ Comp [S John did what] S ] S´] NP]S

α β

---

[١٠١٦] Riemsdijk (1986:22)

(b) * What did Bill reject the evidence that John did

9- Comp [S Susan visit [NP the store [S′ Comp [S that had which stock] S] S′] NP] S

**کەواتە دروستەی ئەو ڕستانەی، هاوسێیەتییان تێدایە، ئەمانەن:**

10_ a) … X … [ S … [ S … Y … (Wh-island)
b) … X … [ S … [NP … Y … (CNPC, SSC)

**(پ) مەرجی بکەری تایبەتیی**[1017]
**هیچ یاسایەك ناتوانێت X و Y لە داڕشتەی دروستەیی (١٠ (ب)) دا هەبێت، ئەگەر بکەرێکی تایبەتیی تێدابێت؛ بەواتا بکەرێك، کە Y ی تێدا نییەو لەلایەن X ەوە کۆنترۆڵناکرێت**[1018].

11_ a) John seems [ t to like Bill.
b) * Bill seems[ John to like t

**(ت) مەبەستی شاراوەو خشکەیی مەرجی دورگەیی**[1019]
**بەپێی ئەم مەرجە، هیچ یاسایەك نییە لە (١٢) دا X و Y ی تێدابێت، ئەگەر Y ڕستەیەکی کاتداربێت.**

12_ … X … [… Y …] … X …
13_ a) Bill is believed to be a fool.
b) * Bill is believed t is a fool

**چەند گریمانەیەك: لەکاتێکدا یاساکانی جووڵاندن و گواستنەوەی ڕستەی پرسیارو ڕستەی شەقکراو، وەك دوو حاڵەتی یاسا گشتییەکەی گواستنەوە " α بجووڵێنە"، لە**

---

١٠١٧ Specified Subject Condition (SSC)؛ Chomsky (1971, 1973, 1974, 1975, 1977)

١٠١٨ Chomsky (1977)

١٠١٩ Chomsky (1977), Propositional Island Condition (PIC)

هەندێك زمانی دیارییكراوی وەك ئینگلیزییدا لە ڕستەسازییدا جێبەجێدەكرێن و یاسكانی LF" و وشەی پرسیار بجوولێنە" و یاسای هێنانەپێش و قورساییخستنەسەر[١٠٢٠] لە زمانی چینییدا لە پێكهاتەی L F دا دێنەجێبەجێكردن، لەم پارەدا وەهای بۆدەچم، كە ئەم یاسایانە لە زمانی كوردییدا ئاشكرا لە ڕستەسازییدا كاریگەردەبن و دارشتەی نادیاریشیان هەیە.

بۆ ئەو ڕێسایانەی، كە سنووری مەودای جێبەجێكردنی ئەو یاسایانەی جولاندن و گواستنەوە دیارییدەكەن، لە زمانی كوردییدا پەنادەبرێتە بەر پێكهاتەی ڕستەسازیی و پێكهاتەی فۆنۆلۆژیی. چونكە هەر وەك نموونەكان دەریدەخەن، ڕستە كوردییەكانی ڕستەی پرسیارو ڕستەی شەقكراو هیچ نیشانەیەكی تایبەتیی ئەو دارشتە دروستەییانە نیشاننادەن، كە بۆ مەرجە شوێنییەكان[١٠٢١] گونجاون. وشەی پرسیار، بۆ نموونە، لەگەڵ كوانتۆرەكاندا هاونرخ نین و لەیەك ناچن. ئەگەری لێكدانەوەی جۆراوجۆری ڕستەیش یان لە ڕێی دروستەی سینتاكسییەوە یان لەڕێی قورساییخستنەسەری جیاوازەوەو بەیاریدەی ئاوازی فرەچەشن دەردەبڕدرێت. پرۆسەكانی بەجێناوكردن و بە كلیتیككردنن[١٠٢٢] گرنگترین مێكانیزمەكانن بۆ ئەو مەبەستە.

ئەمە ئەوە دەبەخشێت، كە مەرجی هاوسێیەتیی لە زمانی كوردییدا بە یاریدەی پێكهاتەی سینتاكسیی و پێكهاتەی فۆنۆلۆژیی چارەیكراوەو كە بەڵگەهێنانەوەكانی ئێستام لە بەرژەوەندیی ڕستەی پرسیارو ڕستەی شەقكراودا، بەواتا ئەو بەڵگانەی نەبوونی هیچ جۆرێك لە یاسای جوولاندن و گواستنەوە لەم پێكهاتووانەی ڕستەدا دەسەلمێنن، پشت بە شییكردنەوەی pro و/یان شییكردنەوەی كلیتیك[١٠٢٣] دەبەستن.

بەپێی ئەم ڕوونكردنەوەیە جیهانیی (بەجیهانییبوونی)[١٠٢٤]، مەرجی هاوسێیەتیی وەك ڕێسایەكی جیهانیی هێشتا هەر پارێزراوە. ڕوونكردنەوەكانی لێرەدا خراونەتەڕوو نیشانیدەدەن، كە هەر زمانێك بەپێی خۆی مامەڵە لەگەڵ ئەم ڕێسایە دەكات. بۆیە گەوهەرو چۆنییەتیی ڕێساكە جۆراوجۆر لێكدەدرێتەوەو جۆراوجۆر لێیتێدەگەین:

(ا) لەو زمانانەی وەك ئینگلیزییدا كاریگەرە؛
(ب) لەو زمانانەی وەك چینییدا بە شاراوەیی كاریگەرە؛
(پ) لەو زمانانەی وەك كوردییدا سڕو كپە (حازرو بزرە)[١٠٢٥].

---

١٠٢٠ Fokus

١٠٢١ lokale Beschränkungen

١٠٢٢ Pronominalsierung und klitisierung

١٠٢٣ pro- und/oder Klitikanalyse

١٠٢٤ Universalität

١٠٢٥ effektiv, stillschweigend effektiv, stillschweigend

کەواتە لەو زمانانەدا، کە یاساکانی گواستنەوە لە سینتاکسیاندا بە ئاشکرا جێبەجێناکرێن و خاوەنی pro و پرۆسەی بە کلیتیککردنن، ئەو ڕێسایە حازرو بزرە. سەرەنجامی ڕاستەوخۆی ئەم ڕاستییانە بونیی بۆشایی و شوێنێکی فراوانە بۆ کارکردنی پێکهاتەی ڕستەسازیی و پێکهاتەی فۆنۆلۆژیی ڕێزمانی زمانی کوردیی.

## ٢/٨) دارشتەی نادیاری کوانتۆرو ڤاریابڵ لەو زمانانەدا، کە گواستنەوەی ئاشکرایان لە ڕستەسازییدا نییە

هەبوونی یاسای یەککەمی LF، کە " α بجووڵێنە" یە، لەڕێی هەلومەرجەکانی لێکدانەوەی ڕستەو بەیاریدەی فۆرمە لۆژیکییەکەی، بنەمایەکی هەیەو جێبەجێدەکرێت. هەندێك جیاوازیی لێکدانەوەی واتای ڕستەی پرسیار دەگێردرێتەوە بۆ فراوانی مەودای[١٠٢٦] لە کوانتۆر چووەکان[١٠٢٧]، کە ڕستەشکاوەکە[١٠٢٨] یان تەواوی ڕستەکە یان بە سەرپشکیی[١٠٢٩] یەکێك لەو دوانەی لە باوەشگرتووەو لە ڕکێفییدایە.
ئەم جۆرە جیاوازیانەی کوانتۆرەکان وابەستەی کرداری سەرەکیی( ڕستە) ن[١٠٣٠]. ئەگەر کردارەسەرەکییەکە داوای ڕستەیەکی پرسیاری تەواوکەرانەی[١٠٣١] کرد، ئەوا ڕستەکە وەك بانگەشەی گریمانەیەك (هەواڵێك)[١٠٣٢] لێکدەدرێتەوە، کە پرسیارێکی ڕاستەوخۆ[١٠٣٣] وەردەگرێت (١٤)؛ ئەگەر کردارە سەرەکییەکە ڕێ بە هیچ ڕستەیەکی پرسیاری ڕاستەوخۆ نەدات، ئەوا تەواوی ڕستەکە (گشت ڕستەکە) بە ڕستەی پرسیار لێکدەدرێتەوە (١٥)؛ ئەگەر کردارە سەرەکییەکە سەر بە پۆلی ئەو کردارانە بوو، کە سەرپشکیی ڕێ بە ڕستەیەکی پرسیار *وەك تەواوکەرەکەی بدات*، ئەوا ڕستەکە بەهەردوك واتاکەوە لێکدەدرێتەوە (١٦)[١٠٣٤].

---

١٠٢٦ Reichweite

١٠٢٧ (Quasi) Quantors

١٠٢٨ eingebeter Satz

١٠٢٩ optional

١٠٣٠ Matrixverb

١٠٣١ Fragekomplementsatz

١٠٣٢ Behauptung, claim

١٠٣٣ direkte Frage

١٠٣٤ Hunag (1982: 371-372)

14- Zhang wen wo [shei mai-le shu]]
پەرتووكەكان كڕيى كێ لەمن پرسياريكرد ژانگسان
(ژانگسان پرسياريلێكردم، كێ پەرتووكەكانى كڕيى؟)

15- Zhangsan xiangxin [shei mai-le shu]]
پەرتووكەكان كڕيى باوەڕدەكات ژانگسان كێ
(ژانگسان لەو باوەڕەدايە، كێ پەرتووكەكانى كڕيبێت؟)

16- Zhangsan zhidao [shei mai-le shu]]
پەرتووكەكان كڕيى كێ زانيى ژانگسان
(ا) كێ، ژانگسان زانيى پەرتووكەكانى كڕيى؟)
(ب) ژانگسان زانيى، كێ كتێبەكانى كڕيى؟)

هەلومەرج و ئەگەرى لێكدانەوە جياوازەكان ڕێ بەوەدەدەن، كە فۆرمە لۆژيكييەكانى (١٧_١٩) بخرێنەتەك ڕستەكانى (١٤_١٦).

17- [Zhangsan wen wo [shei X [X mai-le shu]]]
(ژانگسان پرسياريلێكردم كام X ە، X پەرتووكەكانى كڕيى)

18- [Shei X [Zhangsan xiangxin [X mai-le shu]]]
(كام X ە، ژانگسان لەو باوەڕەدابوو X پەرتووكەكانى كڕيى)

19- (a) [Zhangsan zhidao [shei X [X mai-le shu]]]
. (ژانگسان زانيى كام X ە، X پەرتووكەكانى كڕيى)

(b) [Shei X [Zhankgsan zhidao [X mai-le shu]]]
(كام X ە، ژانگسان زانيى X پەرتووەكەكانى كڕيى)

پاساودانەوەى[١٠٣٥] هەبوونى ياساى LF و لەتەكييدا سەلماندنى داڕشتەيەكى ناديارى كوانتۆر_ڤاريابل[١٠٣٦]، لەڕێى مەرج و سنووربۆدانانە شوێنييەكانى[١٠٣٧] سەرەوە كراون. ئەگەر

---

[١٠٣٥] Rechtvertigung

یاسای LF " α بجووڵێنە" لەڕێی دورگەی سینتاکسییەوە[1028] ڕێی لێبگیرێت یان نا، وە ئەگەر یاساکە جۆرێك لە پێکهاتووی دورگەی وشەی پرسیار[1039] دروستبکات یان نا، پشتگیریی ئەم یاسای جوڵاندنە نادیارە دەکات.

لەم دوو تێبینییەوە ئەوەمان بۆدەردەکەوێت، کە ئەو پێکهاتووە دورگەییانەی وشەی پرسیاریان تێدایە، نەبوونەکراون: تێبینیی یەککەم ئەوەیە، کە ئەو ڕستەی پرسیارە ڕاستەوخۆیەی، ڕستەتەواوکەرە[1040] بەرکارییەکەی[1041] ڕێپێدەدرێت؛ تێبینیی دووهەمیش ئەوەیە، کە ئەو ڕستەی پرسیارەی، ڕستییلە سەرجێناوییەکەی[1042] (٢١) یان ڕستە بکەرییە هەستدارییەکەی[1043] (٢٢) یان بابەتە هەستییەکی[1044] (٢٣) دورگەیەکی وشەی پرسیاری تێدایەو نەبوونەکراوە[1045].

20- [Zhangsan xiangxin [shei mai-le shu]]]

(ژانگسان لەوباوەڕەدابوو، کێ پەرتووکەکانی کڕیی؟ (بڕوانە (١٥))

21- * [S [NP [S′ tou le sheme de] neige ren] bei dai-le]]]

*(ئەو پیاوەی، کە چیی دزیبوو، گیرا؟)

22- *[ S [S′ Zhangsan tao-le shei] zhen kexi]

*(کە ژانگسان کێی مارەکردووە، ڕاستییەکی تاڵە؟)

*(ڕاستییەکی تاڵە، کە ژانگسان کێی مارەکردووە؟)

23- * [S [S′ Zhangsan tao-le shei ni zhidao-le]

---

[1036] eine abstrakte Operator-Variable Repräsentation

[1037] lokale Beschränkungen

[1038] syntaktische Insel

[1039] Wh-Inselkonstruktion

[1040] Komplementsatz

[1041] Objekt- (Satz)

[1042] R-Klausel

[1043] sententialer Subjektsatz

[1044] sententiale Topik

[1045] Huang (1982:371, 380 ff.)

*(كە ژانگسان كێی مارەكردووە، تۆ دەزانییت؟)
*(تۆ دەزانییت، كە ژانگسان كێی مارەكردبوو؟)

دروستەی ڕستەی وەك (٢١) لەڕێی مەرجێكی تایبەتییەوەیە، كە پەسەند نین. مەرجەكە دەریدەبڕێت، كە فرێزی ناویی تایبەتیی دیارییكراو[١٠٤٦] نابێت ڤاریابڵی ئازادیان تێدابێت[١٠٤٧]. ئەم مەرجە ڕێ لەوە دەگرێت، كوانتۆرێكی، كە لەناو فرێزێكی ناویی دیارییكراودایە، مەودای ڕكێفەكەی لە فرێزەناوییەكە تێبپەڕێت. وردەكارییەكانی دیكەی كارە زانستییەكەی هوانگ بۆ پەسنكردنی زمانەكەی لەمەڕ خۆمان گرنگ نین، بۆیە لێرەو لەم پارەمدا زۆر تر ڕوونیاننناكەمەوە.

## ٣/٨) یاساو دارِشتەكان لە زمانی كوردییدا

یاسای گواستنەوەی "وشەی پرسیار بجوولێنە" لە سینتاكسیی زمانەكەماندا جێبەجێناكرێت. ئەمەیشم لەڕێی تێڕوانین و لێوردبوونەكانمەوە سەبارەت پێكهاتووی ڕستەی پرسیار ڕوونكردەوە. ئەو پرسیارەی تا ئێستایش بەكراویی ماوەتەوە، بەم شێوەیە دادەڕێژرێت: ئایا ئەو یاسای گواستنەوەیەی لە زمانی چینییدا لە پێكهاتەی لۆژیكی ڕێزمانەكەیدا كارییگەرە، لە زمانی كوردییشدا لە هەمان پێكهاتەی ڕێزمانەكەیدا كارپێدەكرێت و كارییگەرە؟ هەبوونی یان نەبوونی ئەم یاسایە لە ڕێزمانمانەكەماندا لەم پارانەی خوارەوەدا تاووتوێدەكرێت و تاقییدەكرێتەوە:

ئایا وشەی پرسیار وەك لە كوانتۆر _ چوویەك هەڵدەسەنێنگرێت و سەیریدەكرێت؟

ئایا وشەی پرسیار وەك كوانتۆر دیاردەی مەودای ڕكێفی هەیە؟

ئایا دەتوانرێت ڕستەی پرسیار فرەچەشن و جۆراوجۆر لێكبدرێتەوە؟ خۆ ئەگەر لێكدانەوەی لەو چەشنانەی نییە، هۆو هۆكارەكانی نەبوونەكەی چین؟

زمانی كوردیی چۆن مامەڵە و ڕەفتار لەگەڵ مەرج و سنووربۆدانانەكان و بەتایبەتیی لەگەڵ مەرجی هاوسێیەتییدا[١٠٤٨] دەكات و لەبری ئەمانە چیی دیكەی هەیە؟

لە میانەی لێدوان و هەڵسەنگاندنەكانی لەمەوپێشمدا بۆم ڕوونبووەوە، كە تەنها ئەو وشەی پرسیارانەی وەك لە كوانتۆرچوو دەناسرێنەوەو دیارییدەكرێن، دیاردەی مەودای ڕكێف نیشاندەدەن و كە ئەمەیش دەبێتە هۆی ئەوەی ڕستەی پرسیار فرەچەشن لێكبدرێتەوە.

---

[١٠٤٦] spezifische NPs

[١٠٤٧] Huang (1982:404)

[١٠٤٨] Subjazensbedingung

لێکدانەوە فرەچەشن و جیاوازەکان لە بنەڕەتدا وابەستەی چەشنی پۆلی کرداره سەرەکییەکەن. کەواتە ئەم تاقییکردنەوەیەو لە تەکییدا بەڵگە بەرایی[١٠٤٩] و سەرەکییەکان دەگەرێنەوە بۆ پۆلی کردارەکان.

## ٣/٨-١) چەشنەکانی ڕستەی پرسیارو پۆلەکانی کردار

زمانی کوردیی لە بنەڕەتدا خاوەنی ڕستەی پرسیاری ڕاستەوخۆ (ی سەرەتایی) (٢٤) و ڕستەی پرسیاری ناڕاستەوخۆ (٢٥، ٢٦) یە. ڕستەی پرسیار، لە چەشنی (١٥) لەم زمانەدا نییەو نابیینرێتەوە. پۆلی ئەو کردارانەی ڕێ بە ڕستەیەکی پرسیاری ناڕاستەوخۆ دەدەن، پرسیارەکانی <پرسیارکردن> و <گوتن> ن.

٢٦_ (ا) ئارام گوڵی پێشکەش بە ساکار کرد.
(ب) کێ گوڵی پێشکەش بە ساکار کرد؟
(پ) ئارام چیی پێشکەش بە ساکار کرد؟
(ت) ئارام گوڵی پێشکەش بە کێ کرد؟

٢٥_ [ئازاد پرسیی [ ئارام چیی پێشکەش بە ساکار کرد ]]؟

٢٦_ [ئازاد گوتیی [ ئارام گوڵی پێشکەش بە کێ کرد ]]؟

ئەو وشەی پرسیارانەی دییکە، کە لە ڕستەشکاوەکاندان، گشتیان ئاکارو نیشانەی جێناوەکانیان هەیەو سەر بە ڕەگەزە جێناوییەکانن.

٢٧_ [ئازاد دەزانێت [ ئارام گوڵی پێشکەش بە کێ کرد ] ]؟
i i j j z

٢٨_ [ئازاد ویستیی [ p ro بزانێت [ کێ پەراوەکانی بە کێ فرۆشت ]]] ؟
i i i i j j z

[١٠٤٩] primäre Beweise

بەڵگەیەکی ڕاستەوخۆ بۆ ئەو ڕاستییە، ئەوەیە کە نە جێناوی پرسیار قورساییخستنەسەری وشەی پرسیاری هەیەو نە تێکڕای ڕستەکە (٢٧، ٢٨) خاوەنی ئاوازی تایبەتیی ڕستەی پرسیارە. بەڵگەیەکی ناڕاستەوخۆ بۆ چۆنایەتیی (نەوعییەتی) جێناویی جێناوی پرسیار لەو ڕستانەدا، بەکارهێنان و دەرکەوتنی ئەو کەرەستانەیە لە پێکهاتووە دورگەییە سینتاکسییەکاندا، بەبێ ئەوەی مەرجی هاوسێیەتییان بریندارکرابێت.

٢٩_ [ئەو پەرتووکانەی V´´ کە [ V´ ئازاد نەیدەزانیی [ pro t بە کێیان بفرۆشێت [ pro بە کێی بەخشین ]]]؟

٣٠_ [ئاشکرا نییە [کێ لەکێ دەدات ]]؟

پرۆسە تایبەتییەکەی زمانی کوردیی، کە لەڕێیەوە یاسائاسا ڕستەی پرسیار لە ڕستەی هەواڵییەوە وەردەگیردرێت، پشتگیرییکردنێکی بەهێزە بۆ ئەو بانگەشی گریمانەیەی سەرەوەو بۆ بەڵگە کەرەستییەکان[1050]. چونکە لەکاتێکدا کردارەسەرەکییەکەی لە پۆلی <پرسیارکردن> و <گوتن> ە، ڕێ بە ڕستەیەکی شکاوە دەدات، کە لە ڕێی قورساییخستنەسەرو ئاوازەوە شکاوەتەوەو هەڵگوێزراوە؛ کردارە سەرەکییەکەی سەر بە پۆلەکانی دیکەی کردارن، ڕێ بە هیچ جۆرێك لە ڕستەی پرسیارەشکاوەکان نادات.

٣١_ (ا) ئارام گوڵی پێشکەش بە ساکار کرد؟ (بەراوردی بکە لەگەڵ (٢٤) دا))
(ب) ئارام گوڵی پێشکەش بە ساکار کرد؟
٣٢_ (ا) ئازاد پرسیی، ئارام گوڵی پێشکەش بە ساکار کرد؟
(ب) ئازاد پرسیی، ئارام گوڵی پێشکەش بە ساکار کرد؟

٣٣_ ئازاد دەزانێت، کە ئارام گوڵی پێشکەش بە ساکار کردووە.

٣٤_ (ا) ئازاد دەزانێت، کە ئارام گوڵی پێشکەش بە ساکار کردووە؟
*(ب) ئازاد دەزانێت، کە ئارام گوڵی پێشکەش بە ساکار کردووە؟
*(پ) ئازاد دەزانێت، کە ئارام گوڵی پێشکەش بە ساکار کردووە؟
*(ت) ئازاد دەزانێت، کە ئارام گوڵی پێشکەش بە کێ کردووە؟

ڕستەکانی (٣٤) دەریدەخەن، کە بەتەنها کردارەکانی <پرسیارکردن و گوتن> ڕێ بە ڕستەی پرسیاری ناڕاستەوخۆی شکاوە دەدەن. بەڵام ئەو ڕستەی پرسیارانەی لە ڕێی

---

[1050] Bewismaterialien

قورساییخستنەسەرەوە[١٠٥١] هەڵگوێزراون، نیشانیدەدەن، کە ڕستەی پرسیارەکانی (٣١ و ٣٢ و ٣٤) سەر بە پۆلێکی تایبەتیی زمانی کوردیین و کە دانانی "قورسایی جەختخراوەسەر" (قورساییخستنەسەری بەرامبەریی و پێچەوانە)[١٠٥٢] بە هۆی سینتاکسەوە هاتووەتە ئاراوەو سینتاکس بنەماکەیەتی و بۆ ئەو مەبەستەیە.

## ٨/٣-٢) دیاردەی مەودای ڕکێف

ئاکاری خۆیی[١٠٥٣] ڕستەی پرسیارە کوردییەکان و بەستنەوەی ڕستەی پرسیاری شکاوە بە پۆلێکی دیارییکراوی کردارەکانەوەو ئەو ڕاستییەی، کە ئەم چەشنە ڕستەیە لێکدانەوەی فرەچەشن نیشاننادات _هەر وەك لە زمانی چینییدا بینییمان _، ئاماژەی ڕاستەوخۆن بۆ ئەوەی، کە وشەی پرسیاری زمانی کوردیی لە بنەڕەتدا نە کوانتۆرەو نە لە کوانتۆر _ چووەکانە. تێڕوانییێکی وردی ئەم ڕستانە دەریدەخات، کە ڕستەی پرسیاری ئەم زمانەمان بە لێکدانەوەیەکی مەودای ڕکێفەوە یان بە لێکدانەوەیەکی "دارشتەی لە کوانتۆرچوو_ڤاریابل"ەوە ڕستەی بێ واتایە یان بەرهەمەکەی دروستەی لەو چەشنەن، کە لە واتادا لایانداوە.

٣٥_ (ا) [ئازاد پرسیی [ کێ گوڵی پێشکەش بە ساکار کرد ]]؟

(ب) * [ کێ ئازاد [پرسیی t گوڵی پێشکەش بە ساکار کرد ]]؟
I I j I

(پ) * [ کێ پرسیی [ئازاد t گوڵی پێشکەش بە ساکار کرد ]]؟
I j j I

ئەگەر من وەك گریمانەیەك وەهای دابنێم، کە ڕستەی پرسیاری کوردیی دارشتەی "ئۆپەراتۆر_ڤاریابل"[١٠٥٤] ی هەیە، ئەوا بۆ ڕستەی (٣٥ (پ)) بەرهەمێکمان[١٠٥٥] دەبێت، کە

---

١٠٥١ Betonung, stress

١٠٥٢ kontrastive Betonung, contrastive stress

١٠٥٣ Echo-Charakteristika

١٠٥٤ Operator-Variable-Repräsentation

١٠٥٥ Output

ویکچوو و هاونرخی (٣٦) دەبێت، بەواتا بەرهەمەکە ڕستەیەکی پرسیار دەبێت، کە ڕستەیەکی هەواڵیی تێدا شکاوەتەوە. ئەو کاتە (٣٣ (پ)) بەم شێوەیە لێکدەدرێتەوە:

٣٦_ [ کێ پرسیی [ئارام گوڵی پێشکەش بە ساکار کرد ]]؟
z j j I I

هەر وەك دەزانین، لادان لە واتالێکدانەوە یان لە ڕێی وشەی فرەواتاوە یان بە یارمەتیی دروستەسینتاکسییەکان دەردەبڕدرێت. بۆیە چاوەڕێی هەمان دروستەی ئەو بەرهمانەی[١٠٥٦] کردارەسەرەکییەکانی لە پۆلی دییکەن، دەکەین. بۆیە وشەی پرسیار ناشێت وەك کوانتۆر بناسرێتەوەو دیارییبکرێت. لە ئەنجامی ئەمەدایە فۆرمی لۆژیکیی (٣٧) دەخرێتە تەك ڕستەی (٣٥ ( (ا)) و بۆ ئەو ڕستەیە دادەنرێت؛ ئەو فۆرمە لۆژیکییە لە هەمان کاتدا نموونەی بنەڕەتیشە بۆ ڕستەکانی دییکەی کوردیی.

٣٧_ ئازاد پرسیی، کێ گوڵی پێشکەش بە ساکار کرد؟
ئازاد پرسیی، کام X ە گوڵی پێشکەش بە ساکار کرد؟

بەپێی ڕوونکردنەوەکانم، وشەی پرسیار وەك کوانتۆرێك ناناسرێتەوەو دیارینناکرێت. لەبەر ئەمەیشە ناتوانێت دیاردەی مەودای ڕکێف دەربخات و نیشانبدات. ئەگەر هەر بمانەوێت ئەم ئاکارو نیشانەیە بخەینە تەك ئەو کەرەستەیە، ئەوا دەبێت دیاردەکە بەتەنها بە ڕستەی سەرەکییەوە یان بە ڕستەشکاوەکەیەوە بەند بێت. بڕوانە ئەم نموونانەی زمانی ئەڵمانیی، کە تیایاندا کوانتۆری nicht دەتوانێت مەودایەکی تەسك یان مەودایەکی فراوانی هەبێت.

38- (a) Der Vater will nicht, daß er sie heiratet.
باوکەکە نایەوێت، کە کوڕەکەی کچەکە بهێنێت.
(b) Der Vater will, daß er sie nicht heiratet.
باوکەکە دەیەوێت، کە کوڕەکەی کچەکە نەهێنێت.

هەمان کوانتۆرو شوێنەکەی لەو پەیوندییە دروستەییەدا[١٠٥٧]، لە زمانی کوردییدا سەرەنجامی سینتاکسیی و سێمانتیکیی جیاوازیان هەیە. بۆیەکە (٣٩ (ب)) هەمان

---

[١٠٥٦] Outputstrukturen

[١٠٥٧] der Quantor und seine konfigurationelle Position

دەربڕینی خشکەیی (٣٩ (ا)) ی نییە. لە ئەنجامی ئەمەدایە لێکدانەوەی جیاواز لەیەکیان هەیە.

٣٩_ (ا) باوکم ناتوانێت، pro بچێت بۆ کار.
(ب) باوکم دەتوانێت، pro نەچێت بۆ کار.

بە بانگەشەی ئەو گریمانەیە، کە وشەی پرسیار کوانتۆرێك یان لە کوانتۆرچوویەك نییە، نیشانەیەکی پرسیار دەخرێتە سەر هەبوونی یاسای LF "وشەی پرسیار بجوولێنە" لە زمانی کوردییدا. ئایا ڕستەی پرسیار وەك داڕشتەیەکی "کوانتۆر_ڤاریبل" شییدەکرێتەوە یان نا، هێشتا هەر پرسیارێکی کراوەیە. بۆ تاقییکردنەوەی داڕشتەیەکی وەها نادیار بەگوێرەی ئەم سەرەو ڕییزبوونە، پەنادەبەمە بەر مەرج و سنووربۆدانانە شوێنییەکان[١٠٥٨]:

پێکهاتووە دورگەییەکان:
ڕستەکانی (٤٠) ڕاژەی مەبەستەکەمان ناکەن؛ چونکە کردارە سەرەکییەکانیان سەر بە پۆلی کردارەکانی <پرسیارکردن و گوتن" ن.

٤٠_ [ pro نازانم [ کێ چیی ϕ لە کێ بردووەتەوەو [ p ro نایشمدەوێت pro بزانم [ کێ چیی ϕ لە کێ دەباتەوە ؟

گرنگ بۆ ئێمە ڕستەکانی (٤١_٤٣) ن. لە کاتێکدا ڕستەکانی (٤١) وەهامان لێدەکەن لەو باوەڕەدابین، کە مەرجی هاوسێیەتیی بریندارەدەکەن، ڕستە ڕێزماندروستەکانی[١٠٥٩] (٤١_٤٢ (ا)) بەرپەرچی داڕشتەیەکی کوانتۆر یان لەکوانتۆرچوو_ڤاریابڵ دەدەنەوەو پووچەڵیاندەکەنەوە.

٤١_ (ا) [ئازاد پرسیی [ئارام چیی بە ساکار بەخشیی ]]؟
(ب) [ئازاد پرسیی [ کێ چیی بە ساکار بەخشیی ]]؟
(ت) [ئازاد پرسیی [کێ چیی بە کێ بەخشیی ]]؟

---

١٠٥٨ lokale Beschränkungen

١٠٥٩ grammatikalisch richtige Sätze

٤٢_ (ا) [ N ئەو مەدالیایەی [ کە [ئازاد پرسیی [کیٚ t دەیبیاتەوە ] pro لە چیی دروستکرابوو ϕ ]]]]؟

(ب) [ N مەدالیایەك ] pro لە چیی دروستکرابیٚت ϕ تۆ t دەیکرییت ]]؟

(پ) [ N مەدالیایەك [ کیٚ دروستیکردبیٚت ϕ تۆ t دەیکرییت ]]؟

٤٣_ (ا) *[ ئەو مەدالیایەی [ کە [ کیٚ پرسیی [ کیٚ t دەیباتەوە، ... ]]؟
(ب) * [ ئازاد باوەڕ بەو قاوە دەکات [ کە [جەندرمەکان کێیانکوشتبیٚت ]] ؟

بۆیە ڕستەکانی (٤١) و (٤٢) ڕێیانپیٚدراوە، چونکە هیچ ڕێسایەکی ڕێزمانی کوردیی و لە تەکیشیاندا مەرجی هاوسێیەتییان بریندارنەکردووە. بەگوێرەی تێگەیشتنی من ڕستەکانی (٤١) لەگەڵ یان بەبیٚ قورسایی جەختخراوەسەر ڕێیانپێدەدرێت. کە وشەی پرسیار لەم چەشنە دروستانەی ڕستەدا نیشانەکانی جێناوی پرسیاریان *وەك لە (٤٠) دا* پێدەبەخشرێت یان پێنابەخشرێت، جێی گومانی من نییە، بەڵام وەك پرسیارێك بەکراوەیی بەجێیدەهێڵم.

ئەگەر وەك گریمانەیەك وەهای دابنیٚم، کە سەری ڕستەی سەرجێناویی لە (٤٢) دا لە V′ ەوە بەسەر V′ و V′ دا گوێزراوەتەوە، ئەوا بەمە ئەوە دەردەبڕم، کە ئەم کردەی گواستنەوەیە، بەبیٚ ئەوەی گوێی پێبدات مەرجی هاوسێیەتیی، ڕوویداوەو جێبەجێکراوە. بەڵام چونکە ئەم ڕستەیە (٤٢) (ا)) ڕستەیەکی لەڕووی ڕێزمانەوە ڕاستودروستە، گواستنەوەی سەری ڕستەسەرجێناوییەکە ڕووینەداوەو جێبەجێنەکراوە. ئەمەیش ئەوە دەبەخشێت، کە شوێنەکانی Comp هێشتا هەر بۆش و ئازادن و کە لەبەر ئەمەیە، ئەگەر ڕێزمانەکەمان ڕێبدات و ئەگەری ئەوە هەبێت، جوڵاندنی وەچەپێکهاتەی[١٠٦٠] دییکە ڕێیانپێدەدرێت. وشەکانی پرسیاری ئەم ڕستەیە لەو دەقانەدان، کە جوڵاندنی وشەی پرسیار بۆیان ناگونجێت و جوڵاندنەکەیان نەبوونەکراوە.

---

١٠٦٠. Konstituentenbewegung

(٤٢ (ا)) دەریدەخـات، کـە ڕسـتییلە سـەرجێناوییەکە[١٠٦١] ڕێـدەدات ڕسـتەیەکی پرسـیاری شکاوە یان چەند ڕستەیەکی پرسیاری شکاوەی تێدابێـت. بەپێچەوانـەوە، ڕسـتەی (٤٢ (ب)) نیشانیدەدات، کە ڕستییلە سەرجێناویەکە کاتێك دەشێت ڕستەیەکی پرسیاربێت، ئەگە سەر بە ڕستەمەرجییەکان[١٠٦٢] بێت. ئەو ڕستانەی لە (٤٣) دان و ڕێیانپێنادرێت، ئاشکرایدەکەن، کە ئەمانە کاتێك نەبوونـەکراون، ئەگـەر سـەربە ڕستەهەواڵییکان (ڕوونکـەرەوەکان)[١٠٦٣] بـن. لەمەوە ئەو ئەنجامـەم دەستدەکەوێت، کـە ڕسـتییلەی سـەرجێناویی لـە ڕووی سێمانتیکەوە نابێت ڕستەی کراوە[١٠٦٤] بێت؛ چونکە سەری ڕستەی سەرجێناوی[١٠٦٥] لە ڕووی سێمانتیکەوە خۆی وەچەپێکهاتەیەکی کراوەیە. کە سـەری ڕسـتییلەی سـەرجێناویی ڕسـتەمەرجییەکان دەشێت لەڕووی سێمانتیکییەوە ڕستەی کراوەبن، دەگەڕێتەوە بۆ مۆرکەکانی کـردار، کـە بـە یاریدەی پێشگرەمەرجییەکە[١٠٦٦] (پێشگری ویست و ئارەزووەکە[١٠٦٧]) دروستدەبێت.

ڕستەکانی (٤٣ (ا)) و (٤٣ (ب)) خاونی هـەمان دروستەی ڕستەکانی (٤٢ (ا)) و (٤٢ (ب)) و بەتایبـەتیی (٤٢ (پ)) ن. ڕسـتەکانی (٤٣)) ڕێیانپێنـادرێت، چونکـە یاسـاڵێکدەرەوەکان[١٠٦٨] بریندارەدەکـەن. ئـەم یاسـایانە، وەك مـن بۆیدەچـم، ڕسـتەی سـەرجێناویی[١٠٦٩] دەگرنـەوەو پەیوەندییان بە سەری ڕستەی سەرجێناوییەوە هەیە، نەك بە مـەرجی هاوسێیەتییەوە. چونکە ئەگـەر ئێمە ڕستەکانی (٤٣) بۆ مـەرجی هاوسـێیەتیی بگێڕینـەوە، هۆکـانی ڕێزماندروسـتیی ڕستەکانی (٤١) و (٤٢) بەبێ ڕوونکردنەوەو بێ وەڵام دەمێننـەوە. مەرجی هاوسێیەتیش ئاکام و سەرەنجامی نێواندژی[١٠٧٠] دەبێت. هـەر وەك گوتم، سەری ڕستەی سـەرجێناویی، لـەڕووی سـێمانتیکییەوە وەچەپێکهاتەیـەکی کراوەیـە[١٠٧١]، کـە پێویسـتی بـە ڕوونکردنـەوەو زانیارییەك[١٠٧٢] هەیە. ڕستییلەی ڕستە سەرجێناوییەکە ئەم ڕوونکردنەوەو زانیارییە سەبارەت

---

[١٠٦١] R-Klausel

[١٠٦٢] Konditionalsätze

[١٠٦٣] Deklarativsätze

[١٠٦٤] semantisch offener Satz

[١٠٦٥] Relativkopf (R-Kopf)

[١٠٦٦] Konjunktivpräfix

[١٠٦٧] Subjungtivpräfix

[١٠٦٨] Interpretative Regeln

[١٠٦٩] Relativsatz (R-Satz)

[١٠٧٠] paradoxe Konsequenzen

[١٠٧١] offene Konstituente

[١٠٧٢] Kommentar

بــــه ســــــه‌ری ڕسته‌ســـــــه‌رجێناوییه‌كه‌ به‌ده‌ســـــته‌وه‌ ده‌دات. بۆیـــــه‌ ده‌بێـــــت ڕســــــتییله‌ی ڕسته‌ســــه‌رجێناوییه‌كه‌ وه‌چه‌پێكهاته‌یــه‌كی، لــه‌ ڕووی ســـێمانتیك و سینتاكســــه‌وه‌ تـــه‌واو داخراوبێــت[١٠٧٣]، بــه‌واتا ڕســـته‌یه‌كی تــه‌واو فۆڕمدروســـت[١٠٧٤] بێــت، تــاوه‌كو گشــت ڕســته‌كه‌ بتوانرێت له‌ڕووی واتاوه‌ به‌ته‌واوی لێكبدرێتــه‌وه‌و لــه‌ڕووی سینتاكســه‌وه‌ فۆڕمدروســت بێــت. هــه‌رچیش سه‌باره‌ت به‌ بنیاتی سینتاكسییه‌، ده‌تــوانم بانگه‌شــه‌ی ئــه‌و گریمانه‌یــه‌ بكــه‌م، كــه‌ گشت ئه‌و ڕستانه‌ دروسته‌ی فۆڕمدروستی ته‌واو نیيشانده‌ده‌ن. كه‌واتــه‌ ئــه‌و دوو ڕســته‌یه‌ی دواییان ڕێساكانی لێكدانه‌وه‌یان بریندارکردووه‌.

كه‌ ڕسته‌ی پرسیار له‌ڕووی سێمانتیكه‌وه‌ ڕسته‌ی كراوه‌یه‌و كه‌ ئه‌م ڕسته‌كراوه‌یه‌ ناتوانێت ببێت به‌ ڕستییله‌ی ڕسته‌ی سه‌رجێناویی، لــه‌و ڕێیــه‌وه‌ ڕوونده‌كرێتــه‌وه‌و ده‌ســه‌لمێنرێت، كــه‌ هــه‌روه‌ها ئــه‌و ڕسته‌پرســـیاریانه‌ی، بــه‌هۆی قورساییخستنه‌ســه‌رو ئاوازیشـــه‌وه‌ هــه‌ڵگوێزراون (٤٤)، ڕێیانپێنادرێت و نه‌بوونه‌كراون.

٤٤_ (ا) * ئازاد باوه‌ڕ به‌و هه‌واڵه‌ ده‌كات، كه‌ پۆلیس ئارامی گرتووه‌؟
(ب) * ئازاد باوه‌ڕ به‌و هه‌واڵه‌ ده‌كات، كه‌ پۆلیس كێی گرتووه‌؟
(پ) * ئازاد باوه‌ڕ به‌و هه‌واڵه‌ ده‌كات، كه‌ كێ ئارامی گرتووه‌؟

ڕســـته‌كانی (٤٥) ده‌ریده‌خــه‌ن، كــه‌ دانــانی قورســـایی جه‌ختخراوه‌ســـه‌ر په‌یوه‌ندییـــه‌كی ڕاســته‌وخۆی بـــه‌ مه‌رجه‌سینتاكســـییه‌كانه‌وه‌ نییـــه‌. چونكــه‌ ڕسته‌شــكاوه‌كه‌ی (٤٥ (ب)) بـــه‌ قورسایی جه‌ختخراوه‌سه‌ره‌وه‌و بــه‌بێ قورسـایی جه‌ختخراوه‌ســه‌ره‌وه‌ نــه‌بوو نــه‌كراوه‌. منیـش به‌هۆی ئاكارو ئه‌ركی ئه‌و چه‌شنه‌ قورساییخستنه‌سه‌ره‌وه‌ هه‌ر چاوه‌ڕێی ئه‌م ئه‌نجامه‌ ده‌كه‌م؛ ئه‌میش ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ بۆ ئه‌وه‌ی، كه‌ قورساییخستنه‌سه‌ر ڕۆڵیی سینتاكسیی له‌ چه‌شنی دییكه‌ له‌ ڕێزمانه‌كه‌ماندا ده‌بینێت.

٤٥_ (ا) ئه‌و پیاوه‌ی، كه‌ ئارام t ده‌بناسێت، p ro كورده‌.

(ب) ئه‌و پیاوه‌ی، كه‌ ئارام t ده‌یناسێت، p ro چییه‌؟

(پ) * ئه‌و پیاوه‌ی، كه‌ كێ t ده‌یناسێت، p ro كورده‌؟

---

١٠٧٣ geschlossene Konstituente

١٠٧٤ wohlgeformt

با ئێستایش لەم ڕستانە وردببینەوەو بزانین بۆچیی مەرجەکانی SSC و PIC یان بریندارنەکردووە.

٤٦_ (ا) بۆ ئێمە ئاسانە، لە پێشدا pro کێ بگرین؟
(ب) ئەو تاوانانەی، کە ویستران بخرێنە پاڵ کێ زۆربەیان هەڵبەستراوبوون؟
(پ) ئازاد بە هیبوایە، کە ئارام بە نەوزاد بڵێت، pro بچێت بۆلای کێ؟
(ت) pro لەوەدەچێت، ئازاد بتوانێت، pro کێ بگرێت؟
(ج) باوەڕدەکرێت، کە هاوڕێ شێت بێت؟

ڕستەکانی (٤٧) وادەردەکەون، مەرجی SSC یان بریندارکردبێت. هەبوون و ئامادەبوونی بکەری سفری جێناویی "نەوزاد" و pro و هەر جۆرێکی جوڵاندن و گواستنەوەو بریندارکردنی مەرجەکانیان بەرپەرچدەداتەوە.
ڕوونکردنەوەو لێکۆڵینەوەکانم دەریدەخەن، کە زمانی کوردیی بەگشتیی گواستنەوەی وەچەپێکهاتەکانی نییە. لە وەچەپێکهاتەیەکی "وادەردەکەوێت"[١٠٧٥] ی وەك (٤٧) دا بەڵگەیەکی بابەتانە بۆ ئەوە دەبینینەوە، کە گواستنەوەی فرێزێکی ناویی لەو ڕستەیەدا پێویست نییە. نەبوونی یاسایەکی گواستنەوەی فرێزی ناویی و بوونی بکەرێکی pro دروستەیەکی سینتاکسیی وەها دەهێننە ئاراوە، کە بە هیچ جۆرێك لەگەڵ مەرجی SSC دا ناگونجێت و ڕێکناکەوێت. کەواتە ڕستەی وەك ئەوانەی (٤٨) دروستەی سینتاکسیی فۆڕمدروستیان هەیە.

٤٨_ pro لەوەدەچێت، pro بتوانێت، pro کێ بگرێت؟

بوون و ئامادەبوونی بکەرێکی جێناویی و ئەو ڕاستییەی، کە یاسایەکی گواستنەوەی فرێزی ناویی پێویست نییە، دروستەی ڕستەی لەو چەشنە پێکدێن، کە پێویستیان بە مەرجی SSC نییە.
زمانی کوردیی خاوەنی ڕستەی تەواوکەرانەی چاوگیی[١٠٧٦] نییە. مەرجی PIC ، وەك لە (٤٧) دا دەردەکەوێت، بۆ هەندێك دروستەی ڕستەی دیاریکراوی زمانەکەمان کاریگەر نییە. بۆیە بەبێ هۆو بێ بەڵگە ناتوانرێت، بانگەشەی ئەو گریمانەیە بکرێت، گوایە (٤٧ (پ)) ئەو مەرجەی بریندارکردووە.

---

[١٠٧٥] seem-Konstruktion

[١٠٧٦] Infinitiv-Komplementsatz

٤٧_ (پ) چاوەڕێدەکرا، ئەو تاوانانەی، کە pro بۆ کێ هەڵبەستراببوون، pro بە درۆبخرێنەوە؟

ئەمەیش دیسان بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی، کە پێدەچێت ڕستەسەرجێناوییەکانی (٤٣) و (٤٤) هەندێك یاسای سێمانتیکییان بریندارکردبێت، نەك مەرجی سینتاکسیی.
ڕستەی پرسیارییە ناڕاستەخۆکانی (٤١) وەچەپێکهاتەی دورگەی وشەی پرسیارن، کە هیچ پرسیارێکی دیکەیان لێهەڵنەگوێزراوە. (٤١ (ب)) و (٤١ (پ)) بە قورسایی جەختخراوەسەرەوەو بەبێ قورسایی جەختخراوەسەریش هەر پەسەندن؛ بەڵام وەك ڕستەی پرسیارە نا خۆییەکان[1077] بەتەنها بە قورسایی جەختخراوەسەرەوە ڕێیانپێدەدرێت. ئایا ئەم پێزانیینەو زانیارییە دەستکەوتووەم لاوازییەکە لە بەڵگەهێنانەوەکانمدا؟
پێکهاتەفۆنۆلۆژییەکەی ڕێزمانەکەمان هەندێك گۆکردنی (ئەرکی) سینتاکسیی، وەك هەڵگواستنی ڕستەپرسیارییەکان، جێبەجێدەکات و بەڕێوەیاندەبات. قورساییخستنەسەرو ئاواز نیشانەکانی چەشنی ڕستەی پرسیارەکە دیاریی و دەستنیشاندەکەن. لەڕێی ئەم ڕاستییە دەستکەوتوانەوە[1078] ڕووندەبێتەوە، کە دانانی چەشنێکی دیاریکراوی قورساییخستنەسەر یان ئاواز ڕژێمئاسا بۆ دروستکردنی چەشنێك لە چەشنەکانی ڕستەیە؛ کەواتە مەرج نییە بەتەنها بۆ لادان لە بریندارکردنی یاسایەکی ڕێزمان بێت. لەم پارەی داهاتوودا هەوڵدەدەم، بە نموونەوە پاساوی ئەم بانگەشەی گریمانەیە بدەمەوە.

## ٣/٨-٣) قورساییخستنەسەرو نموونەکانی ئاواز[1079]

پێکهاتەی فۆنۆلۆژیی بەتەنها گۆکردنە سینتاکسییەکان جێبەجێناکات و نایانبات بەڕێوە، بەڵکو ئەو ڕێسایانەیشی هەیە، کە لەسەر ئەم ئاستە دروستەسینتاکسییەکان دەپاڵێون[1080].
ئەم نیشانانەی پێکهاتەی فۆنۆلۆژیی بەگوێرەی ڕوونکردنەوەکانی تاوەکو ئێستام هەوێر بنەماکانی لە سروشتی پێکهاتەی گواستنەوەی ڕێزمانی کوردییدان. لە لۆژیکی زمانەکە

[1077] Nicht-Echo-Fragesätze

[1078] Fakten

[1079] Betonung- und Intonationsmuster

[1080] sie filtrieren syntaktische Strukturen

خۆیدایە، کە دانانی قورسایی جەختخراوەسەر لە زمانی کوردییدا چۆنایەتییەکی دییکەی هەیە وەك دانانی بۆ نموونە لە زمانی ئینگلیزییدا.
لە کاتێکدا قورسایی جەختخراوەسەر لە هەندێك زمانی دیارییکراودا لەو شوێنەدا دادەنرێت، کە بریندارکردنی مەرجی هاوسێیەتیی[١٠٨١] لە ئارادایە، ئەمە لە زمانی کوردییدا بەم شێوەیە نییە. ڕستەکانی (٣١_٣٤) باشترین نموونەن بۆ ئەم ڕاستییە پێزانراوە. هەر بۆیە ڕستەکانی پرسیارو چەشنەکانی دەتوانرێن تەنها بە یاریدەی قورساییخستنەسەرو ئاواز دروستبکرێن، بەبێ ئەوەی هیچ وشەیەکی پرسیار پێویست بێت یان پێویست بکات.

٤٨_ (ا) ئازاد نامە بۆ پرشنگ دەنووسێت.
(ب) ئازاد نامە بۆ پرشنگ دەنووسێت؟
(پ) ئازاد نامە بۆ پرشنگ دەنووسێت؟
(ت) ئازاد نامە بۆ پرشنگ دەنووسێت؟
(ج) ئازاد نامە بۆ پرشنگ دەنووسێت؟

ڕستەپرسیارییەکان بەبێ کۆمەك و بەکارهێنانی هیچ وشەیەکی پرسیار دروستکراون. شوێنی قورساییخستنەسەری سەرەکیی[١٠٨٢] یان هی قورسایی جەختخراوەسەر (ئەو فرێزەی هێلی بەژێردا کێشراوە) لە ڕستەدا ئاشکرا دەریدەخات، پرسیار لە چیی دەکرێت. بۆیە لێکدانەوەی ڕستەکە لەلایەکەوە بەپێی شوێنی قورساییخستنەسەرەکییەکەو لەلایەکی دییکەیشەوە بە گوێرەی نموونەی/جۆری ئاوازی گشت ڕستەکەیە.
ڕستەناوبراوەکان دەتوانرێن وەك ڕستەی پرسیاری تەواوکەرانەی شکاوە[١٠٨٣] بەکاربهێنرێن (ڕستەکانی (٣٢ (ا)) و (٣٢ (ب)) بەراورد بکە). ئەم چەشنەی ڕستە، بەواتا (٣٢)، دەبێت لە ڕستەیەکی پرسیاری ناڕاستەوخۆ جیابکرێتەوە، کە جێناوێکی پرسیار یان وشەیەکی پرسیاری تێدایە. چونکە (٣٢) ڕستەیەکی تەواوکەر نییە، بەڵکو "پرسیارێکی ئایا ... یان نا"[١٠٨٤]یە.
ئەم دیاردانەی، تایبەتن بە زمانەکەمانەوە، لە دروستە ساکارو بەراییەکانیشدا[١٠٨٥] تێبینییاندەکرێت.

---

[١٠٨١] Subjazensbedingung

[١٠٨٢] Hauptbetonung

[١٠٨٣] eingebetete Frage-Komplemntsätze

[١٠٨٤] eine Ob-Frage

[١٠٨٥] einfache und elemntare Strukturen





296

<چوون> (ڕۆیشتن)

٤٩_ pro چوون.

٥٠_ pro چوون؟

نموونەکان دەریدەخەن، کە لێکدانەوە فرەچەشن و جۆراوجۆرەکانی ڕستەکان دەگەڕێنەوە بۆ زانیاریی فۆنۆلۆژییەکان، نەك بۆ سینتاکسییەکان. من دەمەوێت بڵێم، کە Comp لە دروستەی قووڵدا وەك [wh +] یان وەك [-wh] دیاریی و دەستنییشانکراوە. ئەگەر ئەمە وەهابێت، ئەوا دیاریکردن و نیشانەکردنی Comp تەنها هۆکارێکە[١٠٨٦] بۆ قورسایی جەختخراوەسەر لە ڕستەخۆییەکاندا[١٠٨٧]. ئەمە ئەوە دەبەخشێت، کە قورساییخستنەسەری وەچەپێکهاتەیەك لە لایەن Comp ەوە داوایدەکرێت.

دەربڕیینی هێنراوەپێش بە قورسایی جەختخراوەسەرەوە[١٠٨٨] مەرجی پێشەکیین بۆ قورسایی جەختخراوەسەر. بەپێچەوانەوە، ئەم چەشنە قورساییخستنەسەرە مەرجی پێشەکیی نییە بۆ دەربڕیینی هێنراوەپێش بە قورسایی جەختخراوەسەرەوە (چونکە لەم حاڵەتەیاندا دەبێت چاوەڕێی کرداری هێنراوەپێش و قورسایی جەختخراوەسەر لە Comp دا بکەین و تیۆرییەکەیش ڕێگە بەمە نادات)؛ لەگەڵ ئەمەیشدا قورسایی جەختلخراوەسەر چەشنەکانی پرسیاری خۆیی (لەڕێی نیشانەدیارییکراوەکانی wh -/+ ی Comp ەوە) کارتێکەرو بزوێنەر یان بنەمای سینتاکسییان هەیە. ئەگەرو هەلومەرجی لێکدانەوەکانی ڕستەی (٥٠) حاڵەتێکە، کە پشتگیریی ئەم ڕوونکردنەوانە دەکەن و بەتایبەتییش دەیسەلمێنن.

هەمان بەڵگەهێنانەوەکان بۆ ڕستەکانی (٤١) یش دەخۆن؛ ئەمەیش لەبەر ئەوهۆیانەی، کە سەر بە نیشانەو مۆرکە نەوعیی و گۆکەرییەکانی پێکهاتەی فۆتۆلۆژیین. نیشانەومۆرکە نەوعییەکان دەگەڕێنەوە بۆ پلە جیاوازەکانی ئاوازو قورساییخستنەسەر. نیشانەو مۆرکە گۆکەرییەکان دەرەنجامی ئەوەی دواییانن و لەو چەشنە جۆراوجۆرانەی ڕستەی پرسیار (٥٠) و مەرج و سنووربۆدانانە فۆنۆلۆژییەکاندان (بەراوردی بکە لەگەڵ ئەوانەی لای خوارەوەدا)، کە تایبەتمەندێتیی زمانی کوردییان دیارییکردووە.

لە ڕستەیەکی پرسیاردا، وشەی پرسیارەکە یاسائاسا قورساییخستنەسەری سەرەکیی وەردەگرێت. بۆچیی ڕستەیەکی پرسیار، کە پتر لە دوو وشەی پرسیاری هەیە، لەم ڕێیەوە ڕووندەکرێتەوە: نابێت چەند وشەیەکی پرسیار وەك چەند یەکەیەکی سینتاکسیی

---

١٠٨٦ Ursache

١٠٨٧ Echo-Sätze

١٠٨٨ Fokus

قورساییخستنەسەرێکیان بە هەمان پلەوە هەبێت. ئەگەر ئەم دیاردە فۆنۆلۆژییە هۆی فیزیۆلۆژیی یان هۆی زمانیی رووتی هەبێت یان نا، ناتوانرێت لێرەدا لێیبکۆڵرێتەوەو روونبکرێتەوە. بەڵام ئاشکرا تێبینیی ئەوە دەکرێت، کە لە رستەیەکی دوو وشەییدا یەکێکیان قورسایی جەختخراوەسەری (بەرامبەریی و پێچەوانەی) دەبێت. لە (٤١ (ب)) دا بۆ نموونە، وشەی پرسیاری دووهەمی رستەیەکی پرسیاری ناڕاستەوخۆ ئەم چەشنەی قورساییخستنەسەرە وەردەگرێت. لە (٤١ (پ)) دا لە هەر سێ وشەی پرسیارەکان دیبسانەوە هەمان وشەی پرسیار قورسایی جەختخراوەسەری هەیە. بەپێی ئەم شییکردنەوەیە ئەم چەشنەی قورساییخستنەسەرە پاش ئەوە بە وشەیەکی پرسیار دەدرێت، کە وشەیەکی پرسیاری دیکە قورساییخستنەسەری سەرەکیی وەرگرتبێت. ئەمەیش ئەوە دەبەخشێت، کە قورساییخستنەسەری جەختخراوەسەر کاتێك دادەنرێت، کە وشەیەکی پرسیار بەتایبەتیی گرنگییەکەی دەربخرێت (لە دەربڕاوەکەدا بە گرنگ دادەنرێت).

هەر وەك رستەکان لە (٤٢) دا دەریدەخەن، قورسایی جەختخراوەسەر یاسائاسا بەرکاری ڕاستەوخۆی کردار یان کەرەستە پێشکردارییەکە[١٠٨٩] وەك گرنگ بەرز دەخاتڕوو[١٠٩٠]. لە رستەیەکی دەربڕییندا، قورساییخستنەسەری سەرەکیی رژێمئاسا هەر بەو کەرەستەیە دەدرێت. لەمەوە ئەو زانیین و زانیارییەم دەستدەکەوێت، کە قورسایی جەختخراوەسەر قورساییخستنەسەری سەرەکیی رستەیەکەو کە وشەی پرسیارەکانی دیکەی هەمان رستە قورساییخستنەسەرە لاوەکییەکان[١٠٩١] وەردەگرن.

کەواتە دانانی ئەم چەشنەی قورساییخستنەسەرە بۆ ئەوەیە، لە برینداركردنی مەرجی هاوسێیەتیمان بپارێزێت یان دووربخاتەوە. هەر بۆیە هەندێك رستەی دیارییکراو لەگەڵ یان بەبێ قورسایی جەختخراوەسەر رێی پێنادرێت. نموونەکانی وەك (٤٣ (ب)) کەرەستەو بەڵگەی ڕاستەوخۆن.

### ئەنجاملێکدانەوە:

لەو تێروانیین و لێوردبوونەوەیەمەوە، (ا) کە یاسای "فرێزی وشەی پرسیار بجووڵێنە" لە سینتاکسدا کاریگەر نییەو (ب) کە رستەپرسیارەکانی زمانی کوردیی لە سەر بناغەی دیاردەکانی مەودای رکێف لێکدانەوەی مرەچەشن و جیاوازیان نییە، بەڵکو سەرێی نموونەکانی قورساییخستنەسەرو ئاوازەوە جۆراوجۆر لێکدەدرێنەوە، ئەوەم بەدەستکەوت، کە وشەی پرسیاری کوردیی وەك کوانتۆر یان وەك لە کوانتۆرچوو روونناکرێتەوە. لەم راستییە دەستکەوتووەمەوەیە، کە چەند وشەیەکی پرسیار لەیەك رستەدا بۆیان هەیە

---

[١٠٨٩] präverbales Element

[١٠٩٠] hervorbringen

[١٠٩١] Nebenbetonung

ڕووبدەن و دەربکەون. لە مەرجە شوێنییەکاندا پێکهاتەی فۆنۆلۆژیی ڕۆڵێك دەبینێت؛ بەڵام لە هەندێك چەشنی دیارییکراوی ڕستەکاندا، بکەری جێناویی سفرو کلیتیکەکان گرنگن، کە دەقە دروستەییەکانی مەرج و سنوورەدانراوەکان تێکدەدەن. کەواتە مەرج و سنوورە دانراوەکان جیهانیین و هەن و دروستەسینتاکسییەکانی زمانی کوردیی بەو شێوانە خۆیان گونجاندووە، کە ئەو مەرج و سنوورەدانراوانە بریندار نەکرێن.

## ٨/٤) یاسای لۆژیکیی (دەربڕیینی هێنراوەپێش و جەختخراوەسەر)[١٠٩٢]

### ٨/٤-١) زانیاری گشتیی

دەربڕیینی بەرایی[١٠٩٣]: دەربڕیینی بەرایی وەك پرۆسەیەکی ڕێزمانیی لێکدەدرێتەوەو دەخرێتەڕوو، کە پەیوەندییە ئەندازیرییەکان و ئاکاری جوڵاندنی وشەی پرسیاری هەیە. بەپێی ئەو گریمانەیەی، کە دەربڕینە بەراییەکە وەچەپێکهاتەیەکەو لەو شوێنە پێشەکییەدا، کە ئاستی قوڵە، بەرهەمهێنراوە، دەربڕینە پاشەکییەکەی[١٠٩٤] پێوەی (بە دەربڕینە بەراییەکەوە) بەندە، وەك ڕستەیەکی کراوە[١٠٩٥] شییدەکرێتەوە. دەربڕینە پاشەکییەکە ڕوونکردنەوەو زانیارییەك[١٠٩٦] دەربارەی دەبڕینەبەراییەکە دەدات، کە لە ئاستی قووڵ یان بنەڕەتدا بەرهەمهێنراوە. بۆچیی ڕستەیەکی سینتاکسیی کراوە دەتوانێت ڕوونکردنەوەو زانیارییەك دەربارەی دەربڕینە بەراییەکە بدات؟ چۆن دەربڕینە پاشەکییەکە وەك ڕستەیەکی کراوە شییدەکرێتەوە؟ ئەم پرسیارانە بۆ بەڵگەهێنانەوەکانم زۆر گرنگن. بۆیە ناتوانم دەستبەرداریان بم و پشتگوێیانبخەم. با لە پێشدا لەم نموونانە وردببینەوە:

51- S´´[Top. this book] [S´[ Comp what] [I asked Bill to get his students to read t]]

52- This book, I asked Bill to get his students to read.

---

١٠٩٢ die LF-Regel „Fokus"

١٠٩٣ Topikalisieung

١٠٩٤ Proposition

١٠٩٥ offener Satz

١٠٩٦ Berricht, Kommentar

پراوپڕ بەگوێرەی ڕوونکردنەوەکەی سەرەوەم، (٥٢) لەڕێی قرتاندن و لابردنی فرێزی وشەی پرسیارەوە[1097]، بەزۆرو بەناچاریی[1098]، لە (٥١) هەڵگوێزراوە. شوێنپێکە ئاشکرا نییشانیدەدات، کە (٥١) خۆیشی لە (٥٣) وە هەڵگوێزراوە.

53- This book, I asked Bill to get his students to read what

دیارە، کە بە پێی ئەم شییکردنەوەیە، ئەم زانیارییە پێزانراوو چەسپاوانە بەدەستکەوتوون:
(ا) قرتاندن و لابردنی فرێزی وشەی پرسیارەکە شوێنپێیەك بەجێدەهێڵێت.
(ب) ڕستەکە ڤاریابڵێکی بەستراوە بەرهەمدەهێنێت.

54- S´´ [Top this book] S´ [Comp what I asked Bill to get his students to read X][1099]

کە بابەتەپێشەکییەکە لەناو ڕستەشکاوەکەدا پلەی جیاوازیی پەسەندیی و ناپەسەندیی هەیە، چیدیی نادیارو لێڵ نییە، ئەگەر وا بییربکەینەوەو وا هەڵبسەنگێنین، کە نیشانەو مۆرکی هاوبەشیان لەگەڵ جوڵاندن و گواستنەوەی وشەی پرسیاردا هەیە:

ڕستییلەی "کە"[1100]:

55- I informed the student that <u>this book</u>, they would defintly have to read.

ڕستەی سەرجێناویی و ڕستەی پرسیار:[1101]

55- (a) John gave away the books to some friends.
(b) * to whom the books did John give away?
(c) * whom the books did John give away?

---

[1097] Wh-Phrase

[1098] obligatorisch

[1099] Chomsky (1977:90-91)

[1100] That-Klausel

[1101] Relativ- und Fragesätze

(d) * the boy to whom the books John gave away?
(e) * the boy whom the books John gave away?

شـییکردنەوەی ئـەم پرۆسـەیە وەك حاڵـەتێکی گواسـتنەوەی وشـەی پرسـیار رێـدەدات زنجیرەیەك لە هۆو بنەما هەبن، کە نەبوونـەکراویی ئەو ڕستانە ڕووندەکەنەوە. هۆو بنەماکان لەناو مەرجە شوێنییەکاندا دەمێننـەوە یان هـەن. بۆ نموونە، (٥٦) دروستەی قووڵـی (٥٧) ی هەیە.

57- [ the boy [S´ Comp [S´ [Top the books] [S´ Comp John gave away which to whom]]]]

جوڵاندن و گواستنەوەی وەچەپێکهاتەی to (whom) بۆ شوێنی Comp ە ناوەکییەکە[١١٠٢] ڕێلێگیراوە. چونکە ئەم شوێنە پاش جوڵاندن و گواستنەوەی وشەی پرسیار (شـییکردنەوەی دەربڕیینـە بەراییەکـە[١١٠٣]) هـەر لەسـەرەتاوە گیـراوە. بـەڵام جوڵاندنـی وەچەپێکهاتەی to whom بۆ بەرزترین شوێنی Comp بۆیە ڕێپێنەدرێت و ناکرێت، چونکـە بـە جێبـەجێکردنی گواسـتنەوەکە مەرجـەکانی SSC و PIC بریـندار دەکرێن[١١٠٤].

ڕستەی شـەقکراو[١١٠٥]: ڕستەی شـەقکراو ئـەو نیشـانەو مۆرکـە جیهانییـەی[١١٠٦] هەیـە، کـە شەقبووەو بووە بەشی هێـنراوەپێش بـە قورسـایی جەختخراوەسـەر[١١٠٧] و بەشـی دەربڕیینـی پاشـەکیی[١١٠٨]. هـەر وەك شـییکردنەوەی پرۆسـەی دەربڕیینـی بـەرایی[١١٠٩]، ڕسـتەی شەقکراویش بەپێی یاساکانی گواستنەوەی وشەی پرسیار ڕووندەکرێتەوە. وەها دادەنرێت، کە پێکهاتووی ڕستەی شەقکراو دروستەی قووڵ و بنەڕەتیی (٥٨) ی هەبێت.

---

١١٠٢ in die interne Comp-Position

١١٠٣ Topikalisierungsanalyse

١١٠٤ Chomsky (1977:90-91)

١١٠٥ der Spaltsatz

١١٠٦ universelle semantische Eigenschaft

١١٠٧ Fokus

١١٠٨ Proposition

١١٠٩ Topikalisierung

58- it is – S′′

59- (a) It is this book that I really like.

(b) It is this book that I asked Bill to get his students to read.

بابەتی گواستنەوەی وشەی پرسیار لەناو S′′ دا S ە. لێوردبوونەوەیەك لەم ڕستانە دەریدەخات، كە گواستنەوەی ئەو وەچەپێكهاتەیە لەناو S′ دا یاسا بریندارەكات و لەیاسالادان ئەنجامەكەی دەبێت.

60- (a) * It is this book that I accepted the argument that John should read

(b) * It is this book that I wonder who reads

## ٨/٤-٢) یاسای فۆرمی لۆژیكیی "دەبڕیینی هێنراوەپێش و قورسایی جەختخراوەسەر"[١١١٠] لە زمانی چینییدا

لەسەر بنەمانی نیشانەو مۆركە سێمانتیكییە جیهانییەكەی ڕستەی شەقكراو، ئەم چەشنەی ڕستەیش لە چینییدا وەك پێكهاتوویەكی "پەیوەندیی لەكوانتۆرچوو _ ڤاریابڵ"[١١١١] دەبیینرێت و شییدەكرێتەوە؛ ئەمەیش بۆ ئەوەیە بتوانرێت بە ڕستەی شەقكراو دارشتەیەكی یەكگرتوو بدرێت. لەم دارشتەیەدا، كوانتۆر (كەرەستەی دەربڕیینە دانپێدانراوەكە) ڤاریابڵێك لە دەربڕیینەپاشەكییەكەدا (لە ڕستەكراوەكەدا) بە خۆیەوە دەبەستێت. ئەمە ئەوە دەبەخشێت، كە ئۆپەراتۆرو ڕستەكراوەكە وەك دارشتەیەك لە "دەربڕیینی دانپێدانراو" و "دەربڕیینی پاشەكیی" لێكدەدرێتەوە. بەم ڕێوشوێنە (٦١) دارشتەی (٦٢) ی بۆ دەنووسرێت و دەخرێتەپاڵی[١١١٢].

61- Shi wo migitan yao mai neiben shu.

پەرتووك ئەو كریی دەیەوێت بەیانیی من "نیشانەی دەربڕیینی دانپێدانراو"

"منم، ئەوەی دەیەوێت بەیانیی ئەو پەرتووكە بكرێت."

---

[١١١٠] LF-Regel „Fokus"

[١١١١] (Quasii)-Quantor-Variable-Relation

[١١١٢] Huang (1982:372-373)

62- [(shi wo) [X migtian yao mai neiben shu]]

داڕشتەی نادیار وەك ڕوونكردنەوەیەك: گواستنەوەی وەچەپێكهاتەی هێنراوەپێش بە قورسایی جەختخراوەسەرەوە بۆ شوێنی C omp ی ڕستەشكاوەكە یان هی گشت ڕستەكە _ لەو شوێنەوە، كە وەچەپێكهاتەكە وەچەئاڕاستەی گشت ڕستەكە دەكات_، وەك گواستنەوەی فرێزی وشەی پرسیار نادیارە. ئەو داڕشتە نادیارەی ناوڕستەكەو لەتەكییدا بوونی یاسایەكی هێنانەپێش بە قورسایی جەختخراوەسەرەوە ئەو هەلومەرجە دەڕەخسێنن، كە ڕستەكە ڕاست لێكبدرێتەوە. بۆ نموونە، لە (٦٣) دا كەرەستەی هێنراوەپێش بە قورسایی جەختخراوەسەرەكەوە لە ڕستەتەواكەرە شكاوەكەی كردارەسەرەكییەكەدایە. مەودای ڕكێفی دەربڕینی هێنراوەپێشەكە بە قورسایی جەختخراوەسەرەوە، وەك لەكوانتۆرجووییەك، دەتوانێت یان بەسەر ڕستەسەرەكیەكەدا[1113] یان بەسەر ڕستەتەواوكەرەكەدا[1114] بكشێت و هەر یەك لەو دوانە بگرێتەوە. لە ئەنجامی ئەمەدایە، یەك ڕستە دوو لێكدانەوەی دەبێت.

63- Zhangsan shuo [Lisi shi migtian lai]

دێت بەیانیی نیشانەی دەربڕینی دانپێدانراو دەڵێت ژانگسان

ئەگەر ڕستەشكاوەكە بەشێكی ڕستەناڕاستەوخۆكەبێت و هێنراوەپێشەكە بە قورسایی جەختخراوەسەرەكەوە لە ڕستەشكاوەكەدا بێت، قسەكەر دان بە گشت ڕستەكەدا دەنێت و دەریدەخات، كە گشت ڕستەكە بەلایەوە گرنگە؛ بۆیە ڕستەكە وەك (ا) لێكدەدرێتەوە.

(ا) ژانگسان گوتیی، بەیانییە، كە لیسیی دێت. ~ ژانگسان گوتیی، بەیانیی، لیسیی دێت.

ئەگەر ڕستەشكاوەكە وەك پرسیارێكی ڕاستەوخۆ بییسنرا، لێكدانەوەی كەرەستەی هێنراوەپێشەكە بە قورسایی جەختخراوەسەرەوە دەریدەخات، كە بكەرەسەرەكییەكە[1115] گرنگە.

(ب) بەیانییە، ژانگسان گوتیی، لیسیی دێت. ~ بەیانیی، ژانگسان گوتیی، لیسیی دێت.

٥

---

[1113] Matrixsatz

[1114] Komplementsatz

[1115] Matrixsubjekt

گرنگــە تێبینیــی ئــەوە بکرێــت، کــە ڕوودانــی ئــەم دیاردەیــە وابەســتەی پــۆلی کردارەسەرەکییەکەیشــە. چونکــە کــاتێك ڕستەشــکاوەکە دەتوانێــت لــەناو مــەودای ڕکێفــی وەچەپێکهاتــەی دەربڕییــنی هێنراوەپێشــەکەدا بــە قورســایی جەختخراوەســەرەوە بێــت، کــە تەواوکەری ڕاستەوخۆی کردارێکی دیارییکراو یان ناوێك بێت.

مەرج و سنوورەدانراوەکان، کە ڕێ لە بەکارهێنانی دووهەمین یاسای فۆرمەلۆژیکییەکــە "(دەربڕییــنی) هێنراوەپێش بــە قورســایی جەختخراوەســەرەوە" دەگــرن، بۆیــە هــەبوونی ئــەم یاسایە دەسەلمێنن، چونکە یاساکە یاسایەکی جیهانییە. بۆ نموونــە، یاساکە بابەتی مەرجی هاوســێیەتییە[1116]. ڕســتەی ســەرجێناویی و ڕســتەی بکــەریی هەســتیی[1117] پێکــهاتووی تەواوکەرانــە[1118]ی هــەندێك کــردار نیــین. هــەر بۆیــە نــاتوانن نــە بکــەرێکی ســەرەکیی و نــە (دەربڕیینێکــی) هێنراوەپێشــیان بــە قورســایی جەختخراوەســەرەوە تێدابێــت. (٦٤) و (٦٥) دوو نموونەن، کە لەڕووی سێمانتیکییەوە پەسەند نیین، چونکە دەربڕیینە هێنراوەپێشەکە بە قورسایی جەختخراوەسەرەکەوە وەك هێنراوەپێش و جەختخراوەسەر و دەرخســتنی گرنگیــی بکەرەسەرەکییەکە لێکنادرێتەوە. لەڕووی سینتاکسییشەوە پەسەند یان دروست نیین، چونکە مەرجی هاوسێیەتییان بریندارکردووە.[1119]

64- * [Wo xihuan [shi Zhangsan mai de neizhi gou]]

سەگ کە کڕیی ژانگسانە کە سەگەکە نیيشانەی دەربڕیینی دانپێدانراو حەزدەکەم من

"من حەزم لەو سەگەیە، کە ژانگسان ئەو کەسەیە، کە کڕیی."

65- * [[Zhangsan shi zuotian mai de neiben shu] hen hao]

کڕیی دوێنێ نیيشانەی دەربڕیینی دانپێدانراوDEزۆرباش پەرتووك کە

"ئەو پەرتووکە، دوێنێ بوو، ژانگسان کڕیی."

ناتوانرێت گواستنەوەیەك بۆ شوێنی Comp یێکی، کە پێشتر گیراوە، جێبەجێبکریت؛ پەیوەســت بەمــەوە هوانــگ ئامــاژە بــۆ چۆمســکیی و فرەیدیــن[1120] دەکــات. بــا ئێســتایش

[1116] Subjazensbedingung

[1117] sentenciale Subjektsätze

[1118] Komplementkonstruktion

[1119] Huang (1982:374)

[1120] Chomsky (1973), Fredin (1978)

سەیربکەین، چۆن شوێنێکی دووفلییقانەی Comp[١١٢١] لە (٦٦) و (٦٧) دا ڕێ لە یاسای گواستنەوەو جولاندنەکە دەگرێت.

66- *[ S′ [ S shi Zhangsan da-le shei]] ?
FM1 beat who

FM2
* „Who is Zhangsan that beat?“ *"کێیە، کە ژانگسان لێیدا؟"

67- *[ S′ [S ta xiang zhidao [S′ [S shi Zhangsan dale shei ]]]
کێ لێدا ژانگسان نیشانەی دەربڕین سەریسوڕما ئەو
*" ئەو سەریسوڕما، کێیە ژانگسان لێیداوە؟"

## ٨/٤-٣) دەربڕیینی هێنراوەپێش بە قورسایی جەختخراوەسەرەوە لە زمانی کوردییدا

دەربڕیینی هێنراوەپێش بە قورسایی جەختخراوەسەرەوە:

پێکهاتووی دییکە، کە هۆیەك نییە، وای دابنێم، یاسای "دەربڕیینی هێنراوەپێش بە قورسایی جەختخراوەسەرەوە" ی تێدا بێت، پێکهاتووەکانی "دەربڕیینی هێنراوەپێش بە قورسایی جەختخراوەسەرەوە" و ڕستەی شەقکراون. دەربڕیینی هێنراوەپێش بە قورسایی جەختخراوەسەرەوە، کە هیچ جولاندن و گواستنەوەیەکی ئاشکراو لەڕوو[١١٢٢] لە سینتاکسدا نیشاننادات، وەك لێرەدا داڕشتەکەی دەخرێتەڕوو، نیشانەی جولاندن و گواستنەوەی وشەی پرسیاریشی نییە. دەربڕیینە هێنراوەپێشەکە بە قورسایی جەختخراوەسەرەوە N′′ یکی بەرهەمهێنراوە لە ئاستی قووڵ و بنەڕەتدا[١١٢٣]، کە تێیدا ڕستەیەك شکاوەتەوە. ئەگەر دەربڕیینەهێنراوەپێشەکە بە قورسایی جەختخراوەسەرەوە لەگەڵ بکەری ڕستەشکاوەکەدا هاونیشانە[١١٢٤] بێت و هەردوکیان هەمان نیشانە هەڵبگرن، ئەوا دەربڕیینە هێنراوەپێشەکە

---

[١١٢١] verzweigte Comp-Position

[١١٢٢] offenkündige Bewegung

[١١٢٣] eine basisgenerierte N′′

[١١٢٤] korreferenz, tragen den gleichen Referenzindex

به قورسایی جەختخراوەسەرەوە بەجێناوکردنی ئەم بکەرە بەرپادەکات *دەبێتە هۆی ئەوەی، بکەرەکە لەشێوەی جێناودا دەربکەوێت.*

٦٨_ (ا) [ئازاد! [ pro کورێکی ئازایە]]
٦٩_ (ب) [ئەو پیاوانە! [ pro مامۆستای ئێمەن]]

ئەگەر دەربڕینەهێنراوەپێشەکە بە قورسایی جەختخراوەسەرەوە لەگەڵ ئارگومێنتە ناوەکییەکەی کردارەکە هاونیشانەبێت، ئەوا ئەو بەرکارە وەك کلیتیك (جێناوی لکاوی بەرکار) بەرجەستەدەبێت. لەم بارەدا، کلیتیکەکە لەڕێی شوێنە بنجییەکەیەوە لەگەڵ دەربڕینەهێنراوەپێشەکەدا بە قورسایی جەختخراوەسەرەوە هاونیشانە دەبێت.

٦٩_ (ا) [ئارام ! [ pro مامۆستا t نارد ϕ ی بۆ ماڵەوە]]

(ب) [ ئەم ڕۆژنامانە! [ئازاد بە ئارامی گوت [pro t بیاندات بە قوتابییەکانی هەتا pro t بیانخوێندنەوە]]]

(پ) [ڕۆژنامەکان! [ pro خوێندنەوەیان t پێویستە]]

جێناوەسفرە بکەرەکەی[1125] (٦٨ (ا)) و کلیتیکەکەی (٦٩ (ب) و (پ)) بە شوێنە وەچەدیارییکراوەکانیانەوە[1126]، ئاشکرا دەریدەخەن، کە لەو ڕستانەدا هیچ وەچەپێکهاتەیەك نەقرتێنراوەو لانەبراوە یان نەگوێزراوەتەوەو کە هیچ ڤاریابڵێکیشیان تێدا نییە. ئەو دەربڕینەهێنراوەپێشانەیان بە قورسایی جەختخراوەسەرەوە، کە لەگەڵ بکەری pr o هاونیشانەن یان لەگەڵ کلیتیکەکانیان هەمان نیشانە هەڵدەگرن، لە سەر هیچ ئاستێك ڕێ بە هیچ جۆرێك لە گواستنەوە نادەن.

ئەو ڕستەیەی لە دەربڕینە هێنراوەپێشەکەدا (بە قورسایی جەختخراوەسەرەوە) شکاوەتەوە، ڕستەی لێکدەرەوەیە[1127]، کە ڕوونکردنەوەو زانیارییەك دەربارەی

---

١١٢٥ pronominales Null-Subjekt

١١٢٦ mit ihren subkategorisierten Positionen

١١٢٧ interpretativer Satz

دەربڕینەهێنراوەپێشەکە بە قورسایی جەختخراوەسەرەوە یان دەربارەی سەری ڕستەی سەرجێناویی بەدەستەوە دەدات. سەری ڕستەی سەرجێناویی، کە جێناوێکی ئامارژەی[1128] لە پێشەوەیە، زاراوە سیمانتیکییەکەی [ -دیارییکراو][1129] ی هەیە. ئەو ڕستەیەی، کە لە دەربڕینە هێنراوەپێشەکەدا شکاوەتەوە، دەشێت ڕستەیەکی کراوەیش بێت. (ا) چونکە لە گشت دروستەی ڕستەکەدا هیچ جووڵاندن و گواستنەوەیەك یان پرۆسەی قرتاندن و لابردنێك جێبەجێنەکراوەو (ب) چونکە دەربڕینە هێنراوەپێشە ئامارژەدارەکە[1130] نییشانە سیمانتیکییەکەی [ + دیارییکراو ][1131] ی هەڵگرتووە. بۆیەکە ڕوودان و بەکارهێنانی ڕستەی پرسیاری شکاوە لە دەربڕینە هێنراوەپێشەکەدا بە قورسایی جەختخراوەسەرەوە دروستەیەکی ڕێزمانیی ڕێپێدراوە.

٧٠_ (ا) ئەم ڕۆژنامانە! ئازاد بە کێی گوت t pro بیانداتϕ بە قوتابییەکانی تاوەکو t pro بیانخوێنندنەوە

(ب) ئەم ڕۆژنامانە! کێ بە کێی گوت t pro بیانداتϕ ...

ئەگەر من یاسا لۆژیکییەکەی "دەربڕینی هێنراوەپێش بە قورسایی جەختخراوەسەرەوە" بخەمە تەك ئەو ڕستانەو بۆیاندابنێم، ئەوا دەبێت حسابیش بۆ ئەوە بکەم، کە بەرز ترین شوێنی Comp لەڕێی جێبەجێکردنی ئەم یاسایەوە پڕبووبێتەوەو گیرابێت. ئەگەر وەهایشی دابنێم، کە یاسای فۆرمەلۆژیکییەکەی " وشەی پرسیار بجووڵێنە" لە ڕاستییدا لەسەر ئاستی لۆژیکیی جێبەجێدەکرێت، ئەوا دەبێت ئەوەمان لەبەرچاوبێت، کە جێبەجێکردنی ئەم یاسایە لەڕێی شوێنی Comp ە پڕکراوەو گیراوەکەوە ڕێلێگیراوە. بەڵام چونکە ئەو ڕستانە دروستەی ڕێزمانیی ڕاستیان هەیەو چونکە لەڕووی سیمانتیکییەوە تەواو پەسەندن، هەم یاسای فۆرمەلۆژیکییەکەی یەککەمیان و هەم ئەوەی دووهەمیان لە زمانەکەماندا نیین.

ڕستەی شەقکراو:

ڕستەی شەقکراو، کە من هیچ دارشتەیەکی "لەکوانتۆرچوو_ڤاریابل" ی ناخەمەتەك و بۆی دانانێم، وەك من وەهای بۆدەچم، دروستەی قووڵ و بنجیی (٧١) ی هەیە.

(S)

---

[1128] Demonstrativpronomen

[1129] trägt den semantischen Begriff [ -definit]

[1130] referentieller Fokus

[1131] [ +definit]

N´´ = سەری ڕستەی سەرجێناویی

ئەو ڕستەیەی لە سەری ڕستەسەرجێناوییەکەدا[1132] شکاوەتەوە، ڕستەیەکی سینتاکسیی و سیمانتیکیی داخراوە. ڕێکەوتنی بکەری ڕستەی شەقکراو، لەڕێی سەری ڕستەی سەرجیناوەکەوە، لەگەڵ بکەری ڕستییلەی ڕستە سەرچێناوییەکەدا[1133] دەبێتەهۆی ئەوەی ئەمەی دواییان ببێتە جێناوێک[1134]. دەرەنجامی ڕێکەوتنی لەگەڵ ئارگومێنتەناوەکییەکەی بەشی کرداری[1135] ڕستییلەی ڕستەسەرجێناوییەکە ئەوەیە، کە ئەم ئارگومێنتە دەبێتە کلیتیک. ئەم پڕۆسەڕێزمانیانەو سەری ڕستەسەرجێناوییەکەی، لە ئاستی قووڵ و بنجییدا بەرهەمهێنراوە، بەتەنها بەرپەرچی بۆچوونی یاسایەکی جووڵاندنی فۆرمی لۆژیکیی لەناو ڕستییلەی ڕستەسەرجێناوییەکەدا یان بەسەرییدا ناداتەوە، بەڵکو پێشبینیی ئەوەیش دەکات، کە بۆچی ئەم چەشنانەی ڕستە هیچ هاوبەشییەکیان لەگەڵ جوڵاندن و گواستنەوەی وشەی پرسیاردا نییە.

٧٢_ (ا) [ئارام بوو ϕ [ ئەو کەسەی [کە [ مامۆستا لەدووی t دەگەڕا ϕ ]]]

(ب) [ئارام بوو ϕ [ئەو کەسەی [کە pro لەدووی مامۆستا دەگەڕا ϕ ]]]

(٧١) دەتوانێت (٧٣) ی وەك دروستەیەکی ڕستە هەبێت یان بخرێتە تەکیی و بۆیدابنرێت.

73- N´´2 – V´, N´´1 – is (بەراوردیی بکە لەگەڵ (٧١) دا)

بەم پێیە ڕستەکانی (٧٢) ڕستەکانی (٧٣) یان وەك ڕستەئەڵتەرناسیۆنەکانیان هەیە.

٧٣_ (ا) ئەو کەسەی، کە مامۆستا لە دووی دەگەڕا، ئارام بوو.

(ب) ئەو کەسەی، کە pro لەدووی مامۆستا دەگەڕا، ئارام بوو.

---

[1132] R-Kopf

[1133] R-Klausel

[1134] Pronominalisierungsprozess

[1135] internes Argument des Prädikates

دروستەسینتاکسییەکەی ئەم چەشنەی ڕستە ڕێدەدات وەك ڕستەی سەرجێناویی شیبکرێتەوە، کە لە ڕستەیەکی شەقکراودا شکاوەتەوە. ئەو ڕێسایانەی، کە لەم چەشنەی ڕستەکاندا بریندارەکرێن و لەم پارەدا بۆ ئێمە گرنگن، پەیوەستن بە پەیوەندییە سینتاکسیی و سیمانتیکییەکانی، کە لە نێوان سەری ڕستە سەرجێناوییەکەو ڕستییلەی ڕستە سەرجێناوییەکەدا هەن. چونکە هەر جوولاندن و گواستنەوەیەك لە سینتاکسدا یان لە پێکهاتەی فۆرمی لۆژیکییدا دەبێت بەسەر سەری ڕستەسەرجێناوییەکەدا تێپەڕێت یان لەڕێی ئەو سەری ڕستەسەرجێناوییەوە بێت، کە لە پێشدا شوێنی Comp ی پڕکردووەتەوە گرتووە. بەلام ئێمە دەزانین، کە ئەم چەشنە جولاندن و گواستنەوەیە نەبوونەکراوە. لە ڕستە سەرجێناوییەکاندا نیشانمدا، کە هۆی بریندارکردنی ئەم یاسایە بۆ زاراوە سیمانتیکییەکەی [ -دیارییکراو ] ی سەری ڕستەسەرجێناوییەکە دەگەڕێتەوە. بۆ پشتگیریکردنی ئەم بانگەشەی گریمانەیە چەند نموونەیەکی دیکە پێشکەشدەکەم، کە وەك کەرەستەو بەلگە بینراون دەنرخێنرێن.

تێڕوانینێکی وردی ئەم ڕستانە دەریدەخەن، کە لەنێوان ڕستەی شەقکراو (ڕێکەوتنی بکەرو بەشی کردار) و ڕستییلەی ڕستەی سەرجێناوییدا هیچ ڕێکەوتنێکی ڕاستەوخۆ نییە. بکەری ڕستەشەقکراوەکە ڕێکەوتنی لەگەڵ بەشی کرداری هەمان ڕستەدا لە کەسی یەککەمی تاك و [ + دیارییکراو ] دا هەیە. بکەری ڕستەی سەرجێناویی لە کەسی سێ هەمی تاك و [ -دیارییکراو ] دا لەگەڵ بەشی کرداری ڕستییلەی ڕستەسەرجێناوییەکەدا یەکدەگرێتەوە. ئەمەیش ئەوە دەبەخشێت، کە ڕێکەوتنی ناڕاستەوخۆی نێوان ڕستەی شەقکراوو ڕستەی سەرجێناویی تەنها لەڕێی سەری ڕستەسەرجێناوییەکەوە دەبێت، کە نیشانەتایبەتییەکانی "کەسی سێ هەمی تاك و [ -دیارییکراو] ی هەلگرتووە.

لەو ڕوونکردنەوانەی سەرەوە ئەم دەرەنجامانە یان ئەنجامە گرنگانەم چنگدەکەوێت:

(ا) هەردوك چەشنی ڕستەکە (ڕستەی شەقکراوو ڕستەی سەرجێناویی) خاوەنی دروستەی ڕستەی سینتاکسیی داخراون. بۆیە لەو ڕستانەن، کە ئارگومێنتە ناوەکیی و دەرەکییەکانیان بەتەواوی لە ڕستەکەدا هەن و ئامادەن.

(ب) لە کاتێکدا ڕستەی شەقکراو لەڕێی ناوەڕۆکە تایبەتییەکەیەوە لێکدانەوەیەکی دیارییکراوی هەیە، ڕستەی سەرجێناویی واتالێکدانەوەیەکی نادیارییکراوی هەیە.

٧٤_ (ا) [ منم [ ئەو کەسەی [ کە [p ro لە تۆی دا ]]]]

(ب) [منم [ئەو کەسەی [کە [تۆ t لێتداϕ]]]]

لەم ڕستانەدا، هەر یەك لە دروستەکانیان (ڕستەی شەقکراوو ڕستەی سەرجێناویی) دروستەی سینتاکسیی داخراوە. وەك ئەم چەشنە ڕستانە، بۆیان هەیە ڕستەی پرسیاریش بن. لەبەرئەوەی پێویستە ڕستەی سەرجێناویی لەڕووی سیمانتیکییشەوە داخراوبێت و لەبەرئەوەی وشەی پرسیار نیشانەی تایبەتیی [-دیارییکراو ] ی هەڵگرتووە، ڕستەی سەرجێناویی بۆی نییە هیچ وشەیەکی پرسیاری تێدابێت.

٧٥_ *(ا) [تۆیت [ ئەو کەسەی [ کە p ro [ لە کێت دا ]]]]؟

*(ب) [تۆیت [ئەوکەسەی [کە [کێ t لێیدا ϕ ]]]] ؟

بەپێچەوانەوە، ڕستەی شەقکراو دەتوانێت ڕستەی پرسیار بێت؛ چونکە ڕستەی شەقکراو سەرێکی ڕستەی سەرجێناویی تێدانییە، کە نیشانەی [ -دیارییکراو] ی پێببەخشێت.

٧٧_ (ا) [کێ بوو [ئەو کەسەی [ کە [ p ro لە تۆی دا ]]]]؟
(ب) [ئەو کەسەی [ کە [pro لە تۆی دا [ کێ بوو ϕ ]]]]؟
٧٧_ (ا) [کێ بوو ϕ [ئەوکەسەی [ کە [تۆ t لێت دا]]]]؟
(ب) [ئەو کەسەی [ کە [تۆ t لێتدا [ کێ بوو ϕ ]]]]؟

با ئەوەمان لەبەرچاو بێت، کە ڕستەکانی (٧٥) و (٧٦) نەبوونەکراون؛ چونکە ئەو ڕێسا لێکدەرەوانەیان بریندارکردووە، کە بە پەیوەندیی سیمانتیکیی نێوان سەری ڕستەی سەرجێناویی و ڕستییلەی ڕستەی سەرجێناوییەوە پەیوەستن.
با وەهای دابنێم، کە ڕستەکانی (٧٥) و (٧٦) لەڕاستییدا ئەو جۆرە ڕێسا لێکدەرەوانەیان بریندارنەکردووە. ئەمجا من چاوەڕێدەکەم، کە ئەو ڕستانەی، لەو دروستانە دەچن و هەمان نرخیان هەیەو کە هیچ سەرێکی ڕستەی سەرجێناوییان تێدا نییە، لەو ڕستانەبن، کە لەڕووی سینتاکسییەوە فۆرمی، تەواو دروستیان هەیەو لەڕووی سیمانتیکییەوە پەسەندن. لەڕاستیشدا ئەمە هەر وەهایە. چونکە هەر وەك چۆن ڕستەکانی (٧٨) دەریدەخەن، ڕستەیەکی پرسیار لە ڕستەیەکی شەقکراودا شکاوەتەوە، کە خۆی لە ژێر ڕکێفی فرێزێکی ناوییدایە.

٧٨_ (ا) [ئارام! [ئازاد بوو ϕ [ pro پرسیی ϕ [ pro لە کێی داوە ]]]]؟
(ب) [ئارام! [ ئازاد بوو ϕ [ pro پرسیی ϕ [ کێ t لێیداوە]]]] ؟

با وەهایشی دابنێم، کە وشەی پرسیار لەڕاستییدا نیشانەی تایبەتیی [ -دیارییکراو ] ی هەڵگرتووە. من ئاشکرایە لام، کە وشەی پرسیار دەتوانرێت لەڕێی قورساییخستنەسەرێکی

تایبەتیی و تاڕادەیەك بەهێزەوە بەرزو دیار ئاشکرابکرێت و کە لێکدانەوەیەکی گشتیی، نەك تایبەتیی، وەردەگرێت. ئەو وشەی پرسیارەی، کە خۆی لەدەقێکی سینتاکسییدا دەبیینێتەوەو ڕێدەدات، بەتایبەتیی قورسایی بخرێتەسەر، لەو ڕێیەوە نیيشانەی [ + دیارییکراو] ~ [ +دیار] وەردەگرێت. بۆیە ئەو ڕستانەی، کە لێکدانەوەیەکی گشتییان تێدایە، لە ڕووی سینتاکس و سیمانتیکەوە تەواوو پەسەندن.

٧٩_ [ئازاد کوڕێکە [کێ دەتوانێت [ p ro لێی t بدات ]]]؟

ئەم ڕوونکردنەوە پەسنکەرانەیە لەگەڵ ئەو بۆچوونەمدا یەکدەگرێتەوە، کە دەڵێت: ڕستە بە چەشنە جۆراوجۆرو جیاوازەکانی قورساییخستنەسەرەوە لێکدانەوەی واتایی جۆراوجۆر دەردەبڕدرێت. لە (٧٩) دا، بۆیە وشەی پرسیارەکە دەتوانێت قورساییەکی تایبەتیی وەربگرێت، چونکە لەبەردەم ئاوازبڕین/کەوتنێکدایە[١١٣٦]. ئەگەر وشەی پرسیارەکە لە شوێنێکی سینتاکسیی و بەتایبەتیی لە دەوروبەرێکی فۆنۆلۆژیی وەهادا بێت، کە نەتوانێت تێیدا لەو چەشنە قورساییخستنەسەرە وەربگرێت، ئەوا ڕستەکە ڕێپێنادرێت. با ئەم ناوەرۆکە بەشێوەیەکی دییکە دەببڕم و دایبڕێژم: ئەگەر وشەی پرسیارەکە هیچ ناوەرۆکێکی گشتیی دەرنەبڕیی، ئەوا وشەی پرسیارەکە هەر نیيشانەی [ -دیارییکراو] ی دەبێت و بەو نیيشانەیەوە دەمێنێتەوە. دەوروبەرە فۆنۆلۆژییەکە ڕێنادات، بۆ نموونە، کە وشەی پرسیارەکەی (٨٠) قورساییخستنەسەرێکی تایبەتیی وەربگرێت. بۆیە ناتوانرێت لێکدانەوەیەکی گشتیی بخرێتە تەك ئەو ڕستەیە؛ لەبەر ئەمەیە وەك ڕستەیەکی زمانی کوردیی ڕێپێنادرێت.

٨٠_ * [ئازاد کوڕێکە [ p ro دەتوانێت [ pro لەکێ بدات ]]]؟

ئەگەر هەلومەرجی ئەوە هەبێت، وشەی پرسیارەکە لەسەر ئاستی سینتاکسیی یان فۆنۆلۆژیی دیارییبکرێت، ئەوا دەتوانرێت ڕستەکە ڕزگاربکرێت. ئەمە لە (٧٩) دا لەڕێی قورساییخستنەسەری جەختخراوەسەرەوە ئەو هەلومەرجەی بۆ ڕەخساوە.

حاڵەتێکی دییکە، ڕستەکانی لەم چەشنەن. ئاشکرایە، کە بردنە پێش ~ بردنەسەرەتای[١١٣٧] وشەی پرسیارەکە لە (٨١) دا بۆ بەرزترین شوێنی Comp مەرجی هاوسێیەتیی[١١٣٨] بریندار‌دەکات. بەڵام ڕستەکە دروستەیەکی سینتاکسیی فۆڕمدروستی هەیە. ئەمەیش ئەوە

---

[١١٣٦] Intonationsbruch

[١١٣٧] Frontierung

[١١٣٨] Subjazensbedingung

دەگەیەنێت، کە گواستنەوەی پیچەوانەی وەچەپێکهاتەیەك لەم ڕستەیەدا جێبەجێنەکراوەو کە دانانی قورساییخستنەسەرێکی بەهێز یان جەختخراوەسەر تەنها جیاوازیی لە واتادا دەردەبڕێت.

٨١_ (ا) ئازاد دەتوانێت p ro لەکێ بدات ؟
(ب) ئازاد دەتوانێت pro لەکێ بدات!

لەکاتێکدا (٨٢ (ا)) پرسیارێك دەردەبڕێت، (٨١ (ب)) سەرسوڕمانێك بەدەستەوەدەدات. ئەمەیش لەوڕێیەوە هێنراوەتەدییتن، کە بەشی کرداری ڕستەی دووهەمیان قورسایی جەختلێکراوی خراوەتەسەر.
ڕستەی وەك (٧٥) و (٨٠) ڕێپێنەدراوە، چونکە ڕێسای سینتاکسییان بریندارکردووە، بەڵکو بۆیە ڕێیانپێنادرێت، چونکە بریندارکردنی یاسالێکدەرەوەکان نیشاندەدەن. بەراوردکردنێك لەنێوان (٧٩) و (٨٠) دا ئەم بانگەشەی گریمانەیە ڕووندەکاتەوە. زمانی کوردیی زمانێکە لەسەر بنەمای "پەیوەندییە ئەندازیارییەکان"[١١٣٩]. ڕەگەزە ڕێزمانییەکانی ڕستەکانی شوێنی چەسپاویان لە ڕستەدا هەیە. ئەو ڕستانەی، کە ڕەگەزە ڕێزمانییەکانیان لە شوێنە ڕاستەکانی خۆیاندا نیین، لەسەر ئاستی سینتاکسیی ڕێیانپێنادرێت. بەپێی ئەم لێکدانەوەو دارشتەیە، ڕستە لەسەر ئاستی سینتاکسیی و لەسەر ئاستی سیمانتیکیی بابەت و کەرەستەی مەرج و سنووربۆدانانەکانی هەر دوو پێکهاتەکەن. لەبەر سروشتی پەیوەندیی نێوان پێکهاتەی سینتاکسیی و پێکهاتەی فۆنۆلۆژیی کوردیی، وەهای دادەنێم، کە ڕستەکانی زمانەکەمان پەیڕەویی ڕێسا توندوتیژەکانی پێکهاتەی فۆنۆلۆژیش دەکەن. ئەو مەرج و سنووربۆدانانە، وەك من بۆی دەچم، لەتەك قورساییخستنەسەرو نموونەکانی ئاوازدا، دروستەکانی برگەو دروستەفۆنۆتاکتیکییەکانیشن. ئەمەیش واتای ئەوەیە، کە زمانی کوردیی مەرجە سیمانتیکییەکانی بردوەتەوە یان گێڕاوەتەوە بۆ سنووربۆدانراوە فۆنۆلۆژییەکان. بۆ نموونە، دەتوانرێت بانگەشەی ئەو گریمانەیە بکرێت، کە هەندێك لە چەشنەکانی ڕستە هەندێك نموونەی تایبەتیی قورسایخستنەسەرو ئاوازیان هەیە یان کە هەندێك برگەی دیارییکراو نابێت لەبەر هەندێك ڕەگەزی سینتاکسیی دیارییکراو هەندێك چەشنی دیارییکراو لە قورساییخستنەسەر وەربگرن. هەموو ئەم بۆچوون و بانگەشەی گریمانانەو ڕاستییەدەستکەوتووانە لەگەڵ ئەو هیپۆتێزەیەدا (تێزەدا) یەکدەگرنەوە، کە بەرپەرچی بوونی یاسای گواستنەوەی " α بجوولێنە" لە سینتاکسدا یان لە پێکهاتەی فۆرمی لۆژیکیی ڕێزمانی کوردییدا دەداتەوە.

---

[١١٣٩] Sie ist eine konfigurationelle Sprache

## ٥/٨) α بجووڵێنەو پەیوەندیی بکەرو بەشی کردار[١١٤٠]

ڕستە دەبێت لەسەر دروستەی ڕووکەش بکەری هەبێت. پەسندترین بکەری بەشی کردار ئەو ئارگومێنتەیە، کە لەلایەن بەشی کردارەکەوە، وەك سەرێکی حوکمکەر، ڕۆڵێکی بابەتانەی پێدەدرێت. بەم پێشەکییە بانگەشەی ئەو گریمانەیە دەکرێت، کە بەشی کردارەکە لەسەر دروستەی ڕووکەش بە ئارگومێنتێکەوە بەستراوەتەوەو ئارگومێنتەکەیش بکەرەکەیەتی. ئەم پەیوەندییە مەرجێکی فۆڕمدروستیی دروستەی ڕووکەشە. بەپێی ڕۆتشتاین[١١٤١] گواستنەوەکان لەنێوان دروستەی قووڵ و دروستەی ڕووکەشدا ڕوودەدەن، بۆئەوەی ئەم مەرجی یاسایە، کە لەلایەن ئەوەوە ناوی "یاسای بەستنەوەی بەشی کردار[١١٤٢]" ی لێنراوە، لەسەر دروستەی ڕووکەش جێبەجێبکرێت. بۆ تاقییکردنەوەی ئەم بانگەشەی گریمانەیە ئەو یاسای گواستنەوەیەو "بکەری کەمنرخ[١١٤٣]" ی وەك دوو ڕێبازی بنجیی و سەرەتایی بەکارهێنا. بۆیە ئەم یاسای بەستنەوەیە بۆ لێکۆڵینەوەو توێژینەوەکەی منیش گرنە.

بەڵام بەگوێرەی گشت ڕوونکردنەوەکانی تاوەکو ئێستام، ئەو یاسای گواستنەوانە هیچ کاریگەرییەکی لەو چەشنانەیان لە زمانی کوردییدا نییە. بۆ نموونە، یاسای گواستنەوەی فرێزی ناویی لەم زمانەدا دەرکەوتنێکی نییە. لە پێکهاتووەکانی بکەرنادیارو "وادەردەکەوێت و لەوەدەچێت[١١٤٤]" دا نە ئارگومێنتە ناوەکییەکەو نە ئارگومێنتە ناوەکییەکەی سەرە حوکمکەرەکە لەسەر دروستەی ڕووکەش بۆ شوێنی بکەری ڕستەکە دەگوێزرێتەوە.

٨٢_ pro لەوەدەچێت، نەوزاد نەخۆش بێت.
 j j i i

لەم ڕستەیەدا بکەرەکە "نەوزاد" ناتوانێت، لەبەر نەگونجانی "ڕێکەوتنی بکەرو بەشی کردار"، بۆ شوێنی بکەری ڕستەی "وادەردەکەوێت ~ لەوەدەچێت" بگوێزرێتەوە.

٨٣_ * (ا) نەوزاد لەوەدەچێت، pro نەخۆش بێت.
 i i i i

---

[١١٤٠] Bewege α und die Subjekt- Prädikat-Beziehung

[١١٤١] Rothstein (1983)

[١١٤٢] predicate linking rule

[١١٤٣] pleonastisches Subjekt (کۆکراوە، زۆرتر لەپێویست)

[١١٤٤] in Passiv- und seem-/scheinen-Konstruktionen

(ب) ئەوزاد! pro لەوەدەچێت، pro ئەخۆشبێت.

من ئەبوونەکراویی ڕستەکانی (٧٥) و (٨٠) م گێڕایەوە بۆ زاراوە سیمانتیکییەکەی [ -/+ دیارییکراو] و بەم نیشانەیەوەم بەستەوە. ڕاستیی ئەم سەرەنجامەم لەو ڕێیەوە ڕووندەکرێتەوە، کە هەم ڕستەی (٨٤) و هەم ڕستەی (٨٥) دەتوانن ڕستەی پرسیاری زمانی کوردیی بن.

٨٤_ pro لەوەدەچێت، کێ ئەخۆش بێت؟
i i i i

٨٥_ کێ لەوەدەچێت، pro ئەخۆش بێت؟
i i i i

ڕستەی (٨٣) لەسەر ئاستی سینتاکسیی ڕێپێنەدرێت. بۆیە ناتوانرێت لەسەر ئاستی فۆنۆلۆژیی هیچ ڕستەیەکی پرسیار لەو ڕستەیە هەڵبگوێزرێت. لەم ڕستانەوە ئەو دەرەنجامە هەڵدەهێنجم، کە ئەو ڕستانەی ڕێیانپێنەدرێت و لەڕێی چەشنێکی تایبەتیی قورساییخستنەسەرەوە ئێستا پەسەندن، لەسەر ئاستی سینتاکسیی ڕێیانلێنەگیراوە، بەڵکو لەسەر ئاستی سیمانتیکیی یان لەسەر ئاستی فۆنۆلۆژیی ڕێیانپێنەدراوە. بەواتا: ڕستەکانی (٧٥)، بۆ نموونە، هیچ ڕێسایەکی سینتاکسیی وەك مەرجی هاوسێیەتییان بریندارنەکردووە، بەڵکو بریندارکردنەکانیان سنووربۆدانانە سیمانتیکیی و فۆنۆلۆژییەکانیان گرتووەتەوە.

با ئێستا بێمەوە سەر یاسای جوڵاندن و گواستنەوەی فرێزی ناویی. ڕستەکانی "وادەردەکەوێت" یاسای گواستنەوەی فرێزی ناویی نیشاننادەن. بەگشتیی، سەرە حوکمکەرەکان "کردار" ی زمانی کوردیی ئارگومێنتی دەرەکیی زگماکییان[١١٤٥] هەیە، کە وەك ئارگومێنتە بابەتییەکان[١١٤٦] وەك بکەری دەستووریی[١١٤٧] بەشی کرداریی لەسەر دروستەی ڕووکەش گۆدەکەن. ئەو کردارە بێ بەرکارییەڕاستەوخۆیە[١١٤٨] یان کرداری بکەرنادیار، بۆ نموونە، کرداری ئارگومێنتیین[١١٤٩] و ڕۆڵی بابەتییانە[١١٥٠] دەبەخشن. بەمانەوەیە، کە

---

[١١٤٥] inhärente externe Argumente

[١١٤٦] thematische Argumente

[١١٤٧] formelle Subjekte

[١١٤٨] das nicht-akkusativische Verb

[١١٤٩] Argumentverbs

[١١٥٠] themen-Rolle

سـەلرەحوكمكەرەكان لەسـەر دروسـتەی رووكـەش دەبەسـترێنەوە. بـەم پێیـە ئارگومێنتەدەرەكییەكـە هەمیشـە بـۆ گـەورەترین پرۆژەكـە[1151] هەیـەو ئامادەیـە. یاسـای بكەرنادیاریی[1152] دەتوانێت بەسەر هەر كردارێكدا، بەبێ یان بە ئارگومێنتێكی ناوەكییەوە، جێبەجێبكرێت. ئا لەمەوەیە، كە مۆرفۆلۆژیی بكەرنادیار دەتوانێت بەسەر كردارەتێپەڕەكان و بەسەر كردارەتێنەپەڕەكاندا بێتەجێبەجێكردن.

٨٦_ سیروان سەمادەكات.

٨٧_ سەما كرا.

كەواتـە لـەو كردارانـەی، كـە لـە بنـەڕەتدا كـرداری تێپیـەڕ نیـین، دەتوانرێـن ڕاسـتەوخۆ فۆرمەكانی بكەرنادیار[1153] هەڵبگوێزرێن. بۆیە چیدیی گرنگ نییە، ئەگەر كردارەكە شوێنێكی Comp ی بێت، وەك لە (٨٧) دا، یان كردارێكی خاوەن دروستەی ساكاربێت، وەك لـە (٨٨) دا. دەسـتكەوتنی ڕسـتەی بكـەرنادیاری بێكـەس[1154] لـەو كردارانـەی، یـەك شـوێنیان بـۆ ئارگومێنتێك هەیە[1155]، دەتوانرێت لەو ڕێیەوە ڕوونبكرێتەوە، كە ئەم كردارانە یان دروستەی لێكدراویان[1156] هەیە، یان لە بنەڕەتدا كرداری ئارگومێنتین[1157].

٨٨_ ڕیشی تاشرا.

دانانی كەرەستە سفرە جێناوییەكـە[1158] pro لـە شـوێنی فرێـزی نـاویی بكـەری زمانـە ڕۆمانییەكانی وەك ئیسپانیی و ئیتالیی لەلایەن ڕۆتشتاینەوە بە "یاسای بەستنەوەی بەشی كردار"[1159] ڕوونكراوەتەوە. چونكـە ئـەو كەرەسـتەجێناوییە لەسـەر دروسـتەی ڕووكـەش وەك بكەری دەستووریی دەردەكەوێت.

---

[1151] maximale Projektion

[1152] Passivregel

[1153] Passiv-Formen

[1154] impersonale Passivsätze

[1155] einstellige Argumentverben

[1156] zusammengesetzte Strukturen

[1157] Argumentverben

[1158] das pronominale Null-Element

[1159] predicate linking rule

لەو زمانانەی، کە لەسەرەوەدا ناویانبرا، pro لە دوو حاڵەتدا دەردەکەوێت:

(ا) پاش ئەوەی بکەرە فەرهەنگییەکە[١١٦٠] بەرەولای ڕاست بۆ ڕستەکە براو کرا بەهاوسێی کردارەکە، بکەرە سفرەکە pro لەبری دادەنرێت. ئەو شوێنەی بکەرە سفرەکەی pro، لەگەڵ بکەرە بنجییەکە هاونیشانەکراوە[١١٦١]، مەرجەکانی یاسای بەستنەوەی بەشی کردار جێبەجێدەکەن و دەیهێننەدییتن.

89- (a) [Giovani [scrive una lettra] VP] S

(b) [pro [scrive una lettra] VP [Giovani] VP S

i i

"جیۆڤانیی نامەیەکی نوسیی."

(ب) لە حاڵەتی دووهەمدا کاتێك pro دادەنرێت، کە یاسای " α بجووڵێنە" بەزۆرو بەناچاری جێبەجێکرا. ئەمەیش لەو بارودۆخانەدا ڕوودەدات، کە سەرەکردارییەکە[١١٦٢] ی بەشی کردار، کردارێکی بکەرنادیار یان کردارێکی بێ بەرکاریی ڕاستەوخۆیە[١١٦٣]؛ ئەمەیش بۆئەوەیە، کە ئەم بەشەکردارییە لەسەر دروستەی ڕووکەش بکەرێکی دەستووریی پێبدرێت.

90- (a) [Molti studenti [furono arrestati t ] VP ] S

i I

(b) pro [furono arrestati molti studenti ] VP ] S

i i

"خوێندکارانێکی زۆر گیران."

لە کاتی ئەم ڕوونکدنەوانەمدا، ئاشکرابوو، کە نە پێکهاتووی بکەرنادیارو نە ڕستەکانی "وادیارەو لەوەدەچێت" پێویستیان بە گواستنەوەیەك لە دروستەی قووڵەوە بۆ دروستەی ڕووکەش نییە. ئەمە ئاماژە بەوەدەدات، کە بوونی یان دەرکەوتنی بکەرەسفرەکە لە زمانی کوردییدا مەرجی سینتاکسیی دییکەی هەیە وەك لەو مەرجانەی بە پەیوەندیی بکەرو بەشی کردارەوە بەندن. بوونی یان دەرکەوتنی ئەم کەرەستەیە وەك بکەری ڕستەی سەرەکیی یان

---

[١١٦٠] das lexikalische Subjekt

[١١٦١] koindiziert

[١١٦٢] der verbale Kopf

[١١٦٣] nicht akkusativisches Pridikat/Verb

ڕستەی وەچەپێکهاتە سەرپشکییە یان بەزۆرو خورتەکییە[١١٦٤]. ئەو بکەرەسفرەی لەناو کەوانەیەکدا نووسراوە، ئەوە دەبەخشێت، کە دانانەکەی سەرپشکییە.

٩١_ (pro) دەیانەوێت، (pro) بەپێی خۆیان بێن.

گواستنەوەی سەرپشکیی بکەری ڕستەکە بۆ کۆتایی ڕستەکە نابێتەهۆی ئەوەی بکەرەسفرەجێناوییەکە دەربکەوێت. ئەمەیش لەوڕێیەوە پشتییدەگیرێت، کە ئەنافەرەکە (جێناوەخۆییەکە[١١٦٥]) ی (٩٢) لەلایەن هیچ کەرەستەیەکەوە وەچەئاڕاستەنەکراوە[١١٦٦].

٩٢_* خۆیان هاتن، ئەوان

"ڕستەی بکەرنادیار"و "ڕستەی وادەردەکەوێت" دەریدەخەن، کە گواستنەوەی فرێزی ناویی ناتوانێت ببێتە هۆکارێك یان کارتێکەرو بزوێنەرێك[١١٦٧] بۆ پەیوەندیی بکەرو بەشی کردار.

## کورتەو پوختەو ئەنجاملێکدانەوە:

دروستە گونجاوو لەبارەکان بۆ یاساکانی گواستنەوە گرنگترین دەقەسینتاکسییەکانن. ئەم دروستانە لە زمانی کوردییدا لەڕێی پرۆسەرێزمانییەکانی "بە فەرهەنگیی نەبوونی بکەری ڕستە[١١٦٨]" و "بەکلیتیك _بوون[١١٦٩]"ەوە بەشێوەیەك تێکدراون و گۆڕدراون، کە نییشانەو هەلومەرجی سینتاکسیی گونجاو نە بۆ جێبەجێکردنی ئەو یاسایانەو نە بۆمەرجە شوێنییەکان نارەخسێنن. ئەمە ئەوە دەبەخشێت، کە بۆ مەرجەشوێنییەکان لە زمانەکەماندا پەنادەبرێتەبەر پێکهاتەی سینتاکس. دانانی چەشنەجیاوازەکانی قورساییخستنەسەر بۆ ئەو مەبەستەیە، لێکدانەوەی واتایی جۆراوجۆر بەرجەستەبێن. ڕستەکانی (٣١) و (٣٢) و (٣٤) و (٤٨) و (٥٠) ئاشکراو ڕوونترین نموونەن بۆ ئەوە. لەبەرئەوەی کلیتیکەکان و بکەرەسفرە جێناوییەکە بوونی پەیوەندیی "ئۆپەراتۆر _ ڤاریابل" پووچەڵدەکەنەوە، ناتوانرێت پەیوەندییەکی کارلەیەکترییکردن لەنێوان مەرجەشوێنییەکان و دانانی قورساییخستنەسەری

[١١٦٤] optional oder obligatorisch

[١١٦٥] Reflexivpronomen

[١١٦٦] c-kommandieren

[١١٦٧] motivieren

[١١٦٨] Nicht-Lexikalisierung des Satzsubjektes

[١١٦٩] Klitisierung

جەختخراوەسەردا بەدییبکرێت. نیشانەو مۆرکە ڕێزمانییەکانی [ +/ -دیارییکراو ] ڕەگی قووڵی لەم زمانەدا هەیە. کە ڕستە سەرەتایی و بەراییەکانی وەك (٩٣) نەبوونەکراون، دەتوانرێن تەنها لەو ڕێیەوە ڕوونبکرێنەوە، کە ئەو ڕێسا واتاییانە بریندارەکەن، کە بەو نیشانەو مۆرکانەوە بەندن و بۆ ئەوان دەگەڕێنەوە؛ چونکە ڕێ بە هیچ ڕێکەوتنکیی بکەرو بەشی کردار نادەن.

٩٣_ * پیاو هات

بۆیەکە ڕەواو ڕاستە، مەرجی هاوسێیەتیی بگێڕدرێتەوە بۆ ڕێسا لێکدەرەوەکان و ئەمان بکرێن بەو مەرجە. کە ڕستەی لەم چەشنەی لای خوارەوە ڕێیان پێدەدرێت و پەسندن، دەتوانرێت لەو ڕێیەوە ڕوونبکرێنەوە، کە کرداری ویست و ئارەزوویان[١١٧٠] تێدایە.

٩٤_ پیاو بمرێت، باشترە!

گومان لەوە ناکەم، ئەگەر ئێنکلیتیکەکانی ئەم کردارانە لەوانەی چەشنەکانی دییکەی کردار جیاواز بن یان نا. چونکە ڕەنگەو ئەگەری ئەوەیش هەیە، کە کەرەستەی سەرەتایی هەم نیشانەو مۆرکی مۆرفۆلۆژیی و هەم سینتاکسییان هەبێت. نیشانەی خستنەپاڵ / i / و مۆرفێمی خاوەندارێتیی / i /، بۆ نموونە، نیشانەیەکی فۆنۆلۆژییان هەیە. کۆپولا[١١٧١] و ئێنکلیتیکەکانیش (AGR) مۆرفێمێکی فۆنۆلۆژیی[١١٧٢] پێکدێنن.

٩٤_ (pro) جوانە.
٩٥_ (pro) جوانن.

یاسا سینتاکسییەکانی، بۆ نموونە وەك یاساکنی گواستنەوە، بابەتی مەرجی هەاوسێیەتیین. یاساکانی لێکدانەوە یاسا سووڕیی و دووپاتبووەکان[١١٧٣] نیین، بۆیە نەبوونەتە بابەتی مەرجی هاوسێیەتیی. بەپێی ڕوونکردنەوەوکانم، ئەو ڕستانەی لەم بەشەدا ڕێیانپێنادرێت، ڕێساکانی لێکدانەوەیان بریندارکردووە. لەبەر ئەمەیە، کە نە ڕێساکان و نە

---

١١٧٠ Subjunktiv-Verb

١١٧١ Kopula (بڕوانە ئەوەی بە کرداری لاواز /ە/ و بە جێناوەلکاوەکان /م، ت، .../ ناسراون (وەرگێڕ))

١١٧٢ بەراوردی بکە لەگەڵ مۆرفێمەکانی، کە بە portamonteu mophems ناسراون (وەرگێڕ).

١١٧٣ Zyklische Regeln

دروستەکانی برگە بابەتی مەرجە سینتاکسییەکان نین. ئەم ڕاستییە دەستکەوتوانە ڕوونیدەکەنەوە، بۆچی ڕێ بەم چەشنانەی ڕستە دەدرێت.

جوڵاندن و گواستنەوەی فرێزی ناویی:

٩٦_ V´´ N´´ ئەم ماڵانە! V´´ Expl. باوەڕدەکرێت V´´ کە V´ شیروان t سووتاندبنیی؟

دەرهێنان[١١٧٤] لە فرێزێکی ناویی (پێکهاتووی خستنەپاڵ[١١٧٥])

٩٧_ ڕەخنەیەکی پەرتووکە نوێکەی کوردۆ ئەمڕۆ کەوتە بازاڕەوە.

٩٨_ ڕەخنەیەك ئەمڕۆ کەوتە بازاڕەوە، هی ~ هینی کتێبە تازەکەی کوردۆ.

ڕستەی پرسیاری شکاوە[١١٧٦]:

٩٩_ pro لەیادتە، کێ هەمیيشە ڕاویدەکرد.

جێگۆڕکی بۆلای چەپ[١١٧٧]:

١٠٠_ ئارام! ئازاد پرسیی، کێ t لێیداوە ϕ؟

١٠١_ ئەگەر pro مەبەستت کوڕەکانی من بێت، من هەرگییز باوەڕ بەو درۆیانە ناکەم، کە تۆ t بۆیان دەکەیت.

کلیتیکەکە لە (١٠١) دا ئاماژە بە شوێنپێکە دەدات و بۆ ئەوە. لەڕێی ئەم شوێنپێیەوە ئاماژە بە فرێزەناوییەکەی "کوڕەکان" دەدات. ئەگەر بلێین، کە لەو ڕستەیەدا گواستنەوەیەك ڕوویداوە، ئەوا دەڵێین، کە گواستنەوەیك بۆلای چەپ ڕوویداوە؛ بەڵام ئەم دیاردەیە لە شییکردنەوەیەکی گواستنەوەیی ڕستەکەدا بریندارکردنی مەرجەکانی CN PC و wh-Insel

---

[١١٧٤] extrahieren

[١١٧٥] Genetivkonstruktion

[١١٧٦] eingebetet Fragesätze

[١١٧٧] Linksverlagerung, leftdislocation

(دورگەی وشەی پرسیار) و مەرجی هاوسێیەتیی تێدا دەبێت. چونکە ڕستەکە دروستەیەکی فۆڕدروستیی ڕێزمانیی هەیە، بۆیە نابێت گواستنەوەیەکی لەو چەشنە نە ڕوویدابێت و نە جێبەجێیشکرابێت.

وشەی پرسیار لە زمانی کوردییدا وەك لە کوانتۆرچوو یان وەك کوانتۆر ناناسرێتەوەو دەستنییشاننناکرێت. کەواتە نابێت لێکدانەوە جۆراوجۆرەکانی ڕستە بگێڕیینەوە بۆ پەیوەندییە نادیارەکەی "کوانتۆر _ڤاریابڵ" و ڕستەکە وەك ئەو پەیوەندییە شیبکەینەوە. لێکدانەوەی ڕستە بەگشتیی وابەستەی دروستەسینتاکسییەکانن و بەتایبەتیی لەڕێی شوێنەسینتاکسییەکانەوە دیاییکراون.

کە زمانی کوردیی بۆ مەرجی هاوسێیەتیی پرۆسە ڕێزمانییەکانی خستووەتەکار، نابێت وەك بریندارکردنی "جیهانێتیی"[1178] ئەم ڕێسایەو لادان لێی لێکبدرێتەوە. ئەو ڕێسایە، وەك چۆن بۆ زمانەکانی وەك ئینگلیزیی دەخوات، هەر بەو شێوەیەیش بۆ زمانی کوردیی دەخوات و لە کاردایە. تێبینیی ئەوە بکە، چۆن شوێنە سینتاکسییەکەی ڕستەی شەقکراو لەم ڕستانەی لای خوارەوەدا لێکدانەوەی ڕستەکانی دیارییکردووە.

١٠٢_ (ا) بەیانیی بوو ɸ، کە ئازاد گوتیی، قەڵاکە گیرا ɸ.
(ب) بەیانیی بوو ɸ، ئەو کاتەی، کە ئازاد گوتیی، قەڵاکە گیرا ɸ.

١٠٣_ (ا) ئازاد گوتیی، بەیانیی بوو ɸ، کە قەڵاکە گیرا ɸ.
(ب) ئازاد گوتیی، بەیانیی بوو ɸ، ئەو کاتەی، کە قەڵاکە گیرا ɸ.

---

[1178] Universalität dieses Prinyips

# بەشی نۆهەم

## مۆدێلی ڕێزمانی گواستنەوە

ئەم بەشە بریتییە لە چەند مشتومڕو هەڵسەنگاندنێکی پێکهاتەی گواستنەوە. بۆ ئەم مەبەستەیش لە چەند مەودایەکی دیاریکراوی سینتاکسی کوردیی ورددەبمەوە. لە بەشەکانی پێشوودا یاساکانی گواستنەوە، لە جۆری "چشتێك لە α بکە"، ڕوونکرایەوە. لێرەیشدا تیشك دەخرێتەسەر چەند لایەنێکی دیکەی ئەم پێکهاتەیە: ئەو ئەگەرو هەلومەرجەی جوڵاندن و گواستنەوانەی دیکەن، کە پێکهاتەی گواستنەوەکە تەواودەکەن. لەتەکییدا پێویستە پەسنکردنی گشت پژێمەکەی ڕێزمانی کوردیی ڕەچاوبکرێت. با لە سەرەتاوە لێوردبوونەوەکەم بە زاراوەکانی دروستەی قووڵ و دروستەی ڕووکەش دەستپێبکەم.

### ١/٩) دروستەی قووڵ و دروستەی ڕووکەش

ئەگەر لەو هیپۆتێزەوە دەستپێبکەم، کە دەبێت ئەو زنجیرە وشانەی، هەمان واتایان هەیە، دروستەیەکی بنەڕەتیی نادیاری هاوبەشیان هەبێت، ئەوا دەبێت ئەودروستەنادیارە گشت ئەو کەرەستەسەرەتایی و پەیوەندییانەی وەچەپێکهاتەکانی تێدابێت، کە بۆ هەڵگواستنی ناوەڕۆکی دروستەکە[١١٧٩] پێویستن؛ دروستەیەکی، بەم شێوەیە دیارییدەکرێت، بە دروستەی قووڵ ناسراوە. بەرامبەر بە دروستەنادیارەکەی ڕستەکە، دروستەی وەچەپێکهاتە ڕاستەوخۆکەی زنجیرەوشەکە، ناوی دروستەی ڕووکەشی لێنراوە.

---

١١٧٩ Inhaltsstruktur




## ٢/٩) پێکهاتەی گواستنەوە

لەبەرئەوەی پێکهاتەی گواستنەوە لە یاساکانی گواستنەوە پێکهاتووە، دەمەوێت هەر لە سەرەتاوە خۆم بە یاساکانی گواستنەوەوە خەریکبکەم. یاسای گواستنەوەی "چشتێك لە α بکە" لە دوو بەشدا تاووتۆێکراو خرایەڕوو. ئەو یاسایانەی گواستنەوە، کە تاوەکو ئێستا ڕوونکراونەتەوە، بەم سەرەو ڕیزبوونەی لای خوارەوە هەڵدەسەنگێنرێن. هەموو یاساکانی گواستنەوەی ڕێزمانی بەرهەمهێنان بە گواستنەوەبەراییەکان[1180] ڕووندەکرێنەوە. لەو یاسایانەی جوڵاندنی (١) بەتەنها یاساکانی (١ (ا)) و (١ (ب)) بە یاسابەراییەکانی گواستنەوە ناسراون.

١_ گواستنەوە بەراییەکان

(ا) هەڵواسین[1181] یان زیادکردنی وەچەپێکهاتەیەك[1182] بۆ دروستەی (وەچە پێکهاتەیەك[1183]؛

---

1180 elementare Transformationen

1181 Adjunktion

1182 Konstituente

1183 Konstituentenstruktur

(ب) جێگۆڕکێ[١١٨٤]، بەواتا جێگۆڕکێ بە وەچەپێکهاتەکان؛
(پ) قرتاندن و لابردنی[١١٨٥] وەچەپێکهاتەیەکی دروستەی (وەچە) پێکهاتەیەك.

پاش ئەم ڕوونکردنەوە سەرەتاییە، ژمارەیەك لە یاسای گواستنەوەی دیکە دەخرێنەڕوو، کە بۆ هەڵگواستنی ڕستەبەراییەکان[١١٨٦] (ئەو ڕستانەی، کە لە تەنها ڕستەیەك پێکهاتوون) و ڕستەلێکدراوەکان[١١٨٧] بەرپرسیارن. کەواتە وەهای دادەنێم، کە هەر یەکێك لەو ڕستانە گواستنەوەیەك یان چەند گواستنەوەیەکی لەوانەی ژمارە (١) یان تێدا جێبەجێکراوە. بۆ ڕوونکردنەوەی دروستەیی ئەو دوو ڕستەیەی داهاتوو، یاساکانی دروستەی فرێزی بۆچوونەپێشیینەییەکانی ڕێزمانی بەرهەمهێنان بەکاردەهێنم[١١٨٨].

## ٩/٢-١) ئەو گواستنەوانەی لە زمانەکەماندا هەن

ئەگەر ئێمە بۆ پەسنکردنی ڕستەی ئاڵۆز پەناببەینەبەر دروستەی قووڵ، ئەوا دەتوانرێت باش لەو ڕێیەوە پەسنبکرێت، کە یاسابەراییەکەی (١ (پ)) ی جێبەجێکردبێت.

٢_ (ا) ئازادو ئارام چوون بۆ قوتابخانە.
(ب) ئازاد نان دەخوات و ئارام سێو.

ڕستەکانی (٢) تاڕادەیەك دروستەی قووڵی وەك ئەوانەی (٣) یان هەیە. داڕشتەی خراوەڕووی دروستەی قووڵ نییشانیدەدات، کام وەچەپێکهاتانە چیدیی ئامادەنین و نابیسترێن؛ دەریشیدەخات، بۆچی هۆیەك یان کارتێکەرو بزوێنەرێك[١١٨٩] بۆ بوونی یاسایەکی قرتاندن هەیە.

٣_ (ا) ئازاد چوو بۆ قوتابخانەو ئارام چوو بۆ قوتابخانە.
(ب) ئازاد نان دەخوات و ئارام سێو دەخوات.

---

Permutation ١١٨٤

Tilgung und Entfernung ١١٨٥

elementar-Sätze ١١٨٦

Zusammengesetzte Sätze ١١٨٧

Ebneter (1985:28ff.) ١١٨٨

ist motiviert ١١٨٩

ڕستەکانی (٤) یش هەر ئەوە دەردەبڕن، کە (٥) دەریاندەبڕێت.

٤_ (ا) (pro) t گرتمییت.

(ب) دەستم t شکا ϕ.

٥_ (ا) (pro) تۆم گرت.

(ب) دەستی من شکا ϕ.

وەك دەستەفرێزی[1190] یەکتریی، ڕستەکانی (٤) و (٥) دروستەی قووڵی هاوبەشیان هەیەو ئەو دروستانەیش (٦ (ا)) و (٦ (ب)) ن.

٦_ (ا) pro تۆ گرتم.

(ب) دەستی من شکا ϕ.

ئەو دروستەی ڕستەیەی (٤ (ا))، کە لە دروستەی قووڵی (٦ (ا)) ەوە هەڵگوێزراوە، نیشانیدەدات، کە ئێمە لەڕێی جێگۆڕکێی فرێزی ناویی بەرکارەوە[1191] ڕستەیەکمان دەستکەوتووە، کە فرێزی کردار تێیدا دروستەیەکی چڕ یان ئاڵۆزی[1192] هەیە.
دروستەی ڕستەکەی (٥ (ا))، کە لە (٦ (ا)) وە هەڵگوێزراوە، دەریدەخات، کە لە هەڵگواستنی ئەو جۆرە ڕستانەدا تەنها جووڵاندنی کلیتیکی[1193] (جێناوی لکاوی بکەریی) پێویستە.
ڕستەکانی (٤ (ب)) و (٥ (ب)) دروستەی قووڵی (٦ (ب)) یان هەیە. لە (٤ (ب)) دا پاش بە کلیتیککردنی[1194] جێناوەخۆییەکە[1195]، نیشانە ~ مارکەی خستنەپاڵەکە[1196] قرتێنراوەو دوورخراوەتەوە.

---

١١٩٠ Paraphrasen

١١٩١ NP-Objekt

١١٩٢ komplexe Struktur

١١٩٣ enklitische Personalendung

١١٩٤ Klitisierung

هەڵگواستنی ڕستەکانی (٥ (ب)) و (٦ (ب))، بەپێچەوانەی ڕستەکانی (٤) و (٥ (ا)) وە، هیچ یاسایەکی گواستنەوەیان پێویست نییە. کەواتە دروستەی ڕووکەشی (٥ (ب)) و دروستەی قووڵی (٦ (ب)) دروستەی (وەچە) پێکهاتەی لەیەکچوویان هەیە.

چەشنی جێگۆڕکێکەی لە (٤ (ا)) دا جێبەجێیکراوە، بەپێی فۆڕمەکاتییەکەی[١١٩٧] کردارەکە دوو لێکدانەوەی هەیە:

٧_ لە فۆڕمەکانی ڕابوردوودا، بەرکارە ڕاستەوخۆکە دەتوانێت لە شوێنەکەی خۆی دووربخرێتەوەو ڕاستەوخۆ لەژێر ´V و بەتایبەتیی لەژێر VP دا بکرێت بە خوشکی وەچەپێکهاتەی کردار V.

٨_ (ا) دروستەپەسنکردنەکە[١١٩٨]




---

١١٩٥ Possessivpronomen

١١٩٦ Genitivmarker

١١٩٧ Zeitform

١١٩٨ Strukturbeschreibung

(ب) دروستەگۆڕاوەکە[1199]




٩_ لە کردارە ڕانەبوردوو داهاتووەکاندا، بەرکارە ڕاستەوخۆکە دەتوانرێت لە شوێنەکەی لابرێت و لەناو V′ (VP) دا بکرێت بە خوشك و هاوسێی کردارەکە (V).

١٠_ (ا) دروستەپەسنکردنەکە




[1199] Strukturveränderung

(ب) دروستەگۆڕدراوەکە




١١_ ئەگەر کردارەکە کردارێکی ڕابوردوو بوو، ئەوابەرکارە ڕاستەوخۆکە لابەرەو بیکەرە خوشك و هاوسێی[١٢٠٠] کردارەئاڵۆزەکە، بە شێوەیەك کە ببێت بە کچی فرێزەکردارییەکە[١٢٠١].

١٢_ ئەگەر کردارەکە لە فۆڕمی ڕانەبوردوو داهاتوودابوو، ئەوا بەرکارە ڕاستەوخۆکە لاببەو هەڵیبواسە بە کردارە ئاڵۆزەکەوەو بییکە بە خوشك و هاوسێی، بە شێوەیەك کە ببێت بە کچی فرێزەکردارییەکە.

بۆئەوەی دروستەی قووڵی (٩ (ا)) یان (١٠ (ا)) لەڕێی گواستنەوەوە بکرێت بە دروستەی ڕووکەشی (٩ (ب)) یان (١٠ (ب))، پێویستە یاسابەرابیەکانی گواستنەوە جێبەجێبکرێن. ئەو فرێناوییەی، کە لەڕێی یاسای جێگۆڕکێوە دەبرێتە ناو کردارەئاڵۆزەکەوە، دەتوانێت تەنها وەك کلیتیك دەربکەوێت و بکەوێتەڕوو.

دیاردەی ڕێکەوتنی بکەرو بەشی کردار[١٢٠٢] (ناسنامەی ئاماژەداریی ڕێکەوتن[١٢٠٣] لەم چەشنە پێکهاتوانەی[١٢٠٤] لای خوارەوەدا) پێویستیان بەڕوونکردنەوەیەك هەیە.

١٣_ دەستی t زۆر کورتە.
i j j i

---

١٢٠٠ Schwester des V-Komplexes

١٢٠١ Tochter von V′ (VP)

١٢٠٢ Koreferenz

١٢٠٣ Referenzidentität

١٢٠٤ Konstruktion

من له (٤_١٠) دا پرۆسەیەکم روونکردەوە، کە لە رێیەوە کلیتیك پاش قرتاندنی نیشانەو مارکەی خستنەپاڵەکە بەو کەرەستەیەی پێش خۆیەوە هەڵدەواسرێت. رستەی (١٣) نیشانیدەدات، کە شوێنپێکەی جێناوەخۆییەکەو کلیتیکەکە هەمان نیشانەی ئامارژەیی رێکەوتن[١٢٠٥] هەڵدەگرن. لە (١٤) دا جێناوەخۆییەکە، هەڵگری کلیتیکی خۆیی، لەگەڵ وەچەبەستێنەوەرەکەی لە پێشییەوە هاتووە، هاونیشانەی رێکەوتنیان هەیە[١٢٠٦].

١٤_ (ا) من دەستی خۆمم بڕیی.
i j ii

(ب) من دەستی خۆم دەبڕم.
i j i i

جێناوەخۆییەکە هەڵگری کلیتیکی خاوەنداریيە. کردارەکەیش کلیتیکێکی (جێناوی لکاوی بکەریی) هەڵگرتووە. لە (١٤ (ا)) دا ئێنکلیتیکەکە (جێناوی لکاوی بکەریی) بە بەرکارە راستەوخۆکەوە هەڵواسراوە. چونکە بەرکارە راستەوخۆکە (جێناوەخۆییەکە) ی لەگەڵ بکەری رستەکەدا لەیەکچوونی هەیەو لەگەڵ ئێنکلیتیکە گوێزراوەکەدا هەمان فۆرمی فۆنەیتیکیی و هەمان ناسنامەی ئامارژەیی رێکەوتنی[١٢٠٧] هەیە، ئێنکلیتیکەکە بۆی هەیە بقرتێنرێت و بکەوێت[١٢٠٨].

لە (١٤ (ب)) دا کردارەکەی لە فۆرمی رانەبوردوو داهاتوودایە، رێنادات، کە ئێنکلیتیکەکە بۆ بەرکارە راستەوخۆکە[١٢٠٩] بگوێزرێتەوە. بۆیە ئەو زنجیرەلووتییە دێتەئاراوە، کە لە (١٤ (ا)) دا هەیە. لەبەر ئەمەیە قرتاندن و کەوتنی لە رستەکەی دواییدا نەبوونەکراوە. رستەی (١٥) دوو واتاییە[١٢١٠].

١٥_ (prc) دەستم بڕیی. (من دەستی خۆم بڕیی؛ من دەستی خۆمم بڕیی) (بەراوردییبکە لەگەڵ (١٤ (ب)) دا)

---

١٢٠٥ Referenzindex

١٢٠٦ koreferent

١٢٠٧ Referenzidentität

١٢٠٨ synkopiert werden

١٢٠٩ das direkte Objekt

١٢١٠ zweideutig

لەمەوە ئەو ئەنجامەم دەستدەکەوێت، کە قرتاندنن و خستنی جێناوەخۆیەکەیش دەتوانێت سەرپشکیی بێت. چەشنێکی دیکەی یاسای جێگۆڕکێ یاسای جێگۆڕکێی فرێزەپێشناوییەکانە. بەبەرهەمی ئەم یاسایە وابەستەی ناوچەکانەو لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە جیاوازە. چونکە، لەکاتێکدا یاساکە لە ناوەندی شاری سلێمانییدا یاساناسا جێبەجێدەکرێت، لە دەرەوەی شار زۆر کەم پەیڕەودەکرێت. ئەم یاسایەیش سەر بە دیاردەی هەڵواسیینە، کە لەناوەو لەدەرەوەی V´ (فرێزی کرداریی و ڕستە) دا دەشێت جێبەجێبکرێت.

پەسنکردنێکی یەکگرتوو گشتیی ئەتریبووتە[١٢١١] ساکارو ئاڵۆزەکان پێویستی بە پرۆسەیەکی گواستنەوەیە. زمانەوان لەوەوە دەستپێدەکات و دەردەچێت، کە ئاوەڵناوی ئەتریبووتییڤیی[١٢١٢] لەڕێی یاسابنەڕەتیی قووڵەکانەوە[١٢١٣] دانانرێن، بەڵکو لە دروستەی ترەوە هەڵدەگوێزرێن[١٢١٤].

١٦_ (ا) کوردە ژێردەستەکان بۆ ئازادیی دەجەنگن.

(ب) ئەو کوردانەی، کە pro ژێردەستەن، pro بۆ ئازادیی دەجەنگن.

با لەپێشدا لە ڕستەی (١٦ (ا)) وردببینەوە. ئەم ڕستەیە لە ڕاستییدا دووواتاییە. ڕستەکە، دەتوانرێت لێکدانەوەی هەر دوو ڕستەکەی (١٦) بخرێتەپاڵ و بۆی دابنرێن. بەڵام ڕستەی (١٦ (ب)) یەك واتای هەیە. ڕستەکە ڕستەیەکی سەرجێناویی سنوورداری[١٢١٥] تێدایە. ئاوەڵناوی <ژێردەستە>، کە لە (١٦ (ا)) دا وەك ئەتریبووت خراوەتە پاش ناوەکەوە <کورد>، لە ڕستەسەرجێناوییەکەی (١٦ (ب)) دا لە شوێنێکی بەشی کردارییدایە[١٢١٦]. ئاوەڵناوە کردارییەکان دەتوانن وەك ڕستەی سەرجێناویی لەڕێی یاسا بنجیی و قووڵەکانەوە بەرهەمبهێنرێن. ئەمە ئەوە دەبەخشێت، کە ئاوەڵناوەکان لە سەرەتادا لە ڕێی یاسابنجییەکانەوە لە شوێنی بەشی کردارییدا دادەنرێن و کە ڕستەی (١٦ (ا)) بە گواستنەوە لە ڕستەی (١٦ (ب)) هەڵدەگوێزرێت. بەگوێرەی ئەم دارشتن و خستنەڕووە پێکهاتووەکانی

---

[١٢١١] Attribute

[١٢١٢] attributive Adjektive

[١٢١٣] Basisregeln

[١٢١٤] ئەم هەڵسەنگاندن و بۆچوونانە لەگەڵ تێڕوانیینە نوێکاندا بەراوردبکە، بەواتا لەگەڵ Ebneter (1985) دا.

[١٢١٥] restriktiver Relativsatz

[١٢١٦] in prädikativer Stellung

ئاوەڵناوە ئەتریبووتیڤییەکان لەو ڕستەسەرجێناوییانەوە هەڵگوێزراون، کە ئاوەڵناوی بەشی کرداریبیان تێدایە. بۆ ئەم هەڵگواستنەیە، کە لە زاری سلێمانییدا ئەم یاسای گواستنەوانە هەن:

_ گێڕانەوەو کورتکردنەوەی ڕستەی سەرجێناویی؛
_ قرتاندن و خستنی جێناوی ڕستەسەرجێناوییەکە[1217]؛
_ قرتاندن و خستنی کۆپولاکە (کردارەیاریدەدەرەکە)؛
_ قرتاندن و خستنی پارتیکڵەتەواکەرانەکەی /کە/[1218].

لەم نامەیەدا ناتوانرێت زۆر تر دەربارەی ئەم پرۆسەیەو چۆنیەتیی دارشتنی گواستنەوەکانی بکۆڵرێتەوە؛ نایشتوانرێت ئەو کێشەیە شییبکرێتەوە، ئەگەر گواستنەوەکان بۆ هەموو ئاوەڵناوەکان بەکاردەهێنرێن یان نا.

بۆ ئەوەی بزانیین مۆرکەئاوەڵناوییە ئاڵۆزەکان[1219] چۆن هەڵدەگوێزرێن، ئێستا دەچیینە سەر ئەم بابەت و کێشەیە. مۆرکە ئاڵۆزەکان ئەو مۆرکانەن، کە پتر لە وەچەپێکهاتەیەکیان[1220] تێدایەو لە ڕستەسەرجێناوییە بنەڕەتیی و قووڵەکانەوە[1221] هەڵدەگوێزرێن. لەبەرئەمەیە، وەهادادەنرێت، کە ڕستەی (١٧) لە ڕستەیەکی سەرجێناوییەوە وەردەگیرێت و، کە مۆرکەئاوەڵناوییەکە تێیدا لە شوێنێکی بەشی کرداریبدا دەردەکەوێت؛ بەواتا لە (١٨) ەوە هەڵدەگوێزرێت.

١٧_ ئێمە بۆ پیاوێکی لەم بوارەدا شارەزا دەگەڕێین.
١٨_ ئێمە بۆ پیاوێك دەگەڕێین، کە pro لەم بوارەدا شارەزایە.

## ٢/٩-٢) ئەو گواستنەوانەی لە زمانەکەماندا نیین

لەڕێی یاساکانی گواستنەوەوە لەو زنجیرەبنەڕەتیی و قووڵانەی[1222] هێشتا فۆرمدروستییان تەواونەبووە[1223]، دروستەڕووکەشەکان هەڵدەگوێزرێن. تاوەکو ئێستا هەندێك ڕوونکردنەوە

---

[1217] Relativpronomen

[1218] Komplementpartikel

[1219] komplexe Attribute

[1220] Konstituente

[1221] zugrundeliegende Relativsätze

[1222] zugrundeliegende Ketten

لەبەرژەوەندیی بوونی یاساکانی گواستنەوە پێشکەشکران. گفتوگۆو شییکردنەوەکانی ئایندەم بۆ ئەو مەبەستەن، نیشانەی پرسیار بخەمەسەر بوونی هەندێك لەو یاسای گواستنەوانە لە زمانی کوردییدا.

ئەو گواستنەوانەی فۆڕمی کەسدارییی[١٢٢٤] (کەس و کات) بە کردار دەدەن:
ڕێکەوتن[١٢٢٥] (ی بکەرو بەشی کردار لە کەس و ژمارەدا):
ئەو گواستنەوەیەی، کە نیشانەکانی کەس و ژمارە لە بکەری ڕستەوە بۆ ئەو کردارەی، سەر بەو بکەرەن، دەگوێزێتەوە، ناوی "ڕێکەوتن" ی لێنراوە.

### نیشانەکانی تاف[١٢٢٦]:

پاش گواستنەوەی ڕێکەوتن، کردارەکە لەڕێی یاسایەکی گواستنەوەی دیکەوە نیشانەکانی تاف وەردەگرێت.

من نیشانمدا، کە ئەم پرۆسانە لە کاروبارە مۆرفۆلۆژییەکانن[١٢٢٧] و کە کەرەستەکانی "کات" TENSE و "ڕێکەوتن" AGR کەرەستەی سەرەتایی (مۆرفێمی) ناو فەرهەنگ و کرداردروستکەرن. بۆیە کارتێکەرو بزوێنەرێك بۆ بوونی ئەو یاسایانەی گواستنەوە لە زمانی کوردییدا نیین.

هەڵواسینی[١٢٢٨] پارتیکڵی تەواوکەرانە[١٢٢٩] /کە/:
وەها دادەنرێت، کە پارتیکڵی تەواوکەرانە لەڕێی یاسایەکی گواستنەوەوە دادەنرێت. بۆیە زیادکردن و هەڵواسینی ئەم پارتیکڵە جێبەجێدەکرێت، بۆئەوەی هیچ فرێزێکی ناویی، بەتایبەتیی فرێزی ناویی بکەری ڕستەی لاوەکیی[١٢٣٠]، دووجار دۆخی ڕێزمانیی پێنەدرێت. بەگوێرەی ئەم ڕوونکردنەوەیە ئەو کەرەستەیە /کە/ بە گواستنەوە دادەدەنرێت؛ بەشێوەیەك، کە دانانەکەی لەپێش ڕێکەوتنەوە ڕوودەدات. هەڵواسینەکەی لە دروستەی قووڵدا سەرەنجامی

---

[١٢٢٣] noch nicht wohlgeformt

[١٢٢٤] finite Form

[١٢٢٥] Kongruenz

[١٢٢٦] Tempusmerkmale

[١٢٢٧] morphologischer Angelegenheit

[١٢٢٨] Adjunktion

[١٢٢٩] Komplementpartikel

[١٢٣٠] untergeordneter Satz

خۆی هەیە. یەکێك لەو سەرەنجامانە ئەوەیە، کە لە دروستەی ڕووکەشدا دەتوانرێت سەرپشکیی بقرتێنرێت و لابـبرێت. ئەمە وەك بەڵگەیەك دیيسانەوە پاساوی گریمانەی ڕوودانی پڕۆسەی هەڵواسینەکە لە دروستەی قووڵدا دەداتەوە.

بەپێچەوانەوە، لێرەدا وەهای دادەنێم، کە پارتیکڵی هەواڵیی[١٢٣١] /کە/ و پارتیکڵی مەرجیی[١٢٣٢] /ئەگەر/ لە بنەرەتدا بەرهەمهێنراون[١٢٣٣]. ئەم گریمانەیەیش لەڕێی ئەو بەڵگەهێنانەیەوە پشتییدەگیرێت، کە هەر یەکێك لەم پارتیکڵانە لەتەك چەشنێکی کرداردا[١٢٣٤] دێن و کە هەریەکەیان واتایەکی هەڵگرتووە (کاتێك، وەختێك، لە کاتێکدا؛ لەبەرئەوەی، چونکە). ئاماژەیەکی ئاشکرا بۆ ئەوە، دابەشبوونی تەواوکەرانەی[١٢٣٥] هەر دوو کەرەستەکەیە لە ڕستە هەواڵیی[١٢٣٦] و ڕستەی مەرجییەکاندا[١٢٣٧].

## هێنانەدەرەوەی ڕستەی بکەریی[١٢٣٨]:

ئاماژە بەوە درا، کە دەستەفرێزەکانی[١٢٣٩]، کە هەمان کەرەستەی فەرهەنگییان[١٢٤٠] تێدایە، بەزۆریی لە دروستەیەکی قووڵی هاوبەشەوە هەڵگوێزراون. پەیوەست بەم ئەنجاملێکدانەوەیەوە بەند بە ڕستەی (١٩) و (٢٠) ەوە ئەم پرسیارانە دێنەپێشەوەو دەکرێن:

ڕێزمانی گواستنەوە[١٢٤١] چۆن ئەو پەیوەندییانە پەسندەکات، کە لە نێوان ئەو ڕستانەدا هەن؟

بۆچیی ڕستەکانی (١٩ (ب)) و (٢٠ (ب)) پەسەندنیین یان نەبوونەکراون؟

١٩_ (ا) سەرکەوتنی پێشمەرگەکان تیشکی ئازادیی بەگەل دەبەخشێت.

---

١٢٣١ Indikativpartikel

١٢٣٢ Konjunktivpartikel

١٢٣٣ basisgeneriert

١٢٣٤ Modusverb

١٢٣٥ komplementäre Verteilung

١٢٣٦ indikativische Sätze

١٢٣٧ konjunktivische Sätze

١٢٣٨ Extraposition von Subjektsätzen

١٢٣٩ Paraphrasen

١٢٤٠ lexikalische Elemente

١٢٤١ Transformationsgrammatik

(ب) چیی ئازادیی بەگەل دەبەخشێت، سەرکەوتنی پێشمەرگەکان؟

٢٠_ (ا) کە پێشمەرگەکان سەردەکەون، تیشکی ئازادیی بەگەل دەبەخشرێت (دەبەخشێت).

(ب) * تیشکی ئازادیی بەگەل دەبەخشرێت (دەبەخشێت)، کە پێشمەرگەکان سەردەکەون

ڕستەی (١٩ (ب)) پێکهاتوویەکی ئاوەڵناوی[١٢٤٢] کراوو/کردووی تێدایە، کە بکەری ڕستەکەیە. وەك دەستەفرێزی یەکتریی وەچەپێکهاتەکانی هەر دوو ڕستەکەی (١٩) پەیوەندییە گۆکردنەکانیان وەکیەکە[١٢٤٣]. شکاندنەوەی کردار[١٢٤٤]ەکەیش هەمان چشتە. بەتەنها پەیوەست بە بکەری ڕستەکەوە لەیەکتریی جیاوازن؛ بکەرەکە لە (١٩ (ب)) دا براوەتە کۆتایی گشت ڕستەکەوە. زمانی کوردیی بەگشتیی زمانی پەسنکەرانەیە. زۆربەی زۆری گەنجی کردارەکانی[١٢٤٥] دروستەو دروستبوونێکی (بونیاتێکی) داڕێژەروەو پەسنکەرانەی[١٢٤٦] هەیە؛ جموجۆڵ و چالاکیی و هەست و نەست و ... جیهان و بوون بە داڕشتن پەسندەکات. بۆ نموونە، پەیپێبردنەکان[١٢٤٧] لە زمانێکی شییکەرەوەدا لە فۆڕمە چالاکەکانیاندا[١٢٤٨]، بەواتا بزوێنەر[١٢٤٩]، دەردەبڕدرێن. بەپێچەوانەوە بزوێنەرەکان لە ڕستەشکاوەکانی زاری سلێمانییدا پەسنکەرانە دەردەبڕدرێن. با بۆ ڕوونکردنەوە لەم ڕستانەی زمانی ئەڵمانیی وردببینەوە.

21- (a) Daß Johan laut liest, ärgert Albert.

"کە یۆهان بە دەنگی بەرز دەخوێنێتەوە، ئەلبێرتی بێزار (تووڕە) کردووە"

(b) Es ärgert Albert, daß Johan laut liest.

"ئەلبێرتی بێزار (تووڕە) کردووە، کە یۆهان بە دەنگی بەرز دەخوێنێتەوە"

---

١٢٤٢ Partizipial-Konstruktion

١٢٤٣ identische Funktionsbeziehungen

١٢٤٤ Flexion des Verbs

١٢٤٥ Verbschatz

١٢٤٦ synthetische bzw. Deskriptive Aufbaustruktur; synthetical languag ; بەراوردی بکە لەگەل

analytische Sprachen; analeytical languaged زمانەشییکەرەوەکاندا

١٢٤٧ Wahrnehmungen

١٢٤٨ aktive Form

١٢٤٩ stimulierend

ڕستەشکاوەکەی (٢١ (ا)) بکەری گشت ڕستەکەیە. دەنا لەنێوان هەردوو ڕستەکەدا جیاوازییەکی دیکە نییە. کردارەکە، کە لێرەدا مەبەستمانە، هەمان شکاندنەوەو چەشنی کرداری[١٢٥٠] هەیە.

با ئێستایش بگەڕێینەوە سەر ڕستەکانی (١٩) و (٢٠). لەکاتێکدا گواستنەوەی بکەری ڕستەکەی (١٩ (ب)) بۆ کۆتایی گشت ڕستەکە گومانلێکراوەو نیشانەی پرسیاری لەسەرە، هەمان گواستنەوە لە (٢٠ (ب)) دا نەبوونەکراوە. ڕستەبەراییەکانی[١٢٥١] (١٩) و ڕستەلێکدراوەکانی (٢١) وەك دوو چەشنی جیاوازی ڕستەی شییکەرەوە، ڕێدەدەن، بکەر (ڕستەی بکەریی[١٢٥٢]) ەکە ببرێتە کۆتایی گشت ڕستەکەوە. ئەمە لە چەشنی ڕستەکانی وەك (٢١ (ا)) دا نەبوونەکراوە؛ چونکە ڕستی ~ ڕستییلەی[١٢٥٣] "ئەلبێرتی بێزارکرد" لە (٢١ (ا)) دا گشت ڕستەکەی "یۆهان بە دەنگی بەرز دەخوێنێتەوە" وەك بکەرەکەی هەیەو ڕستەشکاوەکەی (٢٠ (ا)) بکەرێکی خۆی هەیە. کەواتە لەڕێی ئەم گواستنەوەیەوە ڕستەی سەرەکیی[١٢٥٤] و ڕستەی لاوەکیی[١٢٥٥] کە شوێنەکانیان دەگوێزنەوە. لەبەرئەوەی ڕستەشکاوەکە/ ڕستەلاوەکییەکە یاساناسا کردارێکی پەسنکەرانەی ویست و ئارەزووی[١٢٥٦] تێدایە، بەکارهێنان و دەرکەوتنی ئەم چەشنەی کردار لەناو ڕستەئاڵۆزەکاندا بابەتی مەرجی دابەشبوونی چەشنەکانی کردارە[١٢٥٧]. لەبەرئەوەی ئەم مەرجانە لەڕێی ئەم گواستنەوانەوە بریندار دەبن و چونکە (٢٠ (ب)) ئەم یاسای گواستنەوەیەی جێبەجێکردووە، (٢٠ (ب)) نەبوونەکراوە.

## هێنانەدەرەوەی بەرکاری ڕاستەوخۆی ڕستە[١٢٥٨]:

ڕوودان و دەرکەوتنی es ~ it لە (٢١ (ب)) دا ئاماژەیەکە بۆئەوەی، کە ئەم ڕستەیە یاسای گواستنەوەی "هێنانەدەرەوە" ی جێبەجێکردووە. ڕوودان و دەرکەوتنی ئەم کەرەستەیە لە

---

[١٢٥٠] Verbmodus

[١٢٥١] elementare Sätze

[١٢٥٢] Subjektsatz

[١٢٥٣] Klausel

[١٢٥٤] übergeordneter Satz

[١٢٥٥] untergeordneter Satz

[١٢٥٦] Subjunktivverb

[١٢٥٧] Gegenstand der Bedingungen der Modus-Einteilung

[١٢٥٨] Extraposition von Objektsätzen

(٢٢) دا دەریشیدەخات، کە ئەم ڕستەیە یاسای گواستنەوەی "دەرهێنانی بەرکاری ڕاستەوخۆی ڕستەی" جێبەجێکردووە.

22- Johan begrüßt es, daß Elisabeth die Kinder zu sich genommen hat.

هەمان دیاردەی ڕستەی بەرکاریی ڕاستەوخۆ لە زمانی کوردییدا بەدیناکرێت. ئەم پۆلەی ڕستەکان دەتوانرێت تەنها بەیاریدەی سەری ڕستەی سەرجێناویی دروستبکرێت. جوڵاندن و گواستنەوەی سەری ڕستەسەرجێناوییەکە نەبوونەکراوە. هیچ کەرەستەیەکی ناو ڕستەی سەرجێناوییش ناتوانرێت بهێنرێتەدەرەوە. بۆیە زمانی کوردیی هیچ دروستەیەکی ڕستەی نییە، کە ڕستە بەرکارییە ڕاستەوخۆکەی هێنرابێتەدەرەوە.

٢٣_ بەتەنها گەلانی ژێردەستە پێشوازیی لەو ڕۆژە دەکەن، کە کوردی تێدا ڕزگاردەبێت.

تاوەکو ئێستا توانییم ئەو زانیینە بەدەستبخەم، کە سەری ڕستەی سەرجێناویی وەك بکەری کردارە سەرەکییەکە بەرپەرچی گواستنەوەی بەرکاری ڕاستەوخۆی ڕستەکە دەداتەوەو بەم پێیە بوونی دروستەیەکی ڕستەی لەم چەشنە پووچەڵدەکاتەوەو کە گواستنەوەی بکەری ڕستە لەبەر هاوتەریبیی ڕستەی سەرەکیی و ڕستەی وەچەپێکهاتە[1259] نەبوونەکراوە. ئەمەیش خۆی لەخۆیدا دەریدەبڕێت، کە هێنانەدەرەوەی چەند جارە ناتوانرێت لە زاری سلێمانییدا بکرێت.

## کورتەوپوختەو ئەنجاملێکدانەوەکان:

ئەو یاسایانەی گواستنەوە، کە پێکهاتەی گواستنەوەیان لێپێکهاتووە، تەنها چەند یاسایەکی جێگۆڕکێن. ئەو جیاوازیانەی، کە لەنێوان دروستەقووڵەکەی هێشتا فۆڕمەکەی تەواو دروستنەبووە[1260] و لەنێوان دروستەی ڕووکەشدا هەن، بەزۆریی سروشتی مۆڕفۆلۆژیی (فەرهەنگیی) و فۆنۆلۆژییان هەیە. ئەمە لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکەیشەوە زاراوەی دروستەی قووڵ وەك دارشتەی ڕستەکانی واتای وەکیەك و لەیەکچوویان هەیە، ئەوەمان بۆ دەڕەخسێنن، گریمانەی ژمارەیەکی دیاریکراو لە دروستەی قووڵمان هەبێت. بەمە بانگەشەی ئەو گریمانەیە دەکەم، کە ئێمە لە ژمارەیەکی کەمی دروستەی قووڵەوە ژمارەیەکی زۆرتر لە ڕستەی واتا_وەکیەك و لەیەکچوو هەڵدەگوێزین. لە هەمان کاتدا بەمە بانگەشەی ئەو گریمانەیە دەکەم، کە زۆربەی جیاوازییەکانی نێوان دروستەی قووڵ و دروستەی ڕووکەش

---

[1259] der parallele Struktur des Matrix- und Konstituentensatzes

[1260] zwischen den noch nicht wohlgeformten Tiefenstruktur und der Oberflächenstruktur

مەرجی مۆرفۆلۆژیی و فۆنۆلۆژییان هەیەو وابەستەی ئەو دوانەن. لە ئەنجامی ئەمەدایە، کە هەندێك پرۆسەی مۆرفۆلۆژیی و فۆنۆلۆژیی دەبینرێنەوەو دیارییدەکرێن، کە بۆ گشت رژێمەکەی هەر دوو پێکهاتەکە کەرەستەی گرنگ دەبن. لە بەشی ئاییندەدا، پەیوەست بە پرۆسەکانی جێگۆرکێ و دروستەی بەرهەمەکانیانەوە[١٢٦١]، تیشك دەخرێتەسەر ئەو رێسا فۆنۆلۆژییانە، کە لەسەر ئاستی لێکدانەوە رۆڵی گرنگ و بریاردەر دەبینن.

[١٢٦١] Outputstrukturen

# بەشی دەهەم

## سینتاکس و فۆنۆلۆژیی

بۆ ئەوەی تیشك بخەمەسەر سروشتی پەیوەندیی نێوان پێکهاتەی فۆنۆلۆژیی و پێکهاتەی سینتاکس، لەم بەشەی نامەکەدا هەوڵدەدەم ڕۆڵی زانیارییەفۆنۆلۆژییەکان لە سینتاکسدا ڕوونبکەمەوە. لەتەکییدا ئەو پرۆسە فۆنۆلۆژییانە دەدۆزرێنەوەو دەخرێنەڕوو، کە پەیوەندیی کارلەیەکترییکردنی ئەو دوو پێکهاتەیە ئاشکرادەکەن.

لەبەرئەوەی زمانی کوردیی نیشانەکانی گرووپی زمانەلکاوەکان نیشاندەدات و چونکە کلیتیکەکان _جیا یان بەلکاویی_ لەگەڵ کەرەستەکانی دیکەدا، کە ڕستە دروستدەکەن، بۆ ڕوونکردنەوەی دروستەی ڕستە ڕۆڵێکی گرنگ دەبینن، پەیوەندییەدروستەیی و ئەندازیارییەکانی کلیتیکەکان و حاڵەتی چۆنییەتییان بۆ ئەم هەوڵە هەڵبژێردراون. ئەم نموونەیەی لای خوارەوە دەتوانێت ئەو پەیوەندیی و وابەستەییەی نێوان پێکهاتەی فۆنۆلۆژیی و سینتاکس بخاتەڕوو:

بکەرە سفرەجێناوییەکە لەگەڵ بەشی کردارێکی ئاڵۆز، کە لە کردارێك و کلیتیکێك دروستبووە _دروستە مۆرفۆسینتاکسییەکە_ ، ڕستەیەکی پرواتای ڕێزمانییە. ڕێزمانیی یان نارێزمانیی ڕستەکە لەسەر ئاستی فۆنۆلۆژیی وابەستەی مەرجەفۆنۆلۆژییەکان دەبێت[١٢٦٢]. پێکهاتەی فۆنۆلۆژیی وەك پالێوەرێك گۆدەکات، کە لەسەر ئاستی ڕووکەش دێتەجێبەجێکردن و ئەو زنجیرەو برگانەی ڕێیانپێنادرێت لەو زنجیرەو برگانەجیادەکاتەوە، کە ڕێیانپێدەدرێت و زنجیرەو برگەی کوردیین. کاتەکانی تاڤ ڕابوردوو، بۆ نموونە، فرێزێکی کرداریی (´ V) بەم سەرەو ڕیزبوونەوە بۆخۆی دادەنێت.

1- (a)   t   V – Enkl. - Kl
         j           j

---

[١٢٦٢] دەبوو هەر لەسەرەتادا بەدووی مەرجە سینتاکسییەکاندا بگەڕێم و لەڕێیانەوە ئەم دیاردەیە ڕوونبکەمەوە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو سەردەمە لە نەمسادا نامای دکتۆراکەم نووسیی و کەرەستە سینتاکسیی و مۆرفۆسینتاکسییەکانی ناوچەی گەرمیان و کەرکووکم لەبەردەستدا نەبوون، بۆ ئەو مەبەستە پەنام بردە بەر مەرجە فۆنۆلۆژییەکان؛ لە لێکۆڵینەوەو تۆژینەوەیەکی ئایندەمدا ئەم بۆچوونە بنجییە هەڵدەسەنگێنم (وەرگێڕ).

(ب) t قەدی کردار _ جێناوی لکاوی بکەر _ جێناوی لکاوی بەرکاری ڕاستەوخۆ

j j

لەگەڵ ئەوەیشدا، کە ڕستەی (٢) دروستەیەکی ڕاستودروستی هەیە، وەك ڕستەیەکی زاری سلێمانیی ڕێپێنادرێت و پەسەند نییە.

٢_ * pro t گرت _ت _ م

ڕستەی (٢) هیچ ڕێسایەکی سینتاکسی ڕێزمانی کوردیی بریندارنەکردووە؛ بەڵام بۆیە پەسەند نییە، چونکە لە زاری سلێمانییدا ڕێ بە زنجیرە کۆنسۆنانتی {تت} لەبەردەم دەنگێکی لووتییدا نادرێت. بەم شییکردنەوەیەم ئەوە دەردەبڕم، کە بەهۆی بوونی کلیتیکەکانەوە_ کە دەتوانن کۆنسۆنانتێك یان کرۆکی برگەیەك یان برگەیەکی تەواوبن _ و بەیاریدەی دروستەی ڕستە نییشانەکراوەکانەوە ئەم دیاردانەو دیاردەی دیکەی تایبەت بە زمانەکەمانەوە ڕوونبکەمەوە.

ڕستەی (٢) بەهۆی دروستەسینتاکسییەکەیەوە ناپەسەند نییە، بەڵکو بەهۆی دارشتەفۆنۆلۆژییەکەیەوەیە، کە سەرکەوتوو نییە. ئەو ڕێسایانەی ڕستەکە بریندار کردوون، لە جۆری فۆنۆلۆژیین نەك لە چەشنی سینتاکسیی. ئەمەیش ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی، کە ئاستەلێکدەرەوەکانی[١٢٦٣] فۆرمی فۆنۆلۆژیی PF و فۆرمی لۆژیکیی LF مەرجەدارشتەییە[١٢٦٤] ڕاستەقیینەکانی ڕستەکەن.

لێرەدا هەوڵدەدرێت، ئاکاری شوێنەکانی کلیتیکەکان لەڕێی دیاریکردنی شوێنی فرێزەناوییەکانەوە دەستنییشانبکرێن و سنوورەکانیان بناسرێنەوە. لە مۆدێلی ڕێزمانی "کرۆکەڕێزمان"[١٢٦٥] ی چۆمسکییەوە[١٢٦٦] دەستپێدەکەم و ئەو هیپۆتێزەیە پەسەنددەکەم و کارپێدەکەم، کە دەڵێت: کلیتیکەکان بۆیەکەم جار لەسەر دارشتەی فۆنۆلۆژیی ڕستەکان و پاش جێبەجێکردنی یاسایەکی جێگۆڕکێ[١٢٦٧]، دەردەکەون[١٢٦٨]. بەڵام ئێنکلیتیکەکان وەك

١٢٦٣ Interpretationsebenen

١٢٦٤ Repräsentationsbedingungen

١٢٦٥ Kerngrammatik

١٢٦٦ Chomsky (1980 b)

١٢٦٧ Permutationsregel

بەشێکی سینتاکسیی کردارەکان لە دروستەی قووڵدا هەن و لەسەر گشت ئاستەکانی دیکەی ڕستە ئامادەن[1269]. بۆیە گرووپەکانی کلیتیکەکان لەسەر دروستەی ڕووکەش دەکەونەڕوو. بەڵام ڕستەکان لەسەر ئاستی لێکدانەوەولێکدەدرێنەوەو دەنرخێنرێن. من کاتێك لە گرووپەکانی کلێتیکەکان دەدوێم، کە ئێنکلیتیك و کلیتیك لەسەر دروستەی ڕووکەش بەیەکەوە بەستراو ڕوودەدەن و دەربکەون. ئەمەیش لەبەرئەوەی کلیتیك ئاکاری ئێنکلیتیك نیشاندەدات. هەر وەك چۆن ئێنکلیتیکەکان ئامارژەیەکن بۆ ئەو بکەرەی بە فەرهەنگیی بەرجەستەنەبووە[1270]، کلیتیك ئامارژەیەکە بۆ شوێنی ئەو فرێزەناوییەی بەرکارە ڕاستەخۆکە، کە جێگۆڕکێی پێکراوە[1271]. کلیتیك تارادەیەکی زۆر وەك ئێنکلیتیك ئازادەو دەتوانێت بە هەموو ڕەگەزەکانەوە (کاتەگۆرییەکانەوە) بلکێت. بۆیە لە گەلێك شوێنی جیاوازو جۆراوجۆردا دەبینرێنەوە. هێنانەدییتن و بەرجەستەبوونی ئێنکلیتیك و کلیتیك لە زۆر حاڵەتدا هەمان چشتە _ لەیەکدەچن و وەکیەکن _. بۆ نموونە، ئێنکلیتیکی /م/ مۆرفێمی کەسی یەککەمی تاکە؛ هەروەها ئەو کلیتیکەیشە، کە پاش جێگۆڕکێی بەرکارە ڕاستەوخۆکە هەمان نیشانەی تایبەتیی هەیە (هاودەنگیی). بەرجەستەبوونی فۆنەیتیکیی[1272] ئێنکلیتیك لە فۆرمەکانی ڕانەبوردوو داهاتوودا[1273] فۆرمی فۆنەیتیکیی کلیتیکی فۆرمەکانی ڕابوردووە. خشتەی[1274] (١) دابەشبوونی تەواوکەرانەی کلیتیك و ئێنکلیتیك دەخاتەڕوو.

| | فۆرمەکانی ڕانەبوردوو داهاتوو | | فۆرمەکانی ڕابوردوو | |
|---|---|---|---|---|
| | ئێنکلیتیك | کلیتیك | ئێنکلیتیك | کلیتیك |
| کەسی یەککەمی تاك | /م/ | /م/ | /م/ | /م/ |
| کەسی یەککەمی کۆ | /ین/ | /مان/ | /مان/ | /ین/ |
| کەسی دووهەمی تاك | /ییت/ | /ت/ | /ت/ | /ییت/ |

---

[1268] لە یادماننەچێت، کە جێناوی لکاوی بکەریی زمانی کوردیی بەشێکی فەرهەنگیی کردارەکەن، بەواتا لەڕێی جێبەجێکردنی یاسای جێگۆڕکێوە پەیدانابن، بەڵکو خۆیان لە بنەڕەتدا هەن. مێۆتێزەکەی چۆمسکیی لە زمانی کوردییدا تەنها بۆ جێناوی لکاوی بەرکاری ڕاستەوخۆ دەخوات (وەرگێڕ).

[1269] بڕوانەو بەراوردیی بکە لەگەڵ محەمەد عەبدولفەتاح حەمەسەعیید "گۆڤاری ئەکادیمیانی کوردستان، بەرگی ١ ب، ژمارە ١" (٢٠٠١)

[1270] Nicht lexikalisierte Subjekt

[1271] das permutierte NP-Objekt

[1272] phonetische Realisierung

[1273] Gegenwarts- und Zukuftsformen

[1274] Tabelle

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| کەسی دووهەمی کۆ | /ن/ | /تان/ | /تان/ | /ن/ |
| کەسی سێ هەمی تاك | /ێت/-/ات/ | /ی/ | /ی/ | / φ / |
| کەسی سێ هەمی کۆ | /ن/ | /یان/ | /یان/ | /ن/ |

کلیتیك و ئێنکلیتیك لەو مۆرفێمانەن، کە دەتوانرێن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە بجوولێنرێن. بۆیە گشت ئەو مۆرفێمانە ناودەنێم "کلیتیکگەل[١٢٧٥]" و لەژێر ئەم سەرناوەدا کۆیاندەکەمەوە. لە ئەنجامی ئەمەدایە، دەرکەوتنی ئەم مۆرفێمانە پێکەوە بەلکاویی لەسەر دارشتەی فۆنۆلۆژیی بە "گروپەکانی یان کۆمەڵەکانی کلیتیك[١٢٧٦]" ناودەبەم.

من وەهای دادەنێم، کە دروستەی کلیتیکەکان، پەیوەندییەئەندازیارییەکانیان و ڕوودان و دەرکەوتنیان لە ڕستەدا، کەواتە سەرەو ڕیزبوون و شوێنەکانیان _بەجیا جیا یان پێکەوەو بەلکاویی _ لەڕستەدا، وابەستەی ئەم هۆکارانەن (فاکتەرانەن):

(ا) گۆکردنەکانی فۆڕمەکانی کردار[١٢٧٧]، کەواتە فۆڕمەکانی تافەکانی کردار؛

(ب) ڕەگەزە کەسییەکانی بکەری ڕستە، کەواتە کەس و ژمارەی بکەری ڕستە؛

(پ) دروستەی دارشتەی دەستووریی فۆڕمی کردار[١٢٧٨]، کەواتە دروستەی کردار "سادە"، وەك بەرهەمی فەرهەنگ، یان "ئاوێتە"؛

(ت) هێزی کردار[١٢٧٩]، کەواتە جۆری پەیوەندی و بەستنەوەی کردار لەگەڵ وشەکانی ناو ڕستەدا.

ئەگەر ئێمە ئێستا لە ڕستەڕێزماننادروستەکانی (٣) و (١٢ (ا)) وردببینەوەو لەگەڵ ڕستەڕێزماندروستەکانی (٣ (ب)) و (١٢ (ب)) دا بەراوردیان بکەین، بۆماندەردەکەوێت، کە ڕستەنەبوونەکراوەکان لەڕاستییدا هیچ ڕێسایەکی پێکهاتەی سینتاکسییان بریندارنەکردووە. لەمەوە بۆمان ئاشکرادەبێت، کە شوێنگۆڕکێی نێوان کلیتیك و ئێنکلیتیك لە بنەڕەتدا بۆ پێکهاتەی فۆنۆلۆژیی دەگەڕێتەوە.

٣_ (ا) * pro t گرت _ ت _ م (تۆ منت گرت)

(ب) pro t گرتمت.

---

١٢٧٥ Klitika

١٢٧٦ Klitikgruppen

١٢٧٧ Funktionen der Verbformen

١٢٧٨ formale Struktur des Verbs

١٢٧٩ Wertigkeit des Verbs, Valenz

٤_ (ا) * pro t گرت _ ت _ یین (تۆ ئێمەت گرت)
(ب) pro t گرتیینت.

٥_ (ا) pro t گرت _ ت _ ϕ. (تۆ ئەوت گرت)
(ب) pro t گرتت ϕ.

٦_ (ا) * pro t گرت _ ت _ یین (تۆ ئێمەت گرت)
(ب) pro t گرتیینت.

٧_ (ا) * pro t گرت _ یی _ ϕ. (ئەو ئەوی گرت)
(ب) pro t گرت ϕ یی.

٨_ (ا) * pro t گرت _ یی _ ن (ئەو ئەوانی گرت)
(ب) pro t گرتنیی.

٩_ (ا) * pro t گرت _ یی _ م (ئەو منی گرت)
(ب) pro t گرتمیی.

١٠_ (ا)* pro t گرت _ یی _ یین (ئەو ئێمەی گرت)
(ب) pro t گرتیینیی

١١_ (ا) * pro t گرت _ یی _ییت (ئەو تۆی گرت)
(ب) pro t گرتتیی.

١٢_ (ا) * pro t گرت _ یی _ ن (ئەو ئەوانی گرت)
(ب) pro t گرتنیی.

هۆی لەیاسالادانی ڕستەکانی (٢ (ا)) تا (١٢ (ا))، بەگوێرەی گریمانەکەم، لە دارشتەفۆنۆلۆژییەکاندا دەدۆزرێتەوە. لە پارەکەی داهاتوودا دەگەڕێمەوە سەر ئەم بابەت و کێشەیە، بۆئەوەی بە وردیی پەسنیبکەم. بەسە، گەر لێرەدا ئاماژەیەك بۆ ئەوە بکەم، کە لە یاسالادانی ئەم پۆلە لە ڕستەکان مەرجی فۆنۆلۆژیی هەیە.

سینتاکس و مۆرفۆلۆژیی:

لە داڕشتەی سینتاکسدا شوێنی مۆرفۆسینتاکسیی دیاریکراوو سەقامگیر بۆ مۆرفێمەکان هەن. سەرەو ڕیزبوونی سینتاکسیی مۆرفێمەکان، پەیوەست بە (قەدی) کردارەوە وەك سەری وەچەپێکهاتەمۆرفۆسینتاکسییەکە، وابەستەی پرۆسەرێزمانییەکانن.

شوێنی ڕووکەشی کلیتیکی بەرکاری ڕاستەوخۆ شوێنێکە، کە بەرکارەفەرهەنگییەکەی لەسەر ئاستی فۆرمی فۆنۆلۆژیی بۆ دەبرێت. کام شوێنە کلیتیکی بەرکاری ڕاستەوخۆ لە داڕشتەفۆنۆلۆژییەکەدا تێیدەچێت، لەلایەن پێکهاتەی سینتاکسییەوە و/یان لەلایەن پێکهاتەی فۆنۆلۆژییەوە دیاریی و دەستنیشاندەکرێت.

لەگەڵ ئەوەیشدا، کە ئینکلیتیك لە کردارەکەوە نزدیك ترە وەك لە کلیتیك، ناتوانرێت وەك ئارگومێنتێکی کردارەکە سەیربکرێت. چونکە ئینکلیتیك کەرەستەیەکە، کە دەتوانێت لەناو فرێزەکرداریيەکەدا V′ (VP) شوێنی جیاوازو جۆراوجۆر وەربگرێت. وەك ئەم کەرەستەیە، نیشانەو تایبەتمەندیی ئەو نێوانگرانە[١٢٨٠]ی هەن، کە لە دەوروبەرە مۆرفۆلۆژییەکاندا یان فۆنۆلۆژییەکاندا _یەککەم مۆرفێم یان یەککەم برگە_ دادەنرێت. کاتێك ئێمە جێگۆڕکێ بە کلیتیك و ئینکلیتیك دەکەین و دەیانبەینە شوێنی یەکتریی و پارتیکڵە مەرجییەکە دادەنێین، ڕستەمەرجییەکانی زمانی کوردییمان دەستدەکەوێت. بەم جۆرە، دابەشبوونی شوێنەکانی ئینکلیتیك و کلیتیك لەلایەن چەشنەکان و تاقی کردارەوە دیاریکراوە. لەسەروو ئەمەیشەوە، ڕوودان و دەرکەوتنی ئینکلیتیك و کلیتیك بەیەکەوەو لە هەمان کاتدا (کۆمەڵەی کلیتیکەکان) ملکەچی سنووربۆدانانەکانی پێکهاتەی فۆنۆلۆژیین.

## قاڵبەسینتاکسییە سەرەکییەکانی ڕستەکانی زمانی کوردیی:

**هەواڵیی:**

١_ (ا) (بکەر)، بەرکاری فەرهەنگیی کات _ ڕەگی کردار _ ئینکلیتیك

(ب) (بکەر) t کات _ کلیتیك _ ڕەگی کردار _ ئینکلیتیك

٢_ (ا) (بکەر)، بەرکاری فەرهەنگیی، ئینکلیتیك ڕەگی کردار _ کات

(ب) (بکەر) t ڕەگی کردار _ کات _ ئینکلیتیك _ کلیتیك

٣_ (ا) (بکەر)، بەرکاری فەرهەنگیی ( )x _کات _ ڕەگی کردار _ ئینکلیتیك

(ب) (بکەر)، t ( )x _ کلیتیك _ کات _ ڕەگی کردار _ ئینکلیتیك

---

١٢٨٠ Infix

٤_ (ا) (بکەر)، بەرکاری فەرهەنگیی ( )x _ ڕەگی کردار _ کات
(ب) (بکەر) t ( )x _ ئێنکلیتیک _ ڕەگی کردار _ کات _ کلیتیک

٥_ (ا) (بکەر)، پێشناو، بەرکاری فەرهەنگیی کات _ ڕەگی کردار _ ئێنکلیتیک
(ب) (بکەر)، پێشناو، ئێنکلیتیک کات _ ڕەگی کردار _ کلیتیک

٦_ (ا) (بکەر)، پێشناو _ بەرکاری فەرهەنگیی _ ئێنکلیتیک _ ڕەگی کردار _ کات
(ب) (بکەر)، پێشناو ڕەگی کردار _ کات _ ئێنکلیتیک

مەرجیی:

١_ (ا) ئەگەر، (بکەر)، بەرکاری فەرهەنگیی کات _ ڕەگی کردار _ ئێنکلیتیک
(ب) ئەگەر، (بکەر)، t کات _ کلیتیک _ ڕەگی کردار _ ئێنکلیتیک

٢_ (ا) ئەگەر، (بکەر)، بەرکاری فەرهەنگیی پێشناو _ ڕەگی کردار _ کات
(ب) ئەگەر، (بکەر)، t پێشناو کلیتیک _ ڕەگی کردار _ کات _ ئێنکلیتیک

٣_ (ا) ئەگەر، (بکەر)، بەرکاری فەرهەنگیی ( x) _ کات _ ڕەگی کردار _ ئێنکلیتیک
(ب) ئەگەر، (بکەر)، t ( x ) _ کلیتیک _ کات _ ڕەگی کردار _ ئێنکلیتیک

٤_ (ا) ئەگەر، (بکەر)، بەرکاری فەرهەنگیی، ئێنکلیتیک ( x ) _ ڕەگی کردار _ کات
(ب) ئەگەر، (بکەر)، t ( ) x _ ئێنکلیتیک _ ڕەگی کردار _ کات _ کلیتیک

٥_ (ا) ئەگەر، (بکەر)، پێشناو _ بەرکاری فەرهەنگیی _ کات _ ڕەگی کردار _ ئێنکلیتیک
(ب) ئەگەر، (بکەر)، پێشناو _ کلیتیک _ کات _ ڕەگی کردار _ ئێنکلیتیک

٦_ (ا) ئەگەر، (بکەر)، پێشناو _ بەرکاری فەرهەنگیی _ ئێنکلیتیک _ ڕەگی کردار _ کات
(ب) ئەگەر، (بکەر)، پێشناو _ ئێنکلیتیک _ ڕەگی کردار _ کات _ کلیتیک

## پاشکۆ[١٢٨١]:

١) چەند تێبینییەك دەربارەی پێکهاتەی فۆرمی فۆنۆلۆژیی و پێکهاتەی فۆرمی لۆژیکیی: پێکهاتەی فۆنۆلۆژیی و پێکهاتەی لۆژیکیی کارناکەنە سەریەکتریی. جێبەجێکردنی ئۆپەراسیۆنێك لە پێکهاتەی فۆرمی لۆژیکییدا نابێتەهۆی تەقاندنەوەو بەرپابوونی یاسایەکی فۆنۆلۆژیی و جێبەجێکردنی یاسایەکی فۆنۆلۆژیی ناتوانێت هیچ کاریگەرییەکی لەسەر ئاستی فۆرمی لۆژیکیی هەبێت[١٢٨٢]. بۆئەوەی هیچ لێتێکەڵبوونێك روونەدات، دەمەوێت ئاماژەیەك بەوە بدەم، کە من پراوپڕ بەپێی ئەم دارشتنە پەیوەندییەکانی نێوان پێکهاتەی فۆنۆلۆژیی و پێکهاتەی سینتاکسم روونکردووەتەوە.

٢) چەند تێبینییەك دەربارەی نیشانەرێزمانییەکانی "توخمی کردار[١٢٨٣]": ڕەگەزە رێزمانییەکانی "کەس و تاف کردار" لە نیشانەکانی زاری سلێمانیین. ڕەگەزە رێزمانییەکانی "توخم (نێر، مێ، بێلایەن، جووترەگەن)" ئاکاری هەندێك دیالێکتی زمانی کوردییان دەستنیشانکردووە. ئەم ڕەگەزە جاروبارێك لێرەو لەوێ لەم زارەی لەمەڕ ئێمەدا بەکارهێنانی خۆی هەیە.

٣) چەند تێبینییەك دەربارەی وشەی لێکدراو: یەکێك لە هۆ سەرەکییەکانی بوونەلێکسیمی[١٢٨٤] سەربەخۆی ناو فەرهەنگ (بەراوردی بکە لەگەڵ بەبەردبووەکاندا) لەتەك واتاگۆڕکی[١٢٨٥]، و دەنگۆڕکێدا[١٢٨٦] پڕۆسەفۆنۆلۆژییەکانی وەك هەڵتۆقین[١٢٨٧] و قرتاندن و فرێدانن[١٢٨٨]. قرتاندن و لاوازبوون، بەواتا ونبوون و لەدەستدانی نیشانە (ی تایبەتیی) یان کەرەستە (ی سەرەتایی) لەبەر هەلومەرج و بنەمای ساکاریی و ئاسانیی زۆر تر ڕێیانتێدەچێت وەك لە بۆزیادکردن و خستنەسەر یان وەك لە نەشونماکردن؛ هەروەها

---

[١٢٨١] Appendix

[١٢٨٢] Chomsky (LGB, 1981:Chap.2.)

[١٢٨٣] Genus des Verbs

[١٢٨٤] Lexikalisierung

[١٢٨٥] Bedeutungswandel

[١٢٨٦] Lautwandel

[١٢٨٧] Epenthese

[١٢٨٨] Synkope

دەیشـزانین، کـە ڕەگـەزە ڕێزمانییـەکان زۆر تـر تێداچـوون وەك لـەوەی زۆربووبێـتن یـان زیادیانکردبێت.

قرتاندن و فڕێدانـی ڤاوڵـەکان و لاوازبوونـی پێشـناوەکان لـە زمـانی کوردییـدا دیاردەیـەکی گشـتیی و فراوان و بەبەرهەمە. ئەمەیش لـەلای خۆیـەوە لەگـەڵ ئەو ڕاستییەدا یەکدەگرێتەوە، کە قرتاندن و فڕێدان، بە پێچەوانەی هەڵتۆقیینەوە، دەتوانێت وردەوردەو بەپلە[١٢٨٩] بێت. بەمە ئەوە دەردەبڕم، کە زمانـەوان دەتوانێـت وەهـای دابنێـت، کـە وشـەلێکدراوەکەی <قـژزەرد> لـە <قـژ> و <زەرد> یـان <کتێبنوسـیین> لـە <کتێـب> و <نوسـیین> نـن و لـەو فڕێزانـەوە هاتوونەتەئاراوە، کە نیشانەی خستنەپاڵ یان پێشناوێکیان تێدا بووە. شـییکردنەوەکانی بەشی (١) م جۆرو شێوەی دروستکردنی وشەی لێکدراو ڕووندەکەنـەوە. بۆیەکە دەتوانرێت هۆو هۆکار بۆ ئەوە بهێنرێتەوە، کە ئەم فرێزانە وەك فۆرمە بنەڕەتییەکانی ئەو وشەلێکدراوانە سەیردەکرێن یان نا.

١_ (ا) قژی زەرد بەرامبەر بە قژزەرد
(ب) نوسیینی کتێب بەرامبەر بە کتێبنوسیین
(پ) بەرد بۆ بازدان بەرامبەر بە بەردەباز

٤) چەند تێبینییەك دەربارەی تیۆریی بەستنەوە[١٢٩٠]: وادەردەکەوێت، زاراوەی "گچکەترین ڕەگەزی حوکمکـەر" بـۆ پەسـنکردن و ڕوونکردنـەوەی پەیوەندییـەکانی بەسـتنەوە گونجـاو نەبێت؛ ڕەنگە بەتەواویی کـەم_نرخیش بێت. ژمارەیـەك لـە زمانـەکانی وەك لاتینیـی و ئـەڵمانیی کوردیـی نیشـانیدەدەن، کـە ڕەگـەزێك (ئەنافـەر، جێنـاو) نـاتوانێت هەمیشـە بـە ڕەگـەزێکی دیکـەوە (بکـەر یـان بـەرکارێکی ڕاسـتەوخۆی بەشـی کردارێـك) بەسـتراوەبێت یـان لەگـەڵیدا هاونیشانەبێت، ئەگەر ڕەگەزەکەی یەککەم ڕەگەزەکەی دووهـەمی وەچەئاڕاستەکردو لەگـەڵێدا لە نیشانەتایبەتییەکانیاندا وەکیەك بن و یەکبگرنەوە.

1- Marcus ei persuas-it ut pro sibi dicer-t Veritatem

i j j i j

"مـارکووس قەناعـەتی بـەو (مـارکووس) کـرد، ڕاسـتیی پێبڵێت"

2- Der Arzt läßt den Patienten zu sich kommen.

"پزیشکەکە ڕێیدا، نەخۆشەکە بچێتەلای."

---

١٢٨٩ graduell

١٢٩٠ Bindungstheorie

٣_ ئازاد زۆری لە ئێمە کرد، کە p ro بڕۆین.
j j j i i

٥) چەند تێبینییەك دەربارەی زمانی فارسیی: زمانی فارسیی، کە وەك زمانی کوردیی سەر بە زمانەئێرانییەکانە، لەڕووی دروستەوە، شییکردنەوەو پەسنکردنی زمانی کوردیی هەیە. ڕستەو فرێزەناوییەکانی ڕێدەدەن وەك V´ و N´ بناسرێنەوەو دیارییبکرێن.

ڕستە بە دوو کەرەستەی بکەرەوە:
١_ من دەستم شکست (من، دەستم شکا)

ڕستە بە چەند بازدان و پەڕیینەوەیەکەوە:
٢_ (ا) من بدست نەڤروز گرفتم. (من بە دەست (ی ڕووت) نەورۆزم گرت)،
(ب) من نەڤروز بدست گرفتم. (من نەورۆزم بەدەست گرت)،
(پ) بدست، من نەڤروز گرفتم. (بەدەست، من نەورۆزم گرت).

٣_ خوونە (ماڵ/خانوو)،
یك خوونە (یەك ماڵ/خاوو)،
تنها یك خوونە (تەنها یەك ماڵ/خانوو)،
تنها یك خونەیی کوچك (تەنها یەك ماڵی/خانووی بچووك)،

زمانی فارسیی تەنها سەری فەرهەنگیی هەیە. کەواتە وەچەپێکهاتەی شکاندنەوەو کردار سەرێکی لێکدراو پێکدێنن، کە "ڕەگی کردار_کات_کەس" یان "کات_ڕەگی کردار_کەس" ن. بەم پێیە "کەس" و "کات" کەرەستەی فەرهەنگیی دروستکەری کردارن. بە تەنها خاوەنی تەواوکەری کردارییە. کەرەستە سفرە جێناوییەکەی بکەر نەك جێناوی کەسیی زمانی فارسیی، دەتوانێت وەك کەرەستەی جێناویی ڕاستەقیینە دیارییبکرێت.

٤_ * نەڤرووز میخات وو برڤت
j j i i

٥_ نڤرووز میخات pro برڤت. (نەورۆز دەیەوێت، بڕوات)
i i i i

ئەم ڕاستییە دەستکەوتوانەو ئەو ڕاستییەی، کە گشت پڕۆژەگەورەکان S و VP سەر بە ڕەگەزی V ن، ڕوونیدەکەنەوە، بۆچیی پەیوەندییەسەرپشکیی و بەزۆرو خورتەکییەکانی ڕێکەوتنی p ro ی هەن.[١٢٩١]

٦_ pro میخاهن، pro برڤن. (دەیانەوێت، بڕۆن.
٧_ پدر و مادرم ەن و مجبورکردن، کە pro بروم.

کردارەبکەرنادیارە فەرهەنگییەکەی، کە دروستەیی و بەبێ گوێدانە ڕۆڵەبابەتیانەکەی ئەو ڕەگەزەی حوکمی دۆخی ڕێزمانیی دەکات، بەرپەرچی هەر گواستنەوەیەکی فرێزی ناویی دەداتەوە. (٨ (ب)) هەر گواستنەوەیەکی فرێزی ناویی لە پێکهاتووی خستنەپاڵدا پووچەڵدەکاتەوە.

(ب) * ی_شهر_ویرانکردن

ئەو بەڵگانەی، نەبوونی گواستنەوەی وشەی پرسیار لە زمانی کوردییدا دەسەلمێنن، نەبوونی ئەو یاسایەیش لە ڕستەسازیی کوردییدا ڕووندەکەنەوە. کە ئەم یاسایە لەسەر ئاستی فۆرمی لۆژیکییش نایەتە جێبەجێکردن، دەگەڕێتەوە بۆ شییکردنەوەکانی pro و/یان کلیتیك. کەواتە دروستەمۆرفۆسینتاکسییەکەی زمانی فارسییش ملکەچی مەرجە فۆنۆلۆژییەکانە.

٩_ من t گرفتمش.
j i j i

١٠_ (ا) ئو t گرفتمی.
(ب) * ئو t گرفتیم

٦) چەند تێبینییەك دەربارەی ڕستەی سەرجێناویی

دروستەی ڕستە سەرجێناوییەکانی زمانی کوردیی وەك ڕستەی سنووردیارییکراوی سەرجێناویی[١٢٩٢] دەستنییشان و دیارییدەکرێن. بەڵام واتای سەری ڕستەسەرجێناوییەکە

---

[١٢٩١] Hashemipour (1985, 1986)

[١٢٩٢] restriktive Relativsätze

دیارییکراوە یان نا. بەپێی مەرج و بنەما واتاییەکە[١٢٩٣] دەتوانم بانگەشەی ئەو گریمانەیە بکەم، کە زاری سلێمانیی ڕستەی سەرجێناویی سنووردیارییکراوو سنووردیارییینەکراو[١٢٩٤]ی هەیە.

---

[١٢٩٣] nach den semantischen Kriterien

[١٢٩٤] nicht-restriktive Relativsätze

*Anderson*, D. (1971) "The Grammer of Case: Towards a Localistic Theory", London, Cambridge University.

*Aoun*, Y. (1979) "A short note on clitization", MIT, Cambridge, Mass.

*Aoun*, Y./*Lightfoot*, D. (1984) "Government and Contractions", LI 15, 3.

*Baker*, M. (1985) "Incorporation: A Theory of Grammatical Function Chaining", MIT, phD, dissertation.

*Baynon*, T. (1981) "Historische Linguistik, eine Einführung", München.

*Besten*, H. (1981) "Government, syntaktische Struktur und Kasus", in: Sprache, Formen und Strukturen, Bd. 1., Kohrt, M. und J. Lenertz (eds.), Niemyer, Tübingen.

*Borer*, H. (1979) "Empty Subjects and Constraints on Thematic Relations", Proceeding of Nels X, Ottawa.

------- (1984) "Parametric Syntax, Case Studies in Semitic and Romance Languages", Foris, Dordrecht.

------- (1984a) "The Projection Principle and Rules of Morphology", Massachusetts, Amherst.

------- (1986) "I-Subject", LI 17, 375-416.

*Brody*, M. (1984) "On the Contextual Definitions and the Role of Chains", LI 15, 3, 335-380.

*Chaliand*, G. (1984) "Kurdistan und die Kurden", Göttingen.

*Chao*, W./*Sells*, P. (1985) "On the Interpretation of Resumptive Pronouns", in: C. Jones and P. Sells, eds., Proceedings of the Thirteenth Annual Meeting of Nels, GLSA, Mass, Amherst.

*Chomsky*, N. (1965) "Aspects of the Theory of Syntax", MIT, Cambridge, Mass.

------- (1970) "Remarks on Nominalisation", in: Readings in English Transformational Grammer", Jacobs and Rosenbaum, eds, Ginn and co. / Waltham, MA.

------- (1971) "Problem of Knowledge and Freedom", Pantheon Books, New York.

------- (1972) "Studies in Semantics in Generativ Grammer", Mouton.

------- (1974) "The Amherst Lectures" (Lectures given at the (1974) Linguistic Institute, Mass. Amherst.

------- (1975) "Reflection on Language", Pantheon Books, New York.

------- (1976) "Condition on Rules of Grammer", Linguistic Analyses, 2.4.

------- (1977) "On Wh-Movement", in: Akmajin et al (eds) Formal Syntax. Academic Press., New Yourk.

*Chomsky*, N./*Lasnik*, H. (1977) "Filters and Control", LI 8, 425-504.

*Chomsky*, N. (1980) "On Binding", LI, 11, 1-46.

------- (1980a) "Rules and Representation", Columbia University, New Yourk.

------- (1980b) "Markedness and Core Grammer", MIT, Cambridge, Mass.

-------- (1981) "Lectures on Government and Binding", The Pisa Lectures. Foris, Dordrecht.

-------- (1981a) "A note on non-control Pro", mimiographed, MIT, Cambridge, Mass.

-------- (1982) "Some Concepts and Concequences of the Theory of Government and Binding", MIT, Cambridge, Mass.

-------- (1985) "Knowledge of Language: It's Nature, Origin and Use", Praeger, New York.

-------- (1986) "Barriers", MIT, Cambridge, Mass.

*Cinque*, G. (1982) "On the Theory of Relative Clause and Markedness", The Linguistic Review 1, 247-294.

*de Saussure*, F. (1949) "Course de linguistique generale", 4th edition, Oayot, Paris.

*Drachman*, G. (1988) "Lectures on Case Theory and Greek Syntax", Mskr., University of Athen.

E.*Kiss*, K. (1981) "Structural Relations in Hungarian, a "Free" Wordorder Language", LI 12.

------- (1985) "Is the VP universal?", ms, MIT and University of Budapest.

*Ebneter*, T. (1985) "Konditionen und Restriktionen in der generativen Grammatik", .......

*Eisenberg*, P. (1986) "Grundriss der deutschen Grammatik", Stuttgart, Metzler.

*Emonds*, J. (1976) "A Transformational Aproach to English Syntax", Academic Press, New York.

------- (1979) "Appositive Relatives have no Properities", LI 10, 211-243.

*Evans*, G. (1980) "Pronouns", LI 11, 337-362.

*Fanselow*, G. (1985) "Deutsche Verbalprojektionen und die Frage der Universalität konfigurationeller Sprachen", phD., Diss. Universität Passau.

*Filmore*, C.T. (1968) "The Case of Case", in: Bach and Harms (eds.) (1968).

*Fukui*, N. (1984) "Studies on Japanese "I", MIT, Cambridge, MA.

------- (1986) "A Theory of Category Projection and it's Applications", phD, Diss., MIT, Cambrige, Mass.

*Fukui*, N./*Speas*, M. (1986) "Specifiers and Projection", MIT Working Papers Volum 8, Cambridge, Mass.

*Grewendorf*, G. (1985) "Deutsche Syntax", Teil 1., Mskr., Johann Wolfgang Goethe-Universität.

*Goodall*, G. (1984) "Parallel Structures in Syntax", Doctoral Dissertation, UCSD.

*Gruber*, G. (1965) "Studies in Lexical Relations", phD, Dissertation.

*Hashemipour*, P. (1985) "Control Theory and Pro in Modern Persian", un published ms. University of California, San Diego.

-------- (1986) "Control in Modern Persian", ms. University of California, San Diego.

*Higginbotham*, J. (1983) "LF Binding and Nominals", LI 14, 3.

-------- (1985) "On Semantics", LI 16, 4.

*Hirschbühler*, P. and D. *Lightfoot* (1983) "Remarks and Replieses", LI 3, 505-536.

*Hoekstra*, T. (1984) "Transitivity, Grammatical Relations in Government and Binding Theory", Foris, Dordrecht.

*Hornstein*, N. and D. *Lightfoot* (1981) "Explanation in Linguistics, The Logical Problem of Language Acquisition", London and New York.

-------- (1987) "Prediction and PRO", Language 63, 1.PP.23-25.

*Huang*, C.T.J. (1982) "Move Wh in a Language without Wh-Movement", The Linguistic Review 1, 396-416.

-------- (1982a) "Logical Relation in Chinese and the Theory of Grammer", Doctoral Dissertation, MIT, Cambridge, Mass.

-------- (1984) "On the Distribution and Reference of Empty Pronouns", LI 15, 531-574.

*Ineichen*, G. (1979) "Allgemeine Sprachtypologie", Wissenschaftliche Buchgesellschaft, Darmstadt.

*Jackendoff*, R. (1972) "Semantic Interpretation in Generativ Grammer", MIT, Cambridge, Mass.

-------- (1977) "X′-S′-Syntax: A Study of Phrase Structure", MIT, Cambridge, Mass.

*Jacobson*, B. (1986) "Modern Transformational Grammer", Elsevier Science Publisher B.V. Amsterdam, Holland.

*Jaeggli*, O. (1982) "Topics in Romance Syntax", Foris, Dordrecht.

-------- (1986) "Passiv", LI 17, 587-623.

*Jelinek*, E. (1984) "Case and Configurationality", Natural Language and Linguistic Theory 2.1.

*Kayne*, R. (1969) "The Transformational Cycle in French Syntax", MIT, Cambridge, Mass.

-------- (1975) "French Syntax: The Transformational Cycle", MIT, Cambridge, Mass.

-------- (1983) "Chains, Categories External to S and French Complex Inversion", Natural Language and Linguistic Theory 1.1.

*Keyser*, S.J. and T. *Roeper* (1984) "On the Middle and Ergative Constructions in English", LI 15, 381-416.

*Kiefer*, F. and D.M. *Perlmuter* (1974) "Syntax and Generative Grammer", Linguistische Forschungen, Frankfurt am Main.

*Koopman*, H. and D. *Sportiche* (1982) "Variables and the Bijection Principle", The Linguistic Review 2.2., 139-160.

*Kuroda*, S.Y. (1969) "English Relativization and Certain Related Problems", in: D. Reibel and S. Shane, eds, Modern Studies in English, Prentice-Hall, Engelhood Cliffs, New Jersey.

*Langendoen*, D.T. (1970) "Essentials of English Grammer", New York: Holt Reinhart and Winston.

*Lasnik*, H. (1976) "Remarks on Coreference", Linguistische Analyse 2, 1-23.

*asnik*, H. and M. *Saito* (1984) "On the Nature of Proper Government", LI, 235-289.

*ngobardi*, G. (1982) "Island Effects and Parastic Constructions", ms.

*ckenzi*, D.N. (1961) "Kurdish Dialect Studies" I, First Published for the School of Oriental and African Studies by Oxford University Press, reprinted (1981).

*ranz*, A. (1984) "On the Nature of Grammatical Relations", MIT, Cambridge, Mass.

*May*, R. (1977) "The Grammer of Quantification", phD, dissertation, MIT, Cambridge, Mass.

——— (1982) "Logical Form as a Level of Linguistic Representation", ms., Columbia University.

——— (1985) "Logical Form", MIT Press.

*Mc Closkey*, J. (1979) "Transformational Grammer and Modell Theoretic Semantics", Riedel, Dordrecht.

*Meier*, G.F. and B. *Meier* (1979) "Sprache, Sprachentstehung, Sprachen", Akademieverlag, Berlin.

*Nebez*, J. (1976) "Towards a Unified Kurdish Language", Published by National-Union of Kurdish Studies in Europe (NUKSE).

*Perlmuter*, M.D. (1971) "Deep and Surface Structure Constraints in Syntax", Massachusetts Institut of Technology, USA.

*Pesetsky*, D (1982) "Patha and Categories", phD, dissertation, MIT.

——— (1985) "Morphology and Logical Form", LI 16, 2.

*Reinhart*, T. (1976) "The Syntactic Domain of Anaphora", phD, dissertation, MIT, Cambridge, Mass.

——— (1981) "Definit NP Anaphora and C-Command Domains", LI 12, 605-636.

——— (1981a) "Coreference and Bound Anaphora", A Restatement of the Anaphora Questions", Linguistic and Philosophy" 6, 57-58.

*Reuland*, E.J. (1985) "Representation at the Level of Logical Form and the Definitness Effect", in: J. Gueron/H.G. Obenauer/J.Y. Pollok (eds.), Grammatical Representation, Dordrecht, 372-362.

*Riemsdijk*, H. van and E.S. *Williams* (1986) "Introduction to the Theory of Grammer, MIT, Cambridge, Mass.

*Rizzi*, L. (1982) "Issues in Italien Syntax, Foris, Dordrecht.

------- (1982a) "Negation, Wh-movement and the Null Subject Parameter", in: ders, Issues in Italien Syntax, Dordrecht.
------ (1986) "Null Objects in Italien and the Theory of PRO", LI 17, 501-559.
*Ross*, J.R. (1967) "Constraints on Variables in Syntax", Indiana University Lingustic Club, erschienen als Ross, J.R. (1986).
*Rothstein*, S.D. (1983) "The Syntactic Forms of Predication", phD, dissertation, MIT, Cambridge, Mass.
*Rouvert*, A. and J. R. *Vergnaud* (1980) "Specifying Reference to the Subject", LI 11, 97-202.
*Safir*, K. (1984) "Multiple Variable Binding", LI.
------- (1986) "Relative Clause in a Theory of Binding and Levels", LI 17, 663-689.
*Saito*, M. (1985) "Some Asymetries in Japanese and their Theoretical Implications", phD, dissertation, MIT, Cambridge, Mass.
*Saxon*, L. (1986) "Dogrib Pronouns", Doctoral Dissertation of California, San Diego.
*Sells*, P. (1984) "Syntax and Semantics of resumptive Pronouns", GLSA, University of Massachusetts, Amherst.
*Siewierska*, A. (1984) "The Passive", A Comperativ Linguistic Analyses, Croom, Helm, London.
*Speas*, M. (1986) "Adjunction and Projection in Syntax", Doctoral Dissertation, MIT, Cambridge, Mass.
*Stowell*, T. (1981) "Origins of Phrase Structure", Doctoral Dissertation, MIT, Cambridge, Mass.
------- (1983) "Subjects Across Categories", The Linguistic Review, Volum, Number 3, 285-312.
*Taraldson*, T. (1983) "Parametric Variation in Phrase Structure", A Case Studay, University of Tromso, 603-638.
*Thiersch*, C. (1978) "Topics in German Syntax", phD, dissertation, MIT, Cambridge, Mass.
------- (1985) "VP and Scrambling in the German Mittelfeld", Universität Köln und Universität Connecticut, Revision: 22 April 1985.
*Thumb*, A. (1985) "Handbuch des Sanskrit", Heidelberg.
*Toman*, E. (1986) "A (Word-) Syntax for Participles", Linguistische Berichte 105, 367-408.
*Travis*, L. (1984) "Parameters and Effects of Word Order Variation", phD, dissertation, MIT, Cambridge, Mass.
*Watkins*, C. (1985) "The American Heritage Dictionary of Indo-European Roots", Boston.
*Wendt*, H.F. (1961) "Sprachen", Frankfurt am Main:,Fischer Bücherei (Das Fischer Lexikon).
*Williams*, E. (1978) "Across the Board Rule Application", LI 9.1.

-------- (1980) "Predication", LI 11, 203-238.
-------- (1981) "Argument Structure and Morphology", The Linguistic Review 1, 81-114.
-------- (1983) "Against Small Clauses", LI 14, 287-308.
-------- (1985) "PRO and Subject of NP", Naturale Language and Linguistic Theory 3.3.
*…derlich*, D. (1985) "Über die Argumente des Verbs", Linguistische Berichte 97, 183-227.
…termann Lexikon der Geographie (1969), Westermann, Braunschweig.

## تۆماری ڕەمزەکان

| | |
|---|---|
| * | نارێزمانێتیی |
| ؟ | لەڕووی ڕێزمانییەوە نیشانەی پرسیاری لەسەرە |
| ؟؟ | لەڕووی ڕێزمانییەوە گومانلێکراوە |
| ( ) | کەرەستەیەکی سەرپشکیی |
| = | یەکسانە بە |
| ⟵ | دروستبووە لە، بەخشکەیی دەریدەبڕێت، کە |
| ⟵/ | بە خشکەیی دەرینابڕێت، کە |
| ⟶ | هەڵکوێزراوە لە ... ەوە |
| ⟵ | بووە بە |

